ئیسلامی رێی نەداوە ئیسلام ببرێتە ئاستی مشتومڕی عەقڵیو بانگەوازی بۆ ئەوە کردووە ئیسلام لە سەرچاوە رەسەنەکەوە وەربگیرێت کە ئەویش قورئانو سوننەتە، ئیتر بڕوای نیە بە ئیلاهیاتی ئەرستۆ، چونکە پێشەکیو ئەنجامەکانی ئەو ئیلاهیاتە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ چەمكو واتای پوختی یەکخواپەرستیدا ناگونجێت.

هەریەك لە شافیعیو ئەشعەریو غەزالیو ئیبن تەیمیە راستگۆیانە بەرامبەر ئەو هەوڵانە وەستاونەتەوەو بارو هەوڵی فەیلەسووفانو زانایانی زانستی کەلامو موعتەزیلەو صۆفیگەرایی فەلسەفیو باتینیەتیان ئاشکرا کردووەو بڕیاری ئەوەیان داوە رێبازی سوننەت(منهاج السنة) رەسەنایەتی ئیسلامیەو یەکێك نیە لەو رێچکانەی تر، بەڵکو رێبازێکی جیایە، ئێمەش لەمڕۆدا ئەرکمانە هەمان هەڵوێست بگرینەبەرو چەمكو دەستەواژەکانی ئیسلام پاك بکەینەوە لەو ئیسرائیلیاتە کۆنو نوێیەی کە نووسراونەتەوە، ئەو بتپەرستیە مردووەی ئەمڕۆ نەیاران دەیانەوێت زیندووی بکەنەوە لەناوبەرین، بۆ ئەوەی سەرچاوەو رێرەوی تێگەیشتن روون بێت، چونکە پێویستە لەسەرمان جوان لەوە تێبگەین لە بنەڕەتدا:

یەکەم: ئیسلام ئەو یەکخواپەرستیەیە کە هەریەك لە فرەخودایی و دوانە خودایی و بتپەرستی و هەر جۆرە هاوەڵ دانانێك بۆ خوا بەرپەرچ دەداتەوە، وشەی ئیسلام جیاوازە لەو چەمکە گشتیەی ئایین کە بە گشتی بەکاردێت،

چونکه ئیسلام لەو روانگەوە ئایینە کە پەیوەندی نێوان خواو بەندە دیاری دەکات، بەرنامەی ژیانە، هەروەها بە تەواوی پەیوەندی نێوان تاكو کۆمەڵگەش دیاری دەکات، ئیسلام جۆرێ لە گونجانو هاوسەنگیو پێکگەیشتن لەنێوان تکگەراییو کۆمەڵگەراییدا دێنێتەدی، خودێتیو ئازادی و رێزو گەورەیی تاك دەپارێزێ، لە هەمان کاتیشدا ئیجابیەتی کۆمەڵگەو رۆڵی لە تاك لە بنیادنانیدا دێنێـەدی، سیستمێکی تەواوی وایە کە ریشەی هەموو بانگەوازەکانی ئازادیو دادپەروەریو یەکسانیو گونجانی کۆمەڵایەتی لەخۆدەگرێت، بۆ هەریەك لەو بەهایانەش چەمكو پەیامی روونو والای تایبەت بە خۆی هەیە.

ئیسلام رێی ئیجتیهادو تەئویلی داوە بەجۆرێی لە بنەڕەتە گشتیو بەها بنەرەتیەکانی ئیسلام دەرنەچێت، هەروەها ئیسلام بڕوای هەیە بەوانەی لە بنەڕەتدا چەسپاون وەك چۆن بڕوای هەیە بە جووڵە لە بازنەیەکی چەسپاودا، ئیسلام بڕوای نیە بە پەرەسەندنی رەها.

هەروەها ئیسلام زانستو فەلسەفە لێك جیا دەکاتەوە، زانست ئەوەیە کە ئەزموونە هەستپێکراو زانراوەکان بە تەواویو یەکلایی سەلماندوویانە، ئیسلام ئەمەی پێ قبووڵە، بەڵام فەلسەفە برِێ مەسەلەی نەزەرین کە بیریاران لە کەشو سەردەمێکی دیاریکراودا ئەو روانینەیان هەیە، بۆیە ئەمانە چەسپاوو گشتی نین، هەروەها ئیسلام رۆشنبیریو مەعریفە لێك جیادەکاتەوە، مەعیفە وەك زانست گشتیەو موڵکی هەموو مرۆڤایەتیە، بەڵام رۆشنبیری تایبەتەو

پەیوەستە بە ویژدان و مەزاجی گەلیٚ یان دەستەیەکەوەو چەسپاو نیە، چونکە لە خاکێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ خاکێکی تر.

بیری ئیسلامی هەمیشە کراوەیەو هەر رۆشنبیریو بیرێکی گەلانی رۆژهەلاتو رۆژئاوا بە چاك بزانێت قبوولّی دەکات، بەلاّم هەمیشەش توانای ئەوەی هەیە خودێتی تایبەتی خۆی بپارێزیٚو هیچ بیرێکی ساختە یان هەناردەکراو نەتوانێت بیشێوێنێت.

دووەم: ئیسلام بە پەیامی پوختی یەکخواپەرستی خۆیەوە بیرێکی خاوەن مۆرکی سەربەخۆیی تەواو و چەمكو واتای روونو پوختی دامەزراندووە کە ناکرێت تێکەلّ بکرێن بە چەمكو واتای فەلسەفەکان، بەتایبەت لەوانەدا کە تایبەتە بە بتپەرستی ئیغریقیو چەمكو واتاکانی فەلسەفە هیندیو فارسیە کۆنەکان، بۆیە ئیسلام عەقلّگەرایی رەهاو چەمكو واتای وەحدەتولوجودو حلول و ئیتیحاد بەرپەرچ دەداتەوە.

ئیسلام لە بەرنگاربوونەوەی فەلسەفەی یۆنانیو بتپەرستی مەجووسیو فارسیو هیندیو تێخنراوی ئیسرائیلیاتدا جەنگێکی سەختی گرتووەتەبەرو بە دانانی رێبازێکی کاملّی وەرگیراو لە خودی قورئانو فەرموودەی صەحیح (بوخاری و موسلیم)و بنیادی فیقهی (مالیكو شافیعیو ئەبووحەنیفەو ئیبن حەنبەل)و راستکردنەوەی چەمكو واتاکان (ئیبن حەزمو غەزالیو ئیبن تەیمیە) بەرنگاری هەموو ئەوانە بووەتەوە.

بیری ئیسلامی لەنێو ئەم جەنگەدا بە دەستەواژەی ئەهلی سوننەو جەماعە بە پاكو یوختی دەرچوو و خۆی پاراست لە بتپەرستیو هەر چەمكو وتەیەكی فەلسەفەی هێلینیو مەجووسی لێ دووربوو.

ئەم روانینە فراوانە دەتوانێت نێوەندێكی پتەو بداتە دەست توێژەری موسڵمان تا جوان شارەزای دەقە جیاجیاكان بێتو بیانگێڕێتەوە سەر رەوتە فرەچەشنەكان، ئەو رەوتانەی لە بازنەی پیلانی دژ بە ئیسلام بە درێژایی سەدەكان هەوڵی خۆیانداوە بۆ شێواندنی بیروباوەڕی ئیسلامی، ئینجا بۆی دەردەكەوێت چۆن رەسەنایەتی ئیسلامی بەرنگاری ئەو بیرانە بووەتەوەو ساختەو ناڕاستیەكانی ئەو بیرانەو خراپەو فەسادی سەرچاوەكانیانی بۆ روون دەبێتەوە، دەزانێت چۆن هەمیشە رەسەنایەتی ئیسلامی توانیویەتی كرۆكی بیروباوەڕ وەرگرێتو دەست بگرێت بە پایە و بنەڕەتەكانیەوەو هەر ساختەیەك خراوەتەڕوو بۆ شێواندنی ئەو كرۆكە لەلایەن ئەو رەسەنایەتیە ئیسلامیەوە بەرپەرچ دراوەتەوە.

دیارترینی ئەو چەمكو واتایانە ئەوەیە كە هەموو بەها بنەڕەتیەكانی بیری ئیسلامی پێش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) دانراون، عەقڵو ویژدانو دینو زانستو رۆحو مادده پێكەوە كۆدەكاتەوەو ناهێڵێت نە لێك جیابكرێنەوەو نە یەكێكیان زاڵ بكرێت بەسەر ئەوی تردا، ئەم بنەڕەتانە لەو كاتەوە دانراون كە خوای گەورە سروشی دابەزاندە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەكەی (اليوم أكملت لكم دينكم)

ئیتر گۆڕانکاریو زێدەکاری بۆ ئیسلام بەهیچ جۆرێك دروست نیەو چی دوای ئەوە هاتووە راڤە یان شرۆڤەکاری بووە بەپێی ئەو بنەمای ئیجتیهادەی کە ئیسلام بۆ بەرنگاربوونەوەی گۆڕانکاریەکانی کەشو سەردەمەکان دایناوە.

ئیسلام یاسایەکی نەگۆڕی هەیە کە ئەویش نوێبوونەوەیە لەنێو خۆیدا و لە قوولایی خۆیدا خۆی دادەڕێژێتەوە، هەرکات رەشەبای چەقبەستووییو یان جەبریەت یان لاڕێبوون هەڵبکاتە سەر کرۆکی ئیسلام، ئەوکات بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی خۆی ئیسلام دەتوانێت خۆی بپارێزێت، ئیبن حەزمو غەزالیو ئەشعەریو ئیبن تەیمیەو ئیبنولقەییم لە ئاشکراکردنی ئەو گومانو لادانانەو راستکردنەوەی چەمكو واتاکانو گەڕانەوە بۆ چەمكو واتای رەسەنی ئیسلامیدا هەڵوێستی لەبیرنەکراو و نموونەی ناوازەیان پێشکەش کردووە.

ئەمڕۆش دووبارە کەوتووینەتە نێو جەنگێکی تری سەختەوە، بەڵام ئەمجار دوژمنانێکی خراپو سەرسەختو زبر، هێزی زاناو بیریارانی ئیسلامیش سەرلەنوێ لێنەویوە بۆ وەڵامدانەوەو بەرنگاربوونەوەی ئەو گومانانە.

# بەشی یەکەم

## زیندووکردنەوەی بیری موعتەزیلی

## ئیسلامو ئیعتیزال

رۆژهەلاتناسیو بانگخوازانی رۆژئاواگەرلاو شالاوی رۆشنبیری گرنگیەکی زۆر دەدەن بە ئیعتیزالو موعتەزیلە، رۆژهەڵاتناسانو نووسەرانی رۆژئاواگەری لە وەسفی موعتەزیلەکان دەکەن کە ئەوانە ئیغریقە راستیەفینەکانی ئیسلام یان موعتەزیلە گەورەکانن، ئیتر دەکەونە سەرکۆنەی خەلیفە موتەوەکل لەبەرئەوەی سوننەی هێنایەوە پێشەوە، ئەو هەنگاوەش بە هەڵگەرانەوەیەك لە ئازادی هزریدا لەقەڵەم دەدەن، ئەو ئازادیە هزریەی کە بانگخوازانی ئیعتیزال پێی هەستابوون، مامۆستا ئەحمەد ئەمین دەڵێت موسڵمانان لاوازو دواکەوتوو دەرچوون لەبەرئەوەی رێبازی عەقڵانی موعتەزیلەیان نەگرتەبەر، هەریەك لە جەمالەدینو موحەممەد عەبدە بە موعتەزیلە نوێکان ناوزەد دەکات، زۆرێك لەو بارەوە نووسینیان هەیە، دکتۆر ئەلبیر نەصری نادر سەبارەت بە موعتەزیلە کتێبێکی نووسیوەو دەڵێت دیارترین چەمكو واتای موعتەزیلە بوونی عەقڵو بەرپاکردنی ئەخلاقە لەسەر بنەمای عەقڵ جیا لە سروش، موعتەزیلە پێیان وایە دەبێت عەقڵ دەسەڵاتدار بێتو لە چەندین مەسەلەدا پاڵپشتی ئەو رایەیان دەکەن.

لەبەرئەوەی ڕۆژهەڵاتناسانو بانگخوازانی ڕۆژئاواگەری نموونەی باڵای خۆیان لە بیری ڕۆژئاواییەوە وەردەگرن، بۆیە هەوڵ دەدەن بانگەوازی عەقڵانیەت بکەنە نموونەو هاوشێوەیەکی ڕووداوەکانی سەردەمی ڕێنیسانس کە تیایدا دینو زانست لێك جیاکرانەوەو عەقڵانیەتو نائاینیو عەلمانیەتو ماددیگەراییو هاوشێوەکانیان بەرز ڕاگیران، ئیتر چاویان لەو جیاوازیە گەورانە نیە کە لەنێوان ڕاڤە مەسیحیە ڕۆژئاواییەکانو ئیسلامدا هەن، چونکە ڕاڤەی مەسیحیەت نەیدەهێشت ڕۆژئاوا تاو بداتە بوارەکانی زانستو تەنها لە چەقبەستوویيو ڕەهبانیەتو تەقلیدو جەبریەتدا ئەوانی کۆت کردبوو، بەڵام لە ئیسلامدا تەواو جیاوازە، چونکە ئیسلام خۆی ڕێبازی مەعرفەی گشتگیرو تەواوی پێیە کە عەقڵو ڕۆح پێکەوە کۆدەکاتەوە، پێی وایە ئەو دوانە گونجانو پێکەوەییەکیان هەیە کە هیچ ڕێیەك نیە ئەو گونجانە لەناوبەرێت.

هەریەك لە ڕۆژهەڵاتناسیو ڕۆژئاواگەری پێیان وایە ئیعتیزالو موعتەزیلە ڕێبازێکی هەناردەی وایە کە لەگەڵ بیری یۆنانیدا پەیوەندی هەیە، بۆیە بەو نیازەوە بەرزی ڕادەگرنو دەزانن چ کاریگەریەکی دەبێت لە شێواندنی بیری ئیسلامو نانەوەی ڕاو دیدی جیاجیاو ڕێگرتن لە یەکبوونی ئیسلامی، بۆیە نوێی دەکەنەوەو گرنگی پێ دەدەن تا لە سەردەمی نوێدا هەمان کاریگەری جارانی هەبێت.

بێگومان بیرۆکەی ئیعتیزال لە بنەڕەتدا لە فەلسەفە هیندیو یۆنانیەکانو ـیری کۆنی بتپەرستیەوە هاتووە، کاتێك سەرەتا هەولێدا بەرنگاری موتەکەلیمینی ناو ئایینەکانی پێشوو بێتەوە، ئەوانەی سەبارەت بە ئیسلام قسەیان دەکرد، توانی بڕێ ئەنجامی پاك بەدەستبخات، بەلام دواتر کە خۆی جیاکردەوەو لە سنووری خۆی دەرچوو تا ڕێبازێکی تەواو عەقلانی بۆ خۆی ـبەرزێنێو لە سەروو چەمكو واتای گشتگیری ئیسلامەوە دایبنێت، ئیتر بە ـەولوی لایداو هەڵەیەکی زەقو ڕەقی کرد.

بەلام خێرا هزری ئیسلامی ئەو ڕێرەوەی تێکشکاندو گەرشایەوە بۆ ڕێبازی ڕەسەنی خۆی، ئەمەش لە هەوڵەکەی ئەشعەریدا خۆی نیشان دا کە ـۆڵی عەقلی گێڕایەوە ناو بازنەی سروش.

مەترسیدارترین کاری موعتەزیلە خۆ گەیاندن بوو بە دەسەلاتو سەپاندنی ڕێبازە هزریەکەیان بوو بەسەر دەوڵەتدا، بەمەش موعتەزیلە چوونە ئەو قۆناغە مەترسیدارەی کە سەدان زاناو توێژەریان تووشی ئازار و ئەشکەنجەو تاقیکردنەوە کرد، ئەمەش تەنها لە ماوەی دەسەلاتی سێ خەلیفەدا کە بریتی بوون لە مەئموونو موعتەصمو واسق، لە ماوەی شانزە ساڵدا سەختترین مۆدێلی ڕاسەپێنیان گرتەبەر، ئەمەش نە لە بازنەی شەریعەتو نە لە بنەڕەتە گشتیەکانی ئیسلامدا قبوولکراو نەبوو، بەڵکو سوننەتی صەحیح هەر دوور بوو لە شتی وا، بەڵکو بەرهەمی چوونە ناو بیری یۆنانیو بتپەرستی کۆن بوو،

هەڵوێستی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەو بوارەدا زۆر بەهێز بوو کە توانی بە توندی بەرنگاری ئەو مەترسیە بێتەوەو توانی شێواوی ئەو بیرە بخاتەڕوو و بارەکە بگێڕێتەوە بۆ ئەو ڕەسەنایەتیەی جاران هەبوو، ئەمەش کۆتایی موعتەزیلە بوو کە کۆتاییو سەرەنجامێکی تاریكو ڕەش بوو.

هەڵەی موعتەزیلە لە بواری فیکردا چی بوو؟

موعتەزیلە پشتی بە عەقڵ دەبەست با تەنانەت عەقڵ لەوێدا پێچەوانەی نەقڵ بێت، بەمەش لە چەمکی ڕەسەنی سوننە دەرچوون.

قورئان سەرچاوەی ڕەسەن بوو و توێژەران خێرا دەگەڕانەوە بۆ قورئانو سوننەتو تەنها پشتیان بەو دوانە دەبەست، ئیتر لە ئایەتەکانی قورئانەوە لە بیروباوەڕ تێدەگەیشتن، هەر شتێکیش لایان ڕوون نەبوایە هەوڵیاندەدا لەڕێی وردەکاری زمانەوانیەوە لێی تێبگەن، ئەوان لەو بوارەدا زۆر شارەزا بوون، ئەگەریش بەوەش گیریان بخواردایە دەوەستناو مەسەلەکەیان دەسپارد بە خوا.

بەلام موعتەزیلە پێچەوانەی ئەو ڕێبازە بوونو لە هەموو مەسەلەیەکدا عەقڵیان دەکردە داوەرو بنەڕەتی توێژینەوەیان.

هەروەها موعتەزیلەکان زۆر سەرقاڵ بوون بە دانیشتنو دواندنی نەیارە زندیقو رافیزەو دوانەخوایی نەیارەکانی تریانەوەو زۆر جار بۆ جەنگو خەباتیان هەمان ڕێبازەکانی نەیارەکانی خۆیان دەگرتەبەر، چەکی ئەوانیان بەکاردەهێنا،

ئیتر دواجار کاریگەر بوون بە نەیارەکانیانو هەندێ بەشی ڕێبازەکەی ئەوانیان وەرگرت، یەنبورگ دەڵێت هەرکەس لە جەنگێکدا لەگەڵ دوژمنێکی گەورە بێگیرێت ئەوە کۆتی دەبێتو مەرجەکانی جەنگو گۆڕانی بارودۆخی لەوەوە وەردەگرێتو جووڵەو هەڵسوکەوتی دوژمنەکەی وەردەگرێت، لەوانەشە گیانو مێنو سخاتەی دوژمن کاری بکاتە سەر ناخیشی، دەی لە جەنگی هزریشدا ..رەکە بە هەمان شێوەیە.

موعتەزیلەکان لە بەڵگەهێنانەوەی عەقڵیدا ڕێیەکی زۆریان بڕی، جا کە ڕووکەشی دەقێك لەگەڵ ڕایەکی پەسەندی خۆیان یان ڕایەکی ناپەسەندی خۆیان نەگونجایە، ئیتر واتای دەقەکەیان تەئویل دەکرد بەجۆرێ پێچەوانەی ری خۆیان نەبێت، ئەم ڕێگەیە لە بنەڕەتدا متمانەبوونە بە عەقڵ، عەقڵیش نەپێکانی هەیە، بۆیە ڕۆچوونیان لەو لانەکردنەوەیان پاڵنەری زیاتریان بوو بۆ ئەو دیدە عەقڵگەراییەیان.

دوژمنانێکی زۆری ئیسلامیش موعتەزیلەیان بە دەروازەیەکی هێرش بردنە سەر ئیسلام دەزانی تا لەوێوە ژەهری خۆیان بڕژنو پیلانی خۆیان دژ بە ئیسلامو موسڵمانان بخەنەکار.

یەکێك لە مەترسیدارترین پەیامەکانیان ئەوەیە کە پێیان وایە کە عەقڵ دەسەڵاتدارەو توانای هەیە چی چاكو خراپ هەیە جیای بکاتەوە با تەنانەت شەرعیش ئەوانەی بۆ جیانەکاتەوە، مامۆستا ئەبولحەسەنی نەدەوی دەڵێت

موعتەزیلە لە ڕێزگرتنی دەسەلاتی عەقڵو سنووری زانستی مرۆییدا زێدەڕۆییان کردووە، دکتۆر ئەحمەد ئەمین کە یەکێکە لە پشتیوانانی موعتەزیلە پێی وایە خاڵی لاوازییان ئەوەیە کە زۆر عەقڵیان بەرزو پیرۆز ڕاگرتووەو زیاد لە پێویست بڕوایان هەیە بە توانای عەقڵ، دەڵێت: موعتەزیلە پێیان وایە عەقڵی مرۆیی دەسەڵاتو توانایەی پێ بەخشراوە کە توانای هەیە تەنانەت بەڵگە بهێنێتەوە لەسەر ئەو شتانەی پەیوەستن بە خواوە، ئیتر تەنها سنووری عەقڵ بەڵگەکانی خۆیەتی.

بەلام ڕاست وایە عەقڵ لەوە لاوازترە، ئەگەر بتوانێت ئەو شتانە بزانێت کە پەیوەستن بە خۆیەوەو تواناشی هەبێت درك بکات بە بەڵگەی بوونی خواو پێغەمبەرایەتی گشتیو پێغەمبەرایەتی موحەممەد (ﷺ) بە تایبەت، ئەوا توانای ئەوەی پێ نەدراوە مەعریفەی تایبەت بە خواو سیفەتەکانی خوای هەبێت.

**خاڵی لاوازی موعتەزیلەکان** ئەوەیە کە زێدەڕۆیی دەکەن لە پێوانی غائیب بەسەر شاهیددا، واتە پێوانی خوا لەسەر مرۆڤ دەکەنو دەیانەوێت خوا ملکەچی یاساکانی جیهان بکەن، بۆ نموونە بەو جۆرەی مرۆڤ لە دادپەروەری تێگەیشتووەو بەو سیستەمە دنیاییەی کە هەیە دەیانەوێت دادپەروەری لای خوا بچەسپێنن، دەی دەزانین تەنانەت لە سیستەمی دنیاییدا دادپەروەری واتایەکی ڕێژەیی هەیەو بە گۆڕانی سەردەم دەگۆڕێت، ئێمە لە کردارماندا ئەم جیهانەی خۆمان دەبینین، بەلام خوای گەورە لە کارەکانیدا هەموو جیهانەکان دەبینێت،

ـەوەی ئێمە دەیزانین و ئەو جیهانانەش کە ئێمە نایانبینین، ئیتر چۆن دەکرێت
حو بخەینە ژێر پێوەری دادپەروەری ئێمەوە.

ئەمە هەڵەی ئەو ئاراستە عەقڵیەیە کە موعتەزیلە رێبەری دەکەن و لەسەر
ـەمای بەرزراگرتن و بەخواداناانی عەقڵ وەستاوەو هەموو سیستمی ئایینی بە
ـیروباوەڕ و راستیەکانیەوە ملکەچی عەقڵ دەکات، بێگومان ئەو پێوەرەی
ـەونا ئاراستەیەکی مەترسیدار دەبێت دژ بە ئیسلام و دەرگای فەسادێکی گەورە
ـەرووی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا دەکاتەوەئەمە گۆڕینی ئەو ئایینە ساکارە
کرداریەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێناویەتی و عەقڵی مرۆیی زۆر بە ئاسانی
ـیی تێدەگات، ئەم دینە ساکارە دەگۆڕێت بۆ فەلسەفەیەکی وردی نەزەری کە
زۆر کەسی ژیرو زیرەکیش ناتوانن لێی تێبگەن، ئەمە گەشەدانە بە عەقڵ لەسەر
حسابی سۆزو ویژدان و لاوازکردنی ئیمان و نانەوەی گومان و دوودڵی و
ـروستکردنی بێمتمانەییە بەرامبەر بەو شتانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی
کردووەو عەقڵ ناتوانێت بەڵگە بۆ بوونیان بهێنێتەوە، لە جیهاندا زۆر شت هەیە
کە عەقڵ ناتوانێت بەڵگە بۆ بوونیان بهێنێتەوە.

عەیبەو کەموکورتیەکی موعتەزیلە لەوەدایە کە ئایینیان کردووە بە بڕێ
پرسی عەقڵ و بەڵگەی مەنتیقی و هیچی تر، لەکاتێکدا ئایین پێچەوانەی
فەلسەفەیە، لە بەرز راگرتنی عەقڵدا گەیشتوونەتە ئاستێ کە عەقڵ پیرۆز
رادەگرن، ئەو رێبازە مشتومڕیەی دەیگرنەبەر دەبوو هەڵکەوتەیی بیرکردنەوەی
لێ بکەوتایەتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت پێویستی رۆح بێنێتەدی و

پێویستیەکانی دابین بکات، ئیتر لە هەڵکەوتەیی بیرکردنەوەوە چوونەتە مەیدانی لاوازی رۆح و زێدەڕۆیی لە بەرزراگرتنی عەقڵ و کەمتەرخەمی لە بواری سۆزو عاتیفەدا، لێهاتوویی زۆریان لە کەلامدا توانای ئەوەی پێداون لە مەسەلەیکدا هەم قسە بکەن و هەم دژیشی بڵێن و بە هەمان تواناو لێهاتوویی لە هەردوو دیوەکەوە لەسەری بدوێن، ئەمەش وتەی دکتۆر عەبدولحەکیم بەلبەعە.

بێگومان موعتەزیلە نەیانتوانیوە لە تەواوێتی گشتگیری ئیسلام تێبگەن، ئەو تەواوکاریەی عەقڵ و ویژدان پێکەوە کۆدەکاتەوە، بەڵکو دەمارگیری عەقڵیان وایکردووە لایەنەکەی تۆ رێبازی مەعریفەی ئیسلامی پشتگوێ بخەن، بەڵکو گەیشتنە ئاستێ هەرکەس وەک ئەوان بیر نەکاتەوە سزای بدەن، ئیتر بێئاگا لەوەی عەقڵ بە تەنها ناتوانێت پێویستیەکانی دەروونی مرۆیی دابین بکات، پێویستی ویژدان و جیهانی عەیب و توانای هەست و سۆز، دکتۆر عیمادەدین خەلیل بە جوانی ئەمە دەخاتەڕوو و دەڵێت:

خۆنواندنی هزری موعتەزیلی و ئەو خۆبەستنەوەیان بە عەقڵ و چەوساندنەوەیەکی مەزهەبی کە بەرامبەر هەموو نەیارێکیان گرتیانەبەر جێی سەرسوڕمانە، لەکاتێکدا ئەوان لە زیاتر لە حەوت سەدو پەنجا شوێنی قورئاندا بانگەواز بۆ کاری گەورەو بچووکی بیری مرۆیی و جووڵاندنی عەقڵ بۆ چارەسەری کێشە بنەڕەتیەکان دەخوێننەوە، لە هەمان کاتدا ئەوەش دەخوێننەوە کە عەقڵ بە تەنها توانای ئەوەی نیە مرۆڤ لەنێو ئاڵۆزیە کەونیەکانیدا سەرکەوتوو بکات، ئەگەریش توانای ئەوەی هەبوایە ئیتر پێویستی

...ەکرد ئایینەکان بێن‌و قورئان دابەزێت، لە دەیان شوێنی قورئانیدا ئەوە ...مینن کە لەپشت جیهانەوە دەکرێت عەقڵ لەگەڵ جیهانێکی غەیبی بەرفراوان ... گشتگیرو شاراوەدا هەڵسوکەوت بکات کە وەڵامدەرەوەی توانا هەستی‌و ...عقڵیەکانی مرۆڤ بێت، بەڵام راستیەکی واقیعیە وەك چۆن سروشتی هەستپێکراو ...حقە بڕوابوون بەو جیهانەی تریش وەك بەردی سووچ وایە بۆ هەر ئیمانێکی ...ستەقینەی تەواو، قورئانی پیرۆز هەردوو مەسەلەو بوارەکەی باسکردووە، ئیتر ... لایەکی بگرین‌و ڕێی نێوەندو هاوسەنگی گشتگیری بەربدەین.

کێشە مەترسیدارەکە ئەوەیە کە موعتەزیلە بەرامبەر بە سروش ...موەستێتەوە، سروش کە دیاردەیەکی غەیبی تەواوە، ناخرێتە ژێر تاقیکردنەوەی عەقڵی، تەنها شتێ لە ژیانی پێغەمبەری خواوە بینرابێت بریتیە لە حوبەدەستەوەدان بە هەموو ئەو راستیانەی غەیب کە چاو ناتوانێت بیانبینێت.

بێگومان بزاڤی رۆژئاواگەری‌و شالاوی رۆشنبیری بۆ سووکایەتی کردن بە کەملێتی پەیامی ئیسلامی‌و بوارەکانی و قووڵی پەیوەندی بە جیهانی غەیب‌و هندانی خەڵك تەنها بۆ لایەنی رووکەش‌و هەستپێکراو و بابەتە عەقڵانیەکان، سوود لەم بیرە ئیعتیزالیە وەردەگرێت، بەمەش ئەو تەواوکاری‌و گشتگیرەی ئیسلام لەنێوان ماددەو رۆح‌و عەقڵ‌و دڵدا دروستی کردووە دەپچڕێت، بەمەش ئیسلام تایبەتمەند خواپەرستی بنەڕەتی خۆی لەدەست دەدات‌و وەك ڕەوت‌و ڕێچکە مرۆییەکانی تری لێ دێت، بەڵکو لەو ئاستەشدا ناوەستن، بەڵکو لە بوارێکی تریشدا کار دەکەن کە ئەویش بواری تەصەوفی عەقڵی‌و وەحدەتولوجودو شەتەحاتی رۆح و خەیاڵە، گەشە بەو بوارەش دەدەن تا

پشتیوانی بۆ پەیدا بکەن، تا ئەمانەش بتوانن ئەو گونجانەی نێوان عەقڵو ڕۆح نەهێڵن کە ئیسلام بەدیهێناوە، بەوەش بەدوای ئارەزووەکانیاندا ڕێ دەکەن.

بێگومان جیهان لە پێش ئیسلامدا دابەش بووبوو بۆ دوو دەستە: عەقڵانیە یۆنانیەکانو شوێنکەوتەکانیان، غەنووصیە ئیشراقیەکان، هەریەك لەوانەش پێیان وابوو تەنها ڕێی خۆیان راستەو ئەوی تری بە گومڕا دەزانی، ئیتر لە دیدو بیروباوەڕیاندا لایەکیان گرتبوو، جا دوای وەرگێڕانی فەلسەفەکان ئەو بەزمە نوێ بوویەوە، لەمڕۆشدا سەرلەنوێ نوێ دەکرێتەوە تا بەرەی باوەڕداران دابەش بکەن بۆ عەقڵانی و ویژدانیەکانو لەنێوانیاندا بەربەستو دیواری بەرز و شوورەی گەورە دروست بکەن تا هەردەم پەرتەوازە بنو لە ململانێدا بنو نەگەنە ئەو حەقیقەتەی ئیسلام کە لە یەك ساتدا موسڵمان دەکاتە کەسێکی عەقڵانی و ویژدانیش، ئەمەش بە گەڕانەوە بۆ کرۆکی چەمكو واتاکانی قورئانو سوننەتو دوور لە زێدەڕۆییو لادان، دوور لە بیری هەناردەی بتپەرستیو مەجووسیو ماددیگەری کە کردەی عەقڵی مرۆییە.

یەکێك لە هەنگاوە مەترسیدارەکانی موعتەزیلە کردنەوەی دەرگای تەئویلە لە هەردوو لاوە، ئەگەر بەڵگەیەکی نەقلی لەگەڵ ئەنجامی توێژینەوەی عەقڵی خۆیاندا نەگونجێت تەئویلی دەکەن، ئەگەریش لەگەڵ بەهای کردەیی ئەنجامەکەیاندا بگونجێت ئەوە بە بەڵگە دەیهێننەوە، بەڵکو نکوڵی بەڵگەی عەقڵی دەکەن لە بواری فەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەگەر هیچ پێناوێکیان بەدی نەکرد ئەوە نەبێت، بۆیە ئەگەر عەقڵ هاورای ئەنجامی بیرکردنەوەیان بوون ئەوە تەسلیمی عەقلچ دەبنو تەئویل بۆ پێچەوانەکەی دێننەوە.

موعتەزیلە لە تەئویلی عەقڵیدا زۆر رۆچوون تا گەیشتنە نکوڵی کردن لە سیفەتە خواییەکان، لەوانە گەیشتنە تەعتیل-نکوڵی کردن لە سیفەتەکانی حق- بەوەش گەیشتنە ئەوپەڕی زێدەڕۆیی، بڕیاری مەترسیداریان داو مەعقولیان پێش نەقڵ خستن، نەقڵیش مەبەست پێی سوننەتە کە بەخششی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)و لەپەنا سروشدایە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ئەمڕۆی بەوە داوە (أوتيت الكتاب ومثله معه)[1] (قورئانم بۆ هاتووەو هاوشێوەی ئەویش لەگەڵیدا) مەبەست پێی سوننەتە.

بەوجۆرە دەبینین موعتەزیلە ئاوا هەڵکەوتەییان لە کەلامدا کردە ئامانجێك لە مەسەلەیەکدا بە یەك شێوە هەم لە دژی و هەم بە پێچەوانەوە قسە بکەن، هەمان تواناو هەمان ئاستی بڕواپێکردن، بەمەش لەو حەقیقەتە دەرچوون کە بانگەشەیان بۆ دەکرد، هێندە لەوەدا رۆچوون تا بوونە وەستای وشەکاری بەجۆرێك پاڵپشتی راو بۆچوونی خۆیان بێت با ئیتر لە حەقی رەسەنیش لابدەن، ئیتر لە بەرنگاربوونەوەی زندیقانو وەڵامدانەوەی فرتو فێڵیانەوە ئەوینە داهێنانی فرتو فێڵی مەترسیدارتر کە ئەویش لادان بوو بە لای عەقڵانیەتی رەها و وازهێنان بوون لە چەمكو واتای گشتگیری ئیسلام، ئیتر وای لێهات دەیانویست بیروباوەڕی ئیسلامی ملکەچی عەقڵ بکەن، ئەمەش

[1] - سنن أبي داود، الرقم 4009، صحيح ابن حبان، الرقم 12، مسند أحمد بن حنبل، الرقم 16841، صححه شعيب الارناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم 4604.

ئاراستەیەکی زۆر مەترسیدار بوو دژ بە ئیسلامو لادانێ بوو لە پەیامی گشتگیری ئیسلام کە عەقڵو دڵی پێکەوە کۆدەکردەوە.

بیرۆکەی خەلقی قورئان یەکێك بوو لە مەترسیدارترین هەنگاوەکانی بەرزراگیری عەقڵی موعتەزیلەکان، لە هەمان کاتدا بووە هۆی لەناوچوونی خۆیشیان، چونکە دوای ئەوەی دەستیان گەیشتە لای فەرمانڕەواکانو ئەوپەڕی دەمارگیری خۆیان نیشانداو بڕیاری ئەوەیان دا ئعیتیزال تاکە دەربڕینی بیروباوەڕی ئیسلام بێت، دادوەری داوەرانیش ئەحمەد بن ئەبی داوود ئەو ئاراستەی گرتەبەر، سەرەتای چوونە ناو ئەو قەڵەمڕەوەیان بە مەسەلەی خەلقی قورئان دەست پێکرد، موعتەزیلەکان پێیان وابوو قورئان مەخلووقەو تەواو پێچەوانەی پەیامی رەسەنی ئیسلام بوون، چونکە قورئان فەرمایشتی خوایە، نە دەڵێین مەخلوق و نە نامەخلووق، ورووژاندنی ئەو مەسەلەیە بیدعەیەکە کە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی باسیان نەکردووە، ئەگەر لەناو خەڵکدا ئەوە بڵاوبێتەوە کە قوران مەخلووقە ئیتر هیچ پیرۆزیەکی قورئانیان لا نامێنێت، بەڵام موعتەزیلەکان سوور بوون لەسەر سەپاندنی ئەو بیردۆزە هەناردەکراوە، خەڵکییان ناچار دەکرد بەو بیروباوەڕە، مەئموونیش ئاڵاهەڵگر و بانگەشەکەری ئەو بڕوایە بوو و لە ساڵی 214 ی کۆچی و چوار مانگ پێش مردنی زانایانی بانگهێشت کرد بۆ ئەو بیروباوەڕەو فەرمانی کرد هەرکەس بڕوای پێ نیە با کەنار بخرێو دوور بخرێتەوە، کەوتە تاقیکردنەوەی زانایان، ئیتر

ـمه بوویە چەرمەسەریەكی گەورە، لە كاتی سەرەمەرگیشیدا خەلیفەكانی ـوی خۆیشی راسپارد تا درێژە بدەن بەو ئاراستەیە.

چەندین زاناو فیقهناس نەیانتوانی بەرامبەر بەو هەڵوێستە بوەستنەوەو ـرستی ئەو بۆچوونە بخەنەڕوو، تەنها چوار كەس نەبن كە بریتی بوون لە ـەحمەدی كوڕی حەنبەل‌و سەجادەو قەواریری‌و موحەممەد بن نووح، ئەوانە ـێو ئاسندا كۆت كران، سەجادە دواجار خۆی دا بە دەستەوە، قەواریری دوای ـێك خۆی دا بەدەستەوەو موحەممەد بن نووحیش كە بەرەو بەغداد ـەگەڕایەوە مرد، ئیتر بەرگریكاریەكە تۆخ بوویەوە لە پێشەوای سوننەت ـەحمەدی كوڕی حەنبەلدا، موعتەزیلەكان كە دەیانوت قورئان مەخلووقە ـكوڵییان دەكرد لە پیرۆزی‌و گەورەیی و شكۆی بەرزی قورئان، هەر ئەمەش ـوویە هۆی لەناوچوونیان، ئەوپەڕی لادانیان بوو لە ڕێبازی رەسەنایەتی ـیسلامی، چونكە ئەوان بانگەوازیان بۆ عەقڵ بوو جیا لە هاوكاری شەرع‌و پێیان ـبوو بە تەنها عەقڵ دەتوانێت خوا بناسێت، دەی ئەمە رێبازی ئیسلام‌و ـروشتی كارەكان نیە، ئەگەر عەقڵ ئەو توانایەی هەبوایە ئیتر خوای گەورە پێغەمبەرانی نەدەنارد.

فیتنەی خەلقی قورئان حەڤدە ساڵ درێژەی كێشا، لە ڕۆژانی مەئموون‌و موعتەصم‌و واسقدا بەردەوام بوو و موسڵمانان لەو ماوەدا زۆرەها نارەحەتی‌و چەوساندنەوەیان چەشت، بە درێژایی ئەو ماوەش پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل هەڵوێستی بەرگریكاری گرتەبەر، بەرگەی ئەشكەنجەو چەوساندنەوەو

بەندکردنی گرت، ئەو دلێریو نیازپاکیو خۆگرتنەی کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە کوژاندنەوەی فیتنەی خەلقی قورئاندا، مەردانە وەك بەربەستێکی پتەو بەرامبەر رەوتی مەترسیداری فەلسەفەی یۆنانی راوەستا، ئەو رەوتەی دەیویست تەنگ هەڵچنێت بە بیروباوەڕی ئیسلامو رەسەنایەتی چەمكو واتای گشتگیری ئیسلامی بخاتە ژێر پرسیار، پەیامێك کە هەموو بنەماو بنەڕەتەکانی یەکخواپەرستیو سروشو پێغەمبەرایەتی لەخۆگرتبوو، هەموو مێژوونووسو توێژەرانیش دان بەوەدا دەنێن کە خۆڕاگری ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کەلێنی مەترسیەکەی گرتو نەیهێشت ئەو درزە بخرێتە نێو ئیسلامەوە.

مێژوونووسانباس لەوە دەکەن کە ئەحمەدی کوڕی ئەبی داوود یەکەم کەس بوو سەبارەت بە مەسەلەی خەلقی قورئان لەگەڵ خەلیفەکاندا قسەی کرد، مەئموون بە سروشتی خۆی ئامادەیی هەبوو بۆ ئەو ئاڕاستەیە، ئیتر لەوێوە قۆناغی دەمارگیری توند بۆ ئەو ئاڕاستەیەو دادگایی کردنی زانایانی ئیسلامو ناچارکردنیان بە رازیبوون بەو گومانە دەستی پێکرد، گومانێك کە لەگەڵ چەمكو واتای رەسەنی ئیسلامیدا نەدەگونجا، چونکە پەیامی ئیسلامی پێی وایە قورئان فەرمایشتی خوایەو دێرینەو مەخلوق نیە.

مەئموون ناکۆکیەکەی بردە نێو بازنەی دەسەڵاتەوەو بە سیفەتی خەلیفە بوون هاتە نێو مەسەلەکەوەو خەڵکی ناچار دەکرد بە زۆر بەو دیدە نوێیە رازی بن، بەهۆی ئەم بیرۆکەوە ئازاردانی زانایانی گرتەبەرو مەئموونیش تاوانی خۆیو شوێنکەوتوانی پاش خۆیشی کەوتە ئەستۆ، موعتەصەمیش لەسەر هەمان

ـیرەوی مەئموون رۆیشتو پۆستی دادوەری دادوەرانی سپارد بە ئەحمەدی کوڕی ـەبی داوود، ئەم کەسایەتیەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر موعتەصەم، بۆیە موعتەصەمیش درێژەی دا بە فیتنەکەو ئەرکی مشتومڕی نەیارانی بیری موعتەزیلەی سپارد بە ئیبن ئەبی داوود تا هێرشیان بکاتە سەر و تۆمەتباریان بکات بە لەدین دەرچوون، ئەویش کەوتە کوشتارو لێدانو لەو نێوەندەشدا لە ساڵی 220ی کۆچیدا بە قامچی دای لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.

لە ساڵی 237 ی کۆچیدا موتەوەکل هاتو کەوتە راستکردنەوەی ئەرازووەکە بە ئاڕاستەی رەسەنایەتی ئیسلامی، خوای گەورە تۆڵەیەکی سەختی لە ئیبن ئەبی داوود وەرگرتەوەو تووشی ئیفلیجی بوو و دەەست گیرا بەسەر شمەکەکانیداو بری سەدو بیست هەزار لە کوڕەکەی وەرگیرا جگە لە بەهای چل هەزار جەواهێر، ئیتر سوننەت گەڕایەوە شوێنی خۆیو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش دوای لابردنی ئیبن ئەبی داوود ماوەی چوار ساڵو شتێ ژیاو بە چاوی خۆی دەیبینی چۆن قەڵەمرەو وو دەوڵەمەندی ئەو کەسانە کەم دەکات کە چاویان لە دنیا بوو و دەستبەرداری کرۆکی دین بووبوون.

لە رۆژانی واسقەوە دەرکەوت کە پیلانەکە پیسو بانگەشەکە پڕوپووچە، واسق بە بەڵگەیەکی بەهێزی وا وەڵامی دایەوە کە ئیبن ئەبی داوودی شڵەژاندو خەلیفەی گێڕایەوە بۆ هۆشیاریو وازی هێنا لە ئازاردانی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئەمەش لەبەرئەوەی زانایەك هێنرا بۆ لای واسق، کتێبی النجوم الزاهرە بەسەرهاتەکەی هێناوەو نووسەری کتێبی (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و فیتنە) (وۆلتەر مالفیل باتۆن) بە شێوەیەکی جوان باسی کردووەو دەڵێت: واسق بە

ئیبن ئەبی داوودی وت ئادەی مشتومڕی لەگەڵ بکە، زاناکە لە ئیبن ئەبی داوودی پرسی ئایا دیدی ئەو لە مەسەلەی خەلقی قورئاندا بنەڕەتێکی پێویستی ئیمانەو دەبێت باوەڕداران دانی پێدا بنێن؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی بەڵێ، ئینجا زاناکە وەك پرسیار بکات وتی خوای گەورە دوای ئەوەی موحەممەدی نارد تا سروش بگەیەنێت بە قەومەکەی، ئایا ئەو پێغەمبەرە هیچی لەو پەیامە شاردەوە؟ ئیبن ئەبی داوود وتی نا هەمووی بە تەواوەتی گەیاندووە، زاناکە پرسی ئەی چۆن پێغەمبەر لەسەر بنەمای سروشێ کە بۆی هاتووەو ئەم ئەرکی تەنها گەیاندنیەتی خەڵکی بانگ نەکردووە بۆ ئەوەی بڵێن قورئان مەخلووقە، ئیتر ئیبن ئەبی داوود وەڵامێکی پێ نەبوو، زاناکە داوای لە واسق کرد تا ئەو خاڵە لەبەرچاو بگرێت، واسقیش رازی بوو، هەنگاوی دووەمی مشتومڕەکە پەیوەست بوو بە بەڵگەهێنانەوە بەم ئایەتە پیرۆزە (اليوم أكملت لكم دينكم)، کاتێك زاناکە پرسیاری کرد چۆن دەکرێت دوای دابەزینی ئەو ئایەتە بیرێکی نوێی مەزهەبی بهێنرێتە نێو دینەوە، ئیبن ئەبی داوود بەرامبەر بەم هێرشە هەوڵی بەرگری نەدا، زاناکە داوای کرد لە واسق تا ئەمە بە خاڵی دووەم لەبەر چاو بگرێت وەك پشتیوانیەك بۆ راکەی خۆی، واسقیش رازی بوو، لە هەنگاوی سێیەمدا زاناکە پرسیاری کرد ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم دەستە مەزهەبیەی بزانیایە کە خەڵکی بانگەوازی بۆ دەکەن نەدەکرا داوا بکات دانی پێدا بنرێت؟ ئیبن ئەبی داوود وتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمەی زانیوە، بەلام وەڵامی ئەوەی نەدایەوە بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەرکی دانەناوە لەسەر

موسڵمانان تا بڕوای پێ بهێنن یان نا، زاناکە داوای لە واسق کرد تا ئەمەش بە خاڵی سێیەمی بەرگری لە بڕواکەی وەربگرێت.

زاناکە لەو ئاستەدا نەوەستا، بەڵکو وتی با وا دابنێین پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) بەمەی زانیوەو خەلیفە یەکەمینەکانیشی فێر کردووەو هەموویان رازی بون بەوەی خەڵك ناچار نەکەن بەو دان پێدانانەی کە قورئان مەخلووقە، ئایا واجب دەبێت لەسەر بانگخوازێکی نوێ هەستێ بە کارێك کە پێغەمبەرو خەلیفە راشیدینەکان پێی هەڵنەساون؟ باشترو رەواتر ئەوە نیە ئەو بیروباوەڕە هەر وەك رایەکی شەخصی بمێنێتەوە وەك چۆن پێشین وایان کردووە نەك خەڵکی ناچار بکەن بە دانپێدانانی وەك چۆن ئەحمەدی کوڕی ئەبی داوود لێی نەویوە.

ئینجا ئەو دەستەواژەی زاناکە لە گوێدا دەزرنگایەوە کە دەیوت بۆچی خەڵك وەك تۆ بانگەواز ناکەن، مەگەر تۆیش وەك ئەوان توانات نیە؟ ئیتر واسق چوویە ژوورەوەو لەسەر پشت راکشاو بەردەوام وتەکەی ئەو زانایەی دووبارە دەکردەوە، دواتر زاناکەی ئازاد کرد و چوارسەد دیناری پێ دا و ناردیەوە بۆ وڵاتی خۆی، بەلام زاناکەی رازی نەبوو ئەو دیاریە وەربگرێت.

ئەمە هەمان پەیامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو کە وتی قورئان فەرمایشتی خوایەو نە دەڵێین مەخلووقەو نە دەڵێین نامەخلووقە.

کاتێك موعتەزیلە ویستیان فەلسەفەی ئیسلامی بێننە مەیدانو رەنگێکی ئیسلامی پێ ببەخشن، لە هەموو تاقمو فیرقەکانی تر خێراتر رووخان، زۆر بە سەختیش شکستیان خوارد، چونکە دەقی نەگونجاو بۆ پەیامەکەیان

بەکاردەهێناو زۆر زێدەڕۆییان تێدا دەکرد، ئیتر لەوانیشەوە ئەو دەستە وتاقمانەی تر دەرکەوتن کە لە چەمکی ڕەسەنایەتی ئیسلامیو یەکخواپەرستی حەق لایاندا(شوێنکەوتەکانی جیمی کوڕی صەفوانو زیراری کوڕی عەمرو بیشری مریسیو شوێنکەوتە باتینیەکانیانو هەلگرانی پیلانی مەجووسی).

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ماوەی هەژدە ساڵ دژ بەو چەرمەسەریە وەستایەوە، مەئموون بەندی کرد و واسق دادگایی کرد، لەو کاتەوەی گیراو سزا دەدرا تا ئەو کاتەی ئازاد کرا ماوەی بیستو هەشت مانگ بوو، بەردەوام لەکاتی دادگاییەکانیدا هاوار دەکرد(دەقێکی قورئان یان سوننەتی پێغەمبەری خوام بۆ بهێنن تا بەڵگە بێت بۆ ئەوەی بڵێم قورئان فەرمایشتی خوایە، ناڵێم مەخلووقە) لەبەرامبەر مەئموونو موعتەصەمو واسق خۆڕاگرانە وەستاو وێنەی دیوارێکی بەهێز خۆڕاگرانە راوەستا، وەك زانای پایەبەرز ئەبولحەسەنی نەدەوی دەڵێت خۆڕاگرانە بەرامبەر ئەو ئاراستەیە وەستا کە دەیویست بیرکردنەوەی فەلسەفی زاڵ بکات بەسەر ئەم ئوممەتەدا، ئەگەر ئەوە روویدایە ئیتر بەرەبەرە ئوممەتی ئیسلامی لە سەرچاوە یەکەمینەکانی دینو پێغەمبەرایەتی موحەممەدی دادەبڕا و ملکەچی فەلسەفەکان دەبووو دەکەوتە ژێر کاریگەری راو پێوانەکانو بۆ هەتاهەتایە سیاسەت زاڵ دەبوو بەسەر ئاییناو ئازادی رادەربڕینو بیروباوەڕ نەدەما، بەوجۆرە ئەو وەستانەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل یەکەم چەکوش بوو بەرامبەر بەو تەنگ پێهەڵچنینە مەترسیدارەی گیرابوویەبەر کاتێك موعتەزیلەکان چاویان بڕیە دەسەڵاتو تەواو رۆچوون لە

بڵاوکردنەوەی ڕێچکەکەی خۆیانو دژی هەر کەسێ دەمارگیرییان دەنواند کە هاوڕای خۆیان نەبێت، تا گەیشتنە ئەوەی کاتێك دیل گۆڕینەوەی نێوان موسڵمانانو ڕۆمەکان لە سەردەمی واسق لە ساڵی 231 ی کۆچیدا ڕوویدا، ئەحمەدی کوڕی ئەبوداوود لەلایەن خۆیەوە نێردراوێکی نارد تا بزانێت دیلەکان تاسەی دینیو لایەنگرییان چۆنە، ئیتر هەرکامیان دانی بنایە بە بڕوای مەخلووق بوونی قورئان ئەوەیان ئازاد دەکرا.

موسڵمانان بە گشتی دژی ئەو بیدعەیە وەستانەوە، موسڵمانانی ئەندەلوسیش نارازی بوون لەو بیدعەیەو بەرامبەری وەستانەوە، وەستانەکەی ئیبن حەنبەل بەرامبەر بەو ڕەوتە زیرەی کە هێزی بۆ خۆی بەکاردەهێنا، پەنایەك بوو بۆ دەروونی ئیسلامی تا چەمکی ڕەسەنی ئیسلامی خۆیان بپارێزنو ڕێ نەدەن بە لاڕێکردنو دەرچوون لە کرۆكو ساکاریو سەرچاوەی یەکەمی ئیسلامی، ئیتر ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هیچ باکێکی نەبوو بەرامبەر بەو لێدانو سزادانە، ئەوەبو گیراو دەستەکانی بەسترانەوە، ئازاری دەستەکانی تا ڕۆژی مردنی بەردەوام بوو، جەللادەکان بە سەرە لێیان دەدا، هەموو شەوێکیش مشتومڕیان لەگەڵ دەکرد بەڵکو وازبهێنێت، بەڵام ئەو هەنگاوێکیش پاشەکشەی نەدەکرد، ئینجا دواتر کۆتێکی نوێی بۆ دەهێنراو قاچەکانیشی دەخرانە نێو کۆتەوە، خۆی دەڵێت چەند جار لە هۆش دەچووم تا وازیان دەهێنا لە لێدانم ئینجا دەهاتمەوە هۆش خۆم، هەروەها دەیوت خوایە ئەگەر من لەسەر حەقم ڕێ مەدە داوێنم دەرکەوێت.

مروزدی خوێندکاری دەیوت خۆتان مەکوژن، ئەویش وتی ئەی مرووزی بڕۆرە دەرەوەو سەیرێ بکە، مرووزی دەڵێت منیش چوومە دەرەوەو بینیم لە پاڵ بینای خەلیفەدا خەڵکێکی بێشومار قورئانیان لە دەستەو بە دەستەکەی تریشیان پەڕەو پێنووسیان پێیە، مروزی وتی ئەوە چی دەکەن؟ ئەوانیش وتیان چاوەڕێین بزانین ئەحمەد چی دەڵێت تا بینووسینەوە، ئەویش چوویەوە ژوورەوە بۆ لای ئەحمەدو مەسەلەکەی بۆ باسکرد، ئەویش وتی ئەی مرووزی ئەکرێ هەموو ئەوانە گومڕا بکەم؟! ئەگەر زانا لە ترسانا بێدەنگ بێتو نەزانیش لە نەزانیەوە بێدەنگ بێت، ئیتر کێ حەق بخاتەڕوو.

ئیبراهیمی کوڕی موصعەبی شورتی دەڵێت کەسم نەدیوە هێندەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دڵچەسپاو بێت کاتێك لەو ماوەی چەرمەسەریەدا وا دڵچەسپاو بوو.

دوای ئەوەی ماوەی چەرمەسەریەکە تەواو بوو، ئەحمەد لە هەموو ئەوانە خۆش بوو کە خراپەیان بەرامبەری نواند، موتەوەکل دیاری بۆ نارد و ئەویش وەری نەگرت، بەڵکو ژیانی لەسەر ئەوماڵو ماڵاتە بوو کە بە میرات لە باوکیەوە بۆی مابوویەوە.

یەکەم کەس باسی خەلقی قورئانی کرد جەعدی کوڕی ئەدهەم بوو لە دیمەشق کە مامۆستای مەڕوانی کوڕی موحەممەد بوو، کاتێك بەدوایدا گەڕان رایکردو چوو لە کووفە نیشتەجێ بوو و لەوێ جەهمی کوڕی صەفوان بوو بە خوێندکاری، دەوترێت بەڵکو جەعد ئەوەی لە ئەبانی کوڕی سەمعانەوە

وەرگرتووەو ئەبانیش لە تالووتی کوڕی ئەعصەمی جوولەکەوە ئەو پەیامەی وەرگرتووە، جەهمی کوڕی صەفوان کاریگەر بوو بە جەعدو نکووڵی سیفەتەکانی خوای دەکرد، لەو روانگەشەوە نکووڵی ئەوەی کرد خوا قسە بکات، بۆیە دەیوت قورئان مەخلووقە.

لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە لوبەیدی کوڕی ئەعصەمی جوولەکە دەیوت تەورات مەخلووقە، هەندێ لە توێژەران پێیان وایە ژمارەیەك لەو جوولەکانەی بە رووکەش موسڵمان بوون لە بەصرە ئەو بیرەیان لەنێو موسڵماناندا بڵاوکردەوە، واصلی کوڕی عەتائیش ئەوانی دەناسیو هاتوچۆی ئەوانی دەکرد، ئەوان دەیانوت چاکە لە خواوەیەو خراپەش لە کردەوەی مرۆڤەوەیە و قورئانیش مەخلووقو داهێنراوەو دێرین نیەو خوای گەورە لە رۆژی دواییدا نابینرێت، باوەڕدار ئەگەر تاوانێکی کردو مەی خواردەوە ئەوە لە مەنزلێ دەبێت لەنێوان باوەڕداری و بێباوەڕیدا، ئیعجازی قورئان لەوەدا نیە کە هەر خۆی موعجیزە بێت واتە ئەگەر خوای گەورە عەرەبی دوور نەخستایەتەوە لە نموونە هێنانەوە وەك قورئان ئەوە بەدڵنیاییەوە نووسراوێکیان دەهێنا کە هاوشانی قورئان کێبڕکێ بکات، کاتێك واصل لە کوڕی حەسەنی بەصریدا ئەم قسانەی دەکرد حەسەن رێگری لێکرد، واصلیش کەناری گرتو لە مزگەوتەکەدا بازنەیەکی تری رێکخستو ئەو خوێندکارانەی هەیبوون دەیناردن بۆ رۆژئاواو یەمەن و خوراسان و جەزیرە کووفەو ئەرمینیا، دەستەیەك لەوانە لە دەوری مەئموون کۆبوونەوەو ئەویش خۆی لەلایەکەوە کاریگەر بوو بە وەرگێڕانی

فەلسەفەی یۆنانو مەنتیقی یۆنانیو لە لایەکی ترەوە دەمارگیریەکی فارسی لە دایکی و بارودۆخەکەیەوە وەرگرتبوو چونکە ئەو لە کەشێکی کاریگەر بە دیدی فارسیدا گەورە بووبوو.

لەبەردەمیدا لەسەر هەندێ مەسەلەی زۆر گرنگ مشتومڕ دەکرا، لەوانە پەیوەندی مرۆڤ بە پەروەردگاری و سروشتی خوایی، وەك چۆن مەسیحیەکان ئازادی مشتومڕکردن لەسەر چاکتربوونی دوو دینەکەیان گرتبوویەبەر.

دوو کەس لە خراپترین کەسانی سەردەمی خۆی لێی نزیك بوونەوە: بیشری موریسی و ئەحمەدی کوڕی ئەبی داوود، بیشری موریسی باوکێکی جوولەکەی هەبوو کە لە بازاڕی کووفە پێستەچی بوو، وەك خەتیبی بەغدادی لە کتێبەکەیدا (تاریخ بغداد) باسی کردووە صالحی عەجلی پێی وتم باوکم پێی وتم جارێك بیشری مریسیم بینی پیاوێکی بە تەمەنی باڵاکورتی جل شڕۆڵی تووکن بوو زۆر زۆر لە جوولەکە دەچوو.

مریسی دەچوو بۆ لای مەئموون، تووسی باس لەوە دەکات لە کۆڕی مەئمووندا باسی راوبۆچوونی خراپی دەکردن دواتر ئەحمەدی کوڕی ئەبی داوود لەلایەن مەئموونەوە نزیك کرایەوە، بەوەش موعتەزیلە توانییان بڕوا بە مەئموون بکەن کە قورئان مەخلووقەو بەوەش بوونە خاوەن قەڵەمڕەوێکی فراوان.

بیشری مریسی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی رەشیدەوە باسی خەلقی قورئانی دەکردو ئەویش هەڕەشەی لێکرد، هاروون دەیوت بیستوومە بیشر دەڵێت قورئان مەخلووقە، بەخوا ئەگەر بکەوێتە بەردەستم دەیکوژم، بیشر

خۆی شاردەوە تا لە سەردەمی مەئموندا دەرکەوتەوەو توانی خۆی دەربخات، خەتیبی بەغدادی دەڵێت نزیکەی چل ساڵ بانگەوازی دەکرد بۆ مەسەلەی خەلقی قورئانو کتێبی لە بارەوە دەنووسی.

مەئموون کاریگەر بوو بە پەیامی خەلقی قورئانو عەلی کوڕی ئەبووتالیبی لە ئەبووبەکر و عومەر پێ باشتر بوو، ئیتر خەڵکێك لێی بێزار بوون، مێژوونووسان باس لەوە دەکەن مەئموون چوار بیدعەی هەبوو:

لەبەرکردنی جلی سەوز و نزیککردنەوەی عەلەویەکان و بانگەشەکردن بۆ خەلقی قورئانو تەکبیرکردن بە سەربازان لەدوای پێنج نوێژەکەو ڕەواکردنی هاوسەرگیری موتعە کە دواتر لێی پەشیمان بوویەوە، خەڵکی ناچار دەکرد تا بڵێن قورئان مەخلووقە، ئەمەش خراپترین هەڵوێستی ماوەی ژیانیو ڕەشترین پەڕەی ژیاننامەی بوو.

دوای حەفتا ساڵ لە مردنی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەبولحەسەنی ئەشعەری دەرکەوتو کەوتە بەرگریکردن لە ڕەسەنایەتی ئیسلامیو هەمان ڕێبازەکەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی گرتەبەر، ئەمە لە کاتێکدا پێشتر ماوەی چل ساڵ لەنێو موعتەزیلەکاندا ژیانی بەسەربرد، ئەبولحەسەن لەو ماوەشدا تەواو ڕازی نەبوو لە ڕێبازی ئیعتیزال چونکە زۆر لە تەئویلدا ڕۆچووبوونو عەقڵیان پێش نەقڵ دەخست، بۆیە ئەشعەری پێی وابوو ڕەسەنایەتی ئیسلامی ئەوە دەخوازێت ڕێیەکی لەبارتر بگرێتەبەر بۆ چەمکو واتای گشتگیری ئیسلامی کە بەڵگەی عەقڵی و سروش و سوننەت پێکەوە بگونجێنێ، خواش ڕێنموونی

کرد بۆ ئەو رێیە کە لە بازنەی قورئانو سوننەتدا پشتی دەبەست بە دیدی عەقڵیو قورئانو سوننەتی پێش عەقڵ دەخست، لەکاتێکدا موعتەزیلەکان عەقڵیان پێش نەقڵ دەخست، هەروەها ئەبولحەسەن لادانی موعتەزیلەکانی تابە تبە مەسەلەی قورئان ئاشکرا کرد، دەیوت موعتەزیلەکان قورئانیان بە ئاڕاستەی روانینی خۆیان ئاڕاستە کردووەو بەپێی رێچکەی خۆیان تەئویلی دەکەن، تەفسیرەکانیان پڕن لە مشتومڕ و دەربڕینی پێچو پەنا و پێدانی بەرگی حەقیقەت بە ناحەقیەکان، بۆیە ئەشعەری توانی بە هەمان بەڵگە کەلامیەکانی خۆیان وەڵامی موعتەزیلەکان بداتەوەو بە بەڵگەیەکی بەهێزتر بەڵگەکانیان تێکبشکێنێت.

بۆ نموونە دەیوت: گومانسازان بەپێی بۆچوونی خۆیان تەئویلی قورئان دەکەنو بەپێی ئارەزووی خۆیان راڤەی دەکەن، راڤەیەك کە خوای گەورە داینەبەزاندووەو لە پێغەمبەری خوایشەوە (ﷺ) نەگێردراوەتەوەو لە پێشینیشەوە نەهاتووە، بەڵکو ئەو راڤەیان لە ئیبنلوهەزیل و ئیبراهیم نیزام و قووتی و ئیسکافی و جەبائی و بەلخی و رێبەرانی تری گومڕاییەوە وەرگرتووە، ئەوەی زۆر بێزارکەرە ئەوەیە جەبائی مامۆستا لە تەفسیری قورئاندا کتێبێکی نووسیوە کە پێچەوانەی سروشتی خوایی تەئویلی کردووە، لە کتێبەکەیدا یەك وشەشی لە موفەسیرانەوە نەهێناوە، بەڵکو تەنها پشتی بەستووە بە وەسوەسەی دڵی خۆیو شەیتانەکەیەوە، ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە خەڵکێکی ئاسایی زۆر کتێبەکەی بە گرنگ دەزانن، هەر خۆم پێوە سەرقاڵ نەدەکرد.

بۆیه دەبینین ئیسلام ڕێگەکە ڕاست دەکاتەوەو هەرکات دەستەیەك یان بانگەوازێ ڕێی ڕاست لاڕێ دەکەن و هەوڵ دەدەن لە ڕەسەنایەتی و کاملّیە گشتگیرەکەی دەریبکەن، خێرا دەیگێڕێتەوە سەر ڕێ ڕاستەکە، ئەشعەری هەڵەکانی موعتەزیلەکانی لە مەسەلەی خەلقی قورئان و نکوولّی کردن لە سیفەتەکانی خواو مەسەلەی قەزاو قەدەردا دەخاتەڕوو، هەموو ئەو مەسەلانەش لە فەلسەفەی یۆنانی و مەنتیقی ئەرستۆوە وەرگیراون و دووبەرەکی خستە نێو موسڵمانان و دەرگای تەئویلی کردەوە، موعتەزیلەکان کەوتنە تەئویلی عەقلّی تا ئاستێ نکوولّییان دەکرد لە سیفەتە خواییەکان، کەرامیەکان تەشبیهو تەجسیمیان[1] گرتەبەرو جوهەمیەکانیش بیرۆکەی جەبریان[2] گرتەبەر، هەموو ئەوانە لقێکی چەمکو واتاکانی فەلسەفەی یۆنانی و پەیامی جوولەکەیی و مەسیحی بوون.

مامۆستا ئەبولحەسەنی نەدەوی دەڵێت ئەشعەری ماوەی چل ساڵ ڕێبەری موعتەزیلەی دەکرد، دواتر عەقڵە گەورەو دەروونە ڕاراکەی بەرامبەر بە ئیعتیزال ڕاپەڕی و پەرچەکردارێکی دژ بە تەئویلە موعتەزیلیەکان و ڕۆچوونیان لە قیاس و زاڵکردنی عەقڵ گرتەبەرو هەستی بەوە کرد کە ئەوان خەریکن دین ملکەچی مەنتیقی دروستکراو و ئەو پێشەکی و بنەڕەتانە دەکەن کە بە گومان دایان

---

[1] - واتە شکڵ و شێوەیان بۆ خوا دادەنا و دەیانچواند بە بەدیهێنراوەکان (وەرگێڕ).

[2] - واتە پێیان وابوو مرۆڤ هەرچی دەکات بە دەستی خۆی نیەو هیچ ویستێکی نیەو هەموو شتێ بەسەریدا سەپێنراوە. (وەرگێڕ).

ناون‌و وێنای زیرەکی خۆیانەو ئەوەیان کردووە بە مەسەلەیەکی یەکلاییی‌و بە پێی بیروبۆچوونی خۆیان تەئویلی قورئان دەکەن، ئەشعەری گەیشتە ئەو بڕوایەی حەقی راشکاو ئەوەیە کە هاوەڵان‌و پێشینی ئوممەت لەسەری بون.

ماوەی پانزە رۆژ لە ماڵەوە مایەوەو خەریکی رامان و بیرکردنەوەو ئیستیخارە بوو تا دواجار دڵنیا و یەکلابوویەوەو گەیشتە ئەو بڕوایەی دەبێت حاشا بکات لە ئیعتیزال و بگەڕێتەوە بۆ رێبازی سەلەف، ئینجا چوویە مزگەوتی گەورەی بەصرەو چوویە سەر کورسیی‌و بەوپەڕی تواناییەوە هاواری کرد هەرکەس من دەناسێت ئەوە منی ناسیوەو ئەوەش نامناسێت ئەوە خۆم خۆمی پێ دەناسێنم، من فلانی کوڕی فلانم، من دەموت قورئان مەخلوقەو خوا بە چاو نابینرێت و من خۆم ئەنجامدەری خراپەکانم، و من تەوبە دەکەم‌و خۆم یەکلا دەکەمەوە بۆ وەڵامدانەوەی موعتەزیلەو ئابڕووچوون‌و هەڵەکانیان دەخەمەڕوو.

مەترسیدارترین بیری ئیعتیزال ئاراستەی پیرۆزدانانی عەقڵ و بە گەورە دانانیەتی لەو مەسەلانەدا کە تەنها رێنماییەکانی پێغەمبەرایەتی و بڕوابوون بە غەیب دەتوانێت بڕیاریان لەسەر بدات، سەرچاوەی ئەم بیرەش فەلسەفەی یۆنانیە کە لە شەپۆلێکی توندو بەرچاودا خۆی نواند و خەریك بوو بڕوابوون بە ئیمان‌و پشت بەستن بە رێنماییەکانی قورئان راماڵێت، بیری فەلسەفی لەسەر حسابی دڵ‌و سۆزو کردار گەشەی کرد.

ئەبولحەسەنی ئەشعەری وەڵامی موعتەزیلەکانی دەدایەوەو لە کۆڕ و دانیشتنەکانیاندا مشتومڕی دەکرد لەگەڵیان‌و هەوڵی دەدا بیانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە دواجار خۆی پێی گەیشت.

یەکەم: ئەشعەری نکوولّی نەدەکرد لە عەقڵ، بەڵکو لە شوێنی رەوای خۆیدا داینا، عەقڵ پیرۆز نیەو دەسەڵاتی بێسنووریشی نیە، دەسەڵاتی نیە بەسەر ئەوەی پەیوەندی هەیە بە زات‌و سیفەو ئەودیو سروشتەوە.

دووەم: رایگەیاند سەرچاوەی بیروباوەڕ سروش‌و پێغەمبەرایەتی موحەممەدیەو رێی زانینی بیروباوەڕیش قورئان‌و سوننەو ئەوەیە کە لە هاوەڵانەوە چەسپاوە، قورئان‌و سوننەت سەرچاوەی ئەو مەسەلانەن کە پەیوەستن بە ئیلاهیلات‌و ئەودیو سروشتەوە نەك عەقڵی رووتنەی میتافیزیقیای یۆنانی.

سێیەم: قەدەر هەموو بە دەستی خوایە ئیتر چاك‌و خراپی، دانی نا بە سیفەتەکانی خوادا هەر لە تواناو زانست‌و ویست‌و ژیان‌و بیستن‌و بینین‌و قسەکردنی، قورئانیش فەرمایشتی خوایەو مەخلووق نیەو خوای گەورە هەیە و لە رۆژی دواییدا بە چاو دەبینرێت، دانی نا بە هەموو بیستراوەکان‌و سزای ناوگۆڕ و مونکەر و نەکیر و صیرات‌و تەرازوو و حەوزی کەوسەردا، ناشوترێت ناوەکانی خوا جگە لە خوا دەگرێتەوە.

چوارەم: ئەشعەری بانگەوازی بۆ ئەوە دەکرد لەو شتە غەیبیانەی کە تێگەیشتن لێیان ئاسان نیە خۆ بسپێرێتە دەست خوا، رێگریشی دەکرد لە

مشتومڕ و ملەجیڕە لە دیندو نەیای لە تواناداا، پێی وابوو دەبێت باوەڕداران لەسەر حوکمی خوا خۆڕاگر بن‌و خوا چ فەرمانێکی کردووە بەجێی بگەیەنن‌و رێگری لە چی کردووە نەیکەن‌و نیازپاك بن لە کرداردا‌و ئامۆژگارییان هەبێت بۆ موسڵمانان.

هەروەها دەیوت موعتەزیلە بە پێی راوبۆچوونی خۆیان تەئویلی قورئان دەکەن بەجۆرێ لەگەڵ فەرمایشتی خوادا ناگونێت، هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر ئەو راوبۆچوونەیان‌و لە پێغەمبەری خوایشەوە نەگێردراوەتەوەو لە بیروباوەڕی پێشینیشدا نەهاتووە، بەڵکو موعتەزیلەکان لە تێگەیشتن لە دیندا شوێن ئارەزووی خۆیان کەوتون‌و بێلایەنانە نەیانڕوانیوەتە قورئان‌و سوننەت‌و قورئان‌و سوننەتیان نەکردووە بە پێشەواو سەرچاوەی بیروباوەڕو راوبۆچوونی خۆیان، بەڵکو بیروباوەڕیان تەواو لەگەڵ قورئاندا نەگونجاوەو کەوتوونەتە تەئویلکردنی قورئان.

وێنەی هەوڵی ئەشعەری چەمك‌و واتای رەسەنایەتی ئیسلامی لەسەر دەستی کەسانی وەك باقەلانی و جوەینی و غەزالی گەشەی کرد، بەوەش پاش ئاشکرابوونی ساختەو لادانەکانی، چەمك‌و واتای موعتەزیلە داڕووخاو جارێکی دی توانای ئەوەی نەما وەك وێنەی لاڕێبووی یەکەمی ببووژێتەوە، ئەو هەنگاوە یەکەمەی کە پشتی دەبەست بە فەلسەفەی ئایینەکان‌و چەمك‌و واتای فەلسەفەی یۆنانی و پەیامی جوولەکەیی و مەسیحی‌و ئامانجی لە پشت هەموو ئەمانەوە تەنگهەڵچنین بوو بە ئیسلام، ئەو پەیامەی کە هەریەك لە ئەحمەدی

کوڕی حەنبەلو ئەشعەری و جوەینی و غەزالی بەرنگاری بوونەوە، ناکرێت لەگەڵ ئەو بانگەوازە جیا بکرێتەوە کە جارێکی دی لە سەردەمی نوێدا دەرکەوتووەتەوەو وەك چەمكو واتایەکی فەلسەفی یان بیردۆزەیەکی رووتەن خۆی دەنوێنێ، لە سایەی ئەو واقیعە تاڵەی کە تیایدا موعتەزیلە چەمكو واتا شێواو و نارەواکانی خۆی بە زۆر سەپاندو نەیتوانی بەرنگاری تیشکی حەقو رووناکی زانست بێتەوەو ئەوانەش کە هەڵگری ئەو رووناکی زانستە بوون دەستبەرداری نەبوون جگە لە دەستەیەکی ئارەزووباز و چاوچنۆك نەبێت، ئینجا دواتر ئەو هەموو توێژینەوە دروستە چۆن هاتنو هەموو بانگەشە پووچەکانیان هەڵوەشاندنەوە.

داخوازی هەندێ نووسەر و بیریار بۆ گەڕانەوە بۆ بیری موعتەزیلە هەر لە سەرەتاوە ئارەزوویەکی جوولەکەییو پیلانی باتینیو مەجووسی لە پشتەوەیە بە ئامانجی لەناوبردنی ئیسلامو گێڕانەوەی ئەو شێوازی دژایەتیە لە سەردەمی نوێدا، فلانو فلانە کەسو ئەمەو ئەوەش هەر جێگرەوەکانی مریسی و ئیبن ئەبی داوود و جەهمی کوڕی صەفوانن.

## ئیسلامو عەقلانیەت

پێشەوا شافیعی دەڵێت (خەڵکی بە وازهێنانیان لە زمانی عەرەبی و خوودانە زمانی ئەرستۆتالیس تووشی دووبەرەکی و نەزانی بوون)، وەرگێڕانی بەرهەمی یۆنانیش سەرچاوەی ئەو بەرزراگرتنەی رەوتە عەقڵیە بوو کە جیا لە رەوتەکانی دی وەك ئیمانو ویژدان عەقڵ بەرزتر رادەگیرا، کە بەو جۆرە عەقڵ بە تەنها بەرز راگیرا، مەسەلەکە کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی بوو کە توانی پێشتر تەنگ هەڵچنێت بە بیری جوولەکەیی و مەسیحیو لاهووتی مەسیحی وا لێبکات دەستبەرداری لاهووتی مەسیحی بێت و عەقڵ ببێتە بنەڕەتی ئیمان، بەڵام ئیسلام چەمكو واتای روونی خۆی هەیە بۆ عەقڵ و وەك پێناوێك لە پێناوەکانی دی وەرگرتنی ئیمانی دەزانێت وەك ویژدان و هەستی دڵ.

موعتەزیلە بە پیرۆزراگرتنی عەقڵ و دانانی بە تاکە رێی گەڕانو توێژینەوە لە دیدو تێگەیشتنی ئیسلامی دەرچوون، رەسەنایەتی ئیسلامیش بە درێژایی سەردەمەکان بە توندی بەرنگاری ئەو بیروبۆچوونە بوویەوە، ئەمەش هەرکات باسی عەقلانیەت گەرم کرابێتەوە بە تایبەت لە عەقڵی نوێدا، بەڵگەی توێژەرانیش ئەوە بووە عەقڵو دڵ لە قورئاندا هاوواتای یەکننو عەقڵ چرایەکەو سروش نەوتەکەیەتی، بۆیە بە گەورەتردانانی عەقڵ وەك تاکە سەرچاوەی مەعریفە خۆی لە خۆیدا واتە کەمکردنەوەی شانو شکۆی سروش.

بێگومان تەنها بەرزراگرتنی عەقڵو بڕیاردانە دەستی بۆ رووداو و ئاراستەکانی ژیان لە تەواوێتی و گونجانی نێوان عەقڵو سروش و

بەیەککگەیشتنی عەقڵو ڕۆح کەم دەکاتەوە، توێژەرانیش ئەوەیان نیشانداوە عەقڵ بە تەنها بەس نیەو دەبێت پێغەمبەرو سروشێك هەبێت، ئەو پێغەمبەرە عەقڵ بەهێز دەکاتو دانایی عەقڵ پشت ڕاست دەکاتەوە، ئیتر پێکەوە دەبنە دوو باڵگە لەسەر یەك مەدلوول، سروش دەبێتە ڕێنیشاندەرو ڕێنموونی عەقڵ لەو شتانەدا کە عەقڵ بە تەنها ناتوانێت شارەزایان بێت وەك مەسەلەی غەیبو زیندووبوونەوە، هەندی لایەنی شتەکان دەخاتەڕوو کە عەقڵ ناتوانێت چاكو خراپیان جیا بکاتەوە.

هەروەها ئیسلام هەر لە بنەڕەتدا جیاکەرەوەی نێوان دوو جیهانی ڕۆحو دنیایی نیە، بەڵکو لە ئیسلامدا پەیامێکی لەو چەشنە نیە (ئەوەی هی قەیصەرە بیدە بە قەیصەر و ئەوەی هی خوایە بیدە بە خوا) بەڵکو لە ئیسلامدا هەموو شتێ هی خوایەو هیچ جیاکاریەکی روون نیە لەنێوان دوو جیهانی رۆحی و دنیاییدا.

بێگومان ئەو کەشەی ناو مەسیحیەت بانگەواز دەکات بۆ جیاکردنەوەی عەقڵو نەقڵ، لە ئیسلامدا بوونی نیەو بەردەوام دەقی قورئانی زیندوو و بەهێز و ژیان دەبووژێنێتەوەو هیچ گۆڕانێك ناتوانێت شانو شکۆی کەم بکاتەوەو گومانی لەسەر دروست بکات، کارێ کە بیری ڕۆژئاوایی بەرامبەر بە نەقڵی مەسیحی و جوولەکەیی ئەنجامیدا.

ئیسلام هەمیشە لە بازنەی سروشدا ڕێ دەکات، پێشەوا غەزالی ئاماژە بەمە دەکاتو دەڵێت ئەرکی عەقڵ ئەوەیە شایەتی ڕاستی بدات بۆ پێغەمبەرایەتی و

شایەتی دەستەوسانی خۆیشی بدات، عەقڵ ناتوانێت ڕێنموونی مرۆڤ بکات بۆ چاكو خراپی کردار و گوفتار و ڕەفتار و بیروباوەڕ، بەڵکو ئەگەر شتی وای بینی لێی تێدەگات و دانی پێدا دەنێت، بۆیە عەقڵ خزمەتکاری گوێڕایەڵی دینە، هەموو بنەڕەتە گشتیەکام لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە سروش ڕێنیشاندەری عەقڵەو دین پێشەنگی عەقڵ دەکات بەرەو راستی.

یەکێك لە توێژەران دەپرسێتو دەڵێت بۆچی عەقڵی مرۆیی نەیتوانی ببێتە بەدیلی حیکمەتی خوایی لە دیاریکردنی بیردۆزە بنەڕەتی و بنەڕەتە ڕێکخستنیەکانی کۆمەڵگە مرۆییەکاندا، وەڵامیشی بەم شێوە دەداتەوە: مرۆڤایەتی داخوازە لەوەی بڕیاری بنەڕەتی بیردۆزەو بنەماکانی ڕێکخستنەکانی دەدات تا لە سەروو خۆیەوە بێت، نەك لە نێویدا بێت، ئەمەش تا لە سەرەوە زاڵ بێت بەسەر پێویستیەکانیدا، بەلام ئەگەر لەنێو خۆیدا بێت هەر لەو نێوەندەدا گەمارۆدراو دەمێنێتەوەو ناتوانێت ئاگادار و سەرپەرشتیاری راستیە بالاکان بێت، مرۆڤایەتی پێویستی بە یەکێکە لە سەرەوو خۆیەوە ئاگاداری بێت و چاوی هەموو شتێك ببینێتو بەربەستەکانی کاتو شوێن ببڕێتو بتوانێت هەموو جیهانو تەمەنی جیهانیش نەك تەنها تەمەنی نەوەیەكێ مرۆڤایەتی بە هەموو گەلو هۆزەکانیەوە لەبەرچاو بگرێت، دەی ئایا مرۆڤ ئەمەی پێ دەکرێت؟!!

دەکرێت عەقڵ بە تەنها دوور لە چاودێری خوا لە مەیدانەکەدا بێت، لە شەرعی ئێمەدا عەقڵ وێستگەی راسپاردن و تێگەیشتنە لە قبووڵکردنی بیروباوەڕدا.

مرۆڤ عەقڵو دەروونە، جا وا دابنێ عەقڵی تووشی هەڵە نەبێت، ئەی پێت وایە دەروونی دوور بێت لە ئارەزووبازی، حیکمەتی خوایی بە تەنها توانای هەیە هەموو سەردەمو شوێنێ لەبەرچاو بگرێتو هەر پەروەردگارە زانستی هەموو شتێك دەگرێتەوە، حیکمەتی خواییە ئاگاداری دەکاتەوە لە لایەنگیری یان لادان، چونکە خاوەنەکەی بێباکە لە هەموو جیهانیان، عەقڵی دروستکراو نەیدیوە چۆن دروستکراوەو چۆن گەردوون بەدیهاتووە، لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە عەقڵی مرۆیی سووك ناکەین، بەڵکو رێزی دەگرین، چونکە عەقڵ چرای رووناکیەو وێنەی گڵۆپێکە کە کارەبای پێ بگات چ رووناکیەك دەبەخشێت، بۆیە عەقڵ ئەگەر پەیوەندی هەبوو بە پەروەردگاریەوە ئەو وزەیە دەگەیەنێت، بەلام کەسانی دی دەیانەوێت گڵۆپ بێ هیچ پەیوەستێ خۆی تەنها رووناکی ببەخشێت.

ئیماندار کەسێکە ئیمانی لەسەر هەریەك لە عەقڵو ویژدانیش وەستابێت، واتە لەنێوان هزر و هەستدا، عەقڵ لەگەڵ دڵدا پێکدەگات، ئەرکی عەقڵ روانینە ئامانجو هۆکارەکانە، ئەرکی دڵیش هەستی ناوەکیە، بۆیە ئەگەر ئاین تەنها لە ویژداندا یان لە عەقڵدا تەسك کرایەوە بانگەشەیەکی نائیسلامی دەبێت، مەعریفەش ئاراستەکراوە بەرەو ناخ، ئەمەش مەعریفەیەکی هەستیو

مەعریفەیەکی زانستی مەوزووعیە، هەردوو مەعریفەکە پەیوەستو تەواوکاری یەکدین، زانستی دروست ویژدان راست دەوەستێنێ، ویژدانی ساغیش گەورەترین پشتیوانی زانستە، ئایینی کاملٚ هەم زانست و هەم سەلیقەو هەم عەقلٚو هەم دلٚو بەلٚگەو دانپێدانان و هزر و ویژدانە، ئیتر ئەگەر ئایین لە یەکێك لەو دوانەدا بەرتەسك بکرێتەوە ئەوە یەکێك لە پایەکانی دەکەوێت، ئیتر چۆن لەسەر پێیەك دەوەستێت، هیچکات عەقلٚو ویژدان دژ بە یەك نین تا پێویست بکات مرۆڤێك ببێت بە دوو مرۆڤ.

بەمجۆرە ئیسلام بنەمای هاوسەنگی نێوان هێزە جیاوازەکانی مرۆڤ رێکدەخات، نەك تەنها لەنێوان عەقلٚو دلٚدا، بەلٚکو لەنێوان رۆح و جەستەشدا، ئیسلام دان نانێت بە ماددیگەری تەواو و رۆحانیەتی رەهاشدا، بەلٚکو ماددەو رۆح پێکەوە دەگونجێنێو هاوسەنگو لەبار رێکیان دەخات بەجۆرێ لەگەلٚ مرۆڤدا بگونجێن، چونکە مرۆڤ خۆی هەم جەستەو هەم رۆحە.

هەروەها ئیسلام هاوسەنگی مرۆڤ وەك تاكو وەك تاکێکی ناو کۆمەلٚگە رێکدەخات، ئیتر لادانو زێدەرۆییەکان ناهێلٚێت، ئەوەی پێی دەوترێت ململانێ یان نەگونجان ئیسلما لەناوی دەبات، بەلٚکو بوونی مرۆڤ لە دارمانو لەناوچوون دەپارێزێ، رێ نادات تووشی وەستانو چەقبەستوویی بێت.

هەروەها توێژینەوە نوێکانی هەندێ لە کەسانی کاریگەر بە بیری موعتەزیلە بەرپەرچ دەداتەوە کە هەندێ فەرموودەی هەلٚبەستراو و مەوزووعیان داناوە وەك فەرموودەی رووکردن و روو وەرگێڕانی عەقلٚو ئەوەی دەلٚێت عەقلٚ یەکەم

دروستکراوی خوا بووه، هەریەك لە ئیبنولقەییمو سیووتی دەڵێن ئەم فەرموودە مەوزووعەو چەندین زانای فەرموودەناسیش گێڕانەوەکەیان بە لاواز داناوە پێشڕەوی ئەوانەش زانای فەرموودەناس زەهەبیە.

مەترسیەکەی لەوەدایە کە مۆرکی ڕەواقی خۆی تێدا حەشارداوە، مۆرکێ کە تیایدا عەقڵ بە وێنەیەکی ماددی دەنوێنێ، دواتر بیردۆزەی دە عەقڵەکە دێنێ کە فارابی دایهێناوەو لە نووسینەکانی فەیلەسووفە موسڵمانەکاندا بڵاوبووەتەوە، زانایانی ئیسلام بەرنگاری ئەو فەرموودە مەوزووعە بوونەتەوە، حارسی موحاسبی بەرنگاری بووەتەوەو ڕێبازێکی تەواوی داناوەو تیایدا وتوویەتی عەقڵ غەریزە یان ڕووناکیەکە، پێشەوا ئەحمەدیش هاوڕایەتی، ئەشعەریەکانیش هاوڕان، زانستی نوێش پشتیوانی ئەمەیە، ئیبن تەیمیە لە پەیامی فورقاندا دوو بیردۆزەی ئیسلامو یۆنانی سەبارەت بە عەقڵ جیا دەکاتەوەو دەڵێت لای بیریارانی موسڵمان مەبەست بە عەقڵ غەریزەیەکە کە خوای گەورە لەناو مرۆڤدا دایناوە تا بەکاری بهێنێت.

هەروەها توێژینەوە نوێکانیش لەسەر ئەوە کۆدەنگن:

یەکەم: عەقڵ ناتوانێت ئەو نهێنیە خواییانە بزانێت کە سروشی خوایی لەرێی پێغەمبەرانەوە باسی کردووە، عەقڵ دەبێت سروش بکاتە ڕێنموونو ڕێنیشاندەری خۆی، ئەگەرنا هەرگیز ناتوانێت بکاتە مەعریفەی دروست سەبارەت بەودیو سروشت.

دووەم: عەقڵ پێویستی بە هاوکاری دەرەکی هەیە تا ڕێنموونی بکات بۆ ئەو مەسەلە خواییانەی تەنها لە ڕێی سروش یان ئیلهامەوە دەتوانێت شارەزایان بێت.

سێیەم: توانای عەقڵ لە تێگەیشتن لە هەمو مەسەلەکان پاش شارەزابوونی لە شەرعەوە، بۆیە عەقڵ پێویستی بەوەیە بەهۆی شەرعەوە ڕێنموونی وەربگرێت.

چوارەم: ئەوە سەلما کە عەقڵ بە تەنها ناتوانێت خوا بناسێتو چاكو خراپو جوانو ناشیرین جیا بکاتەوە.

پێنجەم: عەقڵ ناتوانێت بڕیار لەسەر شتێ بدات تا لە دوو بواردا بەرتەسکی نەکاتەوە: کاتو شوێن، ئیتر کەیو لە کوێ پێویستە، ئەگەر ئەوە نەبێت عەقڵ توانای نیە بەسەریدا.

بۆیە عەقڵ ناتوانێت نە بڕیار بدات لەسەر ئولوهیەتو نە قەزاو قەدەریش، بەڵکو هەموو کاری بەرتەسك بووەتەوە لە تێگەیشتن لەو دەقانەی سروشەوە کە لە دەرەوەی عەقڵەوە هاتووە.

شەشەم: عەقڵ سنووردارەو ناتوانێت دەرەوەی سنوور وێنا بکاتو توانای نیە بڕیار لەسەر ناکۆتا بدات، عەقڵ وێنای هەتایی ناکات(خوای گەورە سنووری بۆ نیەو عەقڵیش ناتوانێت بڕیاری لەسەر بدات) ئەگەر عەقڵ بتوانێت بڕیار لەسەر بێسنوور بدات ئیتر تەرازووی تێکدەچێو هاوسەنگی نامێنێ، جا عەقڵ تەنها لە مەسەلە ماددیەکاندا حوکمی پێ دەدرێت، ئیتر ئەوەی ئەودیو سروشتە واتە جیهانی غەیب (میتافیزیقیا) ئەوە عەقڵ هیچ توانای نیە حوکمی لەسەر بدات.

حەوتەم: ناکرێت نکوولّی بوونی شتانێ بکەین تەنها لەبەرئەوەی هەستەوەرەکانی ئێمە درکیان پێ ناکەن، خوای گەورە توانایەکی پێداوین کە دەتوانین بە هۆیەوە بگەین بەو ئاستەی کە هەستەوەرەکان پێی ناگەن، ئەویش هێزی خەیاڵە، زانایانی موسڵمان ئەمەیان وتووەو کانتی فەیلەسووفی ئەڵمانی لە کتێبەکەیدا (رەخنە لە عەقڵ) دوای هەشت سەد ساڵ لە غەزالی کە لە نووسینەکانیدا ئەوەی باسکردووە ئەم شتەی دووبارە کردووەتەوە، برجسۆن دەڵێت ئەندێشەی مرۆیی بە تەنها ناتوانێ لە راستیەکانی ژیان تێبگات.

هەوڵی فەلسەفە بۆ بە تەنها بەکارهێنانی عەقڵ لە تێگەیشتنی کەونو سروشتدا ئەرکێکە کە عەقڵ دەرەقەتی نایەت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سنووورداری عەقڵو شارەزانەبوونی بە هەموو زانستی خوا، ئەمەش وا دەکات بڕیاردانی لە ماهیەتی بەرژەوەندی راستەقینەی مرۆییدا ناتەواو بێت، ئیتر ئەگەر مەسەلەیەك هەبێت عەقڵێ بە چاکی بزانێت عەقڵێکی تر بە چاکی نازانێت.

بۆیە دەبینین مرۆڤایەتی کەوتۆتە گێژاوی بڕێ فەلسەفەی ناتەباوە، ئەمەش بەهۆی ناکۆکی عەقڵەکانو پێوانەیان لە دیاریکردنی ئاکاری تاكو کۆمەلایەتیدا.

نۆیەم: ئیسلام عەقڵی مرۆیی ئازاد کردووەو سنووورداری نەکردووە، بەڵکو بیروباوەڕی دروستی بۆ روونکردووەتەوەو رێی جووڵەشی لەگەڵدا دیاری کردووە تا هەڵە نەکات.

دەیەم: بیری رۆژئاوایی بە تەواوی ویژدانیە، دواتر بە تەواوەتی بوو بە عەقڵی، ئەمە سەرچاوەی بارگرژیەکەیە، سەرچاوەی رارایی رۆژئاواییش لە

جیاوازی نێوان زانستەکانی ماددەو زانستە مرۆییەکانەوە دەرکەوت، ئەمەش پێچەوانەی بنەڕەتی نێوان زانستو عەقڵە، تیایدا عەقڵ بە جۆرێ بەرزراگیراوە کە هەموو مەسەلەکانی رۆح و مەعنەویات تیایدا کوت کراون، ئیتر تەنها هەست بە هەستپێکراو دەکەن و ماددە وەك سەرچاوەی هێزو بەختەوەری دەبینن و بێئاگان لەوەی عەقڵ سنووردارەو ماددە هەموو شتێك نیە.

یانزەهەم: عەقڵی مرۆیی سەربەخۆیانە مرۆڤ ئاراستە بکات بارێکی دروست و پارێزراو نیە، ئیسلام عەقڵ دەخاتە چوارچێوەی رێنموونی خواوە کە سروش و شەرعی خواییەو پارێزەری عەقڵەو ناهێڵێت تووشی لادان یان هەڵە یان ئارەزووبازی مرۆیی و بیانووبۆهێنانەوەی بێت، رێ نادات ملکەچی ئارەزووەکان بێت.

ئەم بیرە رێگر نیە لە چێژوەرگرتنی ماددی، بەڵکو رێگرە لە بەرتەسك کردنەوەی مرۆڤ لە ماددەداو هەوڵ دەدات مرۆڤ چێژ لەو خۆشیانەی تر وەربگرێت کە ماددی نین و دەروونی مرۆیی تاسەیان دەکات، بۆیە ئیسلام هەردوو چێژەکەی لا گرنگەو ناهێڵێت تەنها گرنگی بە یەکێکیان بدرێت.

دوانزەهەم: گەورەترین هەڵەی عەقڵانیەتی رەها ئەوەیە کە سنووری خودی مرۆیی بە بەهای کۆتایی و لووتکەیەك دەزانێت کە مرۆڤ لە ژیاندا هەوڵی بۆ دەدات و نکووڵی دەکات لە هەرچی بەهای تر هەیە لە دەرەوەی بازنەی خودی تاك کە لە بازنەی خودێتی تر و خودێتی کۆمەڵگەو سنووری چوون بەرەو لای خوا و چێژی رۆژی دواییدا خۆی دەبینێتەوە، ئەوانەی کە بە بەها باڵاکان ناودەبرێن.

جا ئیسلام هەم بەها خودیەکان و هەم بەها فەردیەکانیش بەدیدێنێت، دواتر مرۆڤ رووەو ئاسۆیەکی فراوانتر دەبات بەرەو کۆمەڵو رووەو ئاخیرەت، ئەمەیەش چێژی ماددی دێنێتەدی، بەڵام هاوکات مرۆڤ ئاراستە دەکات بەرەو تەواوکردنی حەقیقەتی بوونی، ئەویش بە بەدیهێنانی چێژی مەعنەویەتی رۆحی، جا دیدی عەقڵانیەت لە خودی خۆیدا دیدێکی ماددیە، چونکە هەوڵدان لە ئاستی تاكو ماددەدا دەوەستێنێو رێ نادات مرۆڤ بەشی دووەمی پێکهاتەو بوونی بێنێتەدی کە ئەویش لایەنی رۆحیو مەعنەویە، ئیسلام بانگەواز بۆ ئەوە دەکات هەردووکیان بگریتەبەرو هاوسەنگی نێوانیان بپارێزێتو هیچکامیان زاڵ نەکەیت بەسەر ئەوی تریاندا.

سیانزەهەم: زاڵبوونی دیدی عەقڵی دەروونی مرۆیی لە چەقبەستوویی ماددەدا بەند دەکاتو رێ نادات بگاتە رۆحی ئیمانو گەشبینیو هیواخوازی، لەکاتێکدا تاکی موسڵمان بێهیوا نابێت لە خواو ژیانی خۆی لە واقیعدا بە تەنها ناباتە سەر، بەڵکو پێی وایە رەگەزێکی تری خوایی هەیە جیا لە چاوەڕوانی ماددی و عەقڵی کە توانای گۆڕینی واقیعی هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت (فإن مع العسر يسرا، إن مع العسر يسرا).

گرنگترین ئازادیەك کە عەقڵگەرایی رێی لێ دەگرێت بریتیە لە ئازادی هیوابوونو بێهیوانەبوون، عەقڵانیەت بەندیخانەیەکی گەورەو بازنەیەکی داخراوە، مۆرکی بێهیواییو رەشبینی لە بیرو ئەدەبی رۆژئاواییدا خۆی

دەنوێنیو سەرچاوەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێوانە عەقڵانیە ڕەهایانەی هیچ مەعنەویاتو ڕەحمێکی خوایان لەخۆنەگرتووە.

چواردەهەم: دیدی عەقڵانی مرۆڤایەتی لە خانەی خودگەراییو کەنارگیریدا بەرتەسك دەکاتەوەو ناهێڵێ رووەو ئاسۆی ڕەحمەتو بەخشش بکرێتەوەو تووشی دابڕان لە مرۆڤێتی گشتی دەکات، ئەمەش کەمتەرخەمیە بەرامبەر ئەو ئاسۆ گەورەی ئیسلامو ئایین بە گشتی پێشکەشی دەکات، ئەمەش دوای یەکبوونی مرۆییو سۆزداری و ئاسایشو ڕەحمەتو ئارامی دێت.

پانزەهەم: دیدی ئیسلامی دیدێکی مرۆییو روانینێکی تەواوەتیە نەوەك دیدێکی بەرتەسك لە تاکگەرایی یان ماددیگەری، بەڵکو ماددەو رۆحو تاکگەراییو کۆمەڵبوون پێکەوە کۆدەکاتەوە بێ ئەوەی هیچکام بەخششی دروستی خۆیان لەدەست بدەن.

شانزەهەم: ئیسلام عەقڵ لە هەموو دەسەڵاتێ ئازاد دەکات جگە لە دەسەڵاتی خوا، عەقڵ کە دروستکراوێکی خوایە دەبێت ملکەچی خوا بێت، ئیتر نابێت هاوشانی خوا بەشداری کاریگەری یان قەڵەمڕەو بێت، خوای گەورە بە بەخشش ئەوەی بەخشیوە بە مرۆڤ نەك بۆ ئەوەی مرۆڤ عەقڵ بپەرستێت، بەڵکو بۆ ئەوەی کەون بناسێتو ئەوەی پێویستە ئاشکرای بکات، لەو مەسەلانەشدا کە عەقڵ توانای نیە بیانزانێت دەبێت لە سایەی ئاییندا بیانزانێت، بۆیە عەقڵ پێناوە نەك ئامانج، پێناوێکە لە سنووری خۆیدا کار دەکاتو ناتوانێت سنووری خۆی تێپەڕێنێت.

عەقڵ توانای نیە بە تەنها رامێنێت، بەڵکو رووناکی چرایەکە تاریکی رووناك دەکاتەوە، بەڵام لەبەردەم رووناکی خوادا دەوەستێت، زانا موسڵمانەکان پێیان وایە مادەم عەقڵ رووناکی کزترە لە رووناکی خوا، ئیتر بۆچی رووناکی خوا نەبێتە رووناکی بەخش بۆی لە مەیدانی زانستو فەلسەفەداو رووناکی عەقڵیش بەدوایدا رێ بکات.

حەڤدەهەم: چەمكو واتای رەسەنی ئیسلامی توانیویەتی چەمکی ئیعتیزالو عەقلانیەت قوڵپ بکاتەوەو خراپی ئەو بیردۆزەیە بخاتەڕوو، چونکە عەقڵ تەنها لەرێی بیستنەوە واتە نەقڵی سروشیەوە دەتوانێت بەڵگە بهێنێتەوە، عەقڵ سنوورێکی هەیە کە لەو سنوورەدا دەوەستێت، لە مەسەلەکانی ئاییندا تەنها دەبێت لە رێی بیستنەوە شارەزایی هەبێت، ئەمەش بریتیە لە بڕوابوون بە غەیب، لەوانەش بڕوابوون بە خواو رۆژی دوایی و بەهەشتو دۆزەخ و صیراتو تەرازوو و زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتن، هەروەها بڕوابوون بە فریشتەکانو پێغەمبەرانو کتێبەکان.

موعتەزیلە کۆنو نوێکات خراپ لە ئیسلامی دروستو ساکادر لایانداو بەرامبەر بەرنامەی دروستی قورئانی هەنگاوی نارەوایان گرتەبەر، بێگومان دواجار ئامانجەکە بریتیە لە نکووڵی کردن لە بەدیهێنەرو سروشو پێغەمبەرایەتی.

مەترسیەکە لەوەدایە عەقڵ هەژموونی هەبێت بەسەر شەریعەتداو بە ئارەزووی سەردەم بڕیاری لەسەر بداتو بیانوو بهێنێتەوە بۆ باری لاڕێبووی کۆمەڵگەکان.

ئیسلام بەو جۆرە بەرنگاری واقیع نابێتەوە تا بیچەسپێنێ یان بیانووی بۆ بهێنێتەوە، بەڵکو بەرنگاربوونەوەی واقیعی لەوەدایە تا بە پێوانی خۆی بیپێوێتو ئەوەی دروستە بیهێڵێتەوەو ئەوەی نادروستە لەکاری بخاتو لە سایەی راستیە بنەڕەتیەکاندا واقیعێکی تر دابمەزرێنێ.

# بەشی دووەم

# زیندووکردنەوەی بیری صۆفیگەری فەلسەفی

تۆزی زەمانە کتێبەکانی تەصەوفی کۆنی داگرتبوو تا ئەوەی رۆژهەلاتناسان هاتنو سەرلەنوێ بۆ ئاژاوە نانەوە کەوتنە هەلگیرساندنەوەی ئاگری نیاکۆکی نێوان موسلمانان تا لەنێو ئەو شوێنەوارو بەجێماوە صۆفیگەراییانەدا ونبووی خۆیان بدۆزنەوە، بۆیە روویانکردە ئەو صۆفیگەرابیەو لە سایەی عەقلگەرایی مەسیحیو رێورەسمی رەهبانیەتەوە کەوتنە خوێندنەوەی باسوخواسی سۆفیگەراکانو نووسینەکانیان، ئیتر بە هەموو چەشنێ کەوتنە کۆکردنەوەی وتەی صۆفیەکانو بابەتەکانیان رێکدەخست تا ئاستێ دەکرێت بوتریت هەموو توێژینەوەکانی تەصەوفی نوێو نووسینەکانیان دەگەرێتەوە بۆ کاری ئەو رۆژهەلاتناسانەی کەر لە سەروو هەموویەوە گرنگییان دەدا بە بابەتەکانی تەصەوفو دیاریکردنی مەسەلە دیارەکانیو زۆر خۆراگر بوون بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیان کە بریتی بوو لە گومانخستنە بیروباوەری موسلمانانو بەرنگار بوونەوەی رێنماییە دروستەکانی ئیسلام، ئەمەش لەرێی تانەلێدانو بازارگەرمی بۆ ناراستیەکانی ناو تەصەوف، ئەمەیان لەپێناو مەسیحیەتو دەولەتە چاوچنۆکەکانیان کردو لەپێناو ئەوەدا خۆیان فێری زمانە رۆژهەلاتیەکان کرد.

## ئیسلامو تەصەوفی فەلسەفی

پیلانی دژ بە ئیسلام لە سەردەمی نوێدا ئامانج لێی زیندووکردنەوەی بیری تەصەوقی فەلسەفی بوو کە خۆی دەبینیەوە لە بیردۆزەکانی وەحدەتولوجود و حلوول و ئیتیحاد و فەناء و تەناسوخو ئیشراق، هەموو ئەمانە خزێنراونەتە نێو بیری رەسەنی ئیسلامیەوەو لە بیری فەلسەفی جولەکەییو مەسیحیو یۆنانیو مەجووسیو هیندیەوە وەرگیراوەو ئامانج لە زیندووکردنەوەی لەراندنو شەقکردنی چەمكو واتای یەکخواپەرستی رەسەنو دروستکردنی کەشێکی گومانو دوودڵیە لە دڵی باوەڕداراندا تا بنەڕەتەکانی بیروباوەڕیان بشێوێنن، ئەو بنەڕەتانەی کە لە قورئانەوە وەرگیراونو لەسەر بنەمای فیترەتی دوور لە ئاڵۆزیو پێچو پەنا دامەزراون.

بێگومان ئەو بانگەشەی زۆر جەخت دەکاتەوە لە زیندووکردنەوەی ئەو لایەنەی بیری تەصەوفی فەلسەفی کە لە سەردەمێکی دیاریکراودا کاریگەری نایەوەو دواتر دارماو تێکشکا، بێگومان کە رۆژهەڵاتناسی ئەو بیرە نوێ دەکاتەوە مەبەستو پیلانێکی خراپی لە پشتە، ئەویش لارێکردنی چەمكو واتای یەکخواپەرستی و رێکخەری نێوان عەقڵو دڵە، ئەو ئیسلامەی لەسەر بنەمای یەکخواپەرستی پوخت دامەزراوە، دەیانەوێت ئەمە بەرەو گومانی رەهبانیەت و دەرچوون لە ئەرکو بەرپرسیارێتیو خۆبەدەستەوەدان بە جەبریەت بەرن، بەمەش موسڵمان لە بواری ژیانی گشتی کەنار دەخەنو تەنها دەیبەنە مەیدانی رۆحیەتو تیایدا نغرۆی دەکەن، ئەمەش پیلانێکی دژ بە

ئیسلامه تا موسڵمان له چەمك‌و واتای ئیسلامەوه بەرەو چەمك‌و واتای پەرستش‌و صەفای رۆحی بەرن، تەصەوفی فەلسەفی بە واتای ئیتیحاد و حلوول و وەحدەتولوجود و فەنا و ئیشراق واته لاڕێکردن‌و وێرانکردنی ئیسلام‌و دەرکردنی له حەقیقەته ڕەسەن‌و کرۆکه پوختەکەی رووەو چەمك‌و واتای بتپەرستی‌و ئەو دەستەو تاقمانەی ئیسلام لەپێناو لەناوبردنیان هاتبوو ساختەو خراپەی ئەو رێچکانەی نیشاندابوو.

ژمارەیەك له رۆژهەلاتناسان خۆیان یەکلا کردووەتەوە بۆ ئەو جۆرەی بیری ئیسلامی، گرنگترینیان ماسنیۆن و جۆلدسیهەر و جب و برۆن و ماکدۆنالد و ماجلیۆس و نیکلسۆن و فۆن کریمەر، هەوڵی زۆر دراوە تا دوو رەوتی جیاواز دروست بکرێن، یەکێکیان ئەوەیە دەڵێت تەصەوفی فەلسەفی سەرچاوەکەی ئیسلامە، ئەوی تریش دەڵێت بەڵکو ئیسلامی نیە، رۆژهەڵاتناسان گرنگییان داوە بە توێژینەوە له دەسته لاڕێبووەکان، ماسینیۆن لەسەر تەصەوفی فەلسەفی و باتینیەت و فەرمەتی و نوصەیریەکان رۆیشتووەو گرنگی داوە بە دەستەی راڤەی باتینی و تەئویل، زیاتر له کەسانی تر گرنگی داوە بە مەسەلەی ئیتیحاد و حلوول و ئیشراق‌و وەحدەتولوجود.

ئەوان بە چەمکی سەرسامبوون بەو لادانانە دەیانەوێت خەڵکی له چەمك‌و واتای رەسەنی ئیسلامی لابدەن‌و پێیان وایە فیقهی ئیسلامی وشکەو ئەم چەمکی تەصەوفە رۆحێکی پڕ میهری بەخشیوە بە ئیسلام، ئەوان مەسەلەکانی تەصەوفیان له سایەی رەهبانیەتی مەسیحیەت‌و بە پێوەری بیرکاری هیندی

دەخستە بەرباس، هەندێکیان مەسیحیەت دەکاتە بنەڕەتی صۆفیگەرایی لای موسڵمانانو لەمەشدا مەبەستیان شاردنەوەی شانو شکۆی چەمكو واتای رەسەنی ئیسلامەو بانگەشە کردنە بۆ ئەوەی ئەمەش یەکێکە لە چەمكو واتاکان، ئینجا برێ گومانی پڕ مەترسی دەخەنەڕوو و مەبەستیان شێواندنی ئیسلامە.

نووسەرانێ کە سەر بە بزووتنەوەی رۆژئاواگەرین لەپشت پلانی رۆژهەڵاتناسیەوە رێ دەکەنو زۆر لەسەری دەرۆنو گرنگی دەدەن بە زیندووکردنەوەی ئەو دەستە لادەرانەی کە هەنو بازاڕگەرمییان بۆ دەکەن، لوتفی جومعە چەندین نووسینی لەو بوارەدا نووسیوە، هەروەك تۆفیق دیاب سەبارەت بە تەناسوخولئەرواح نووسینی هەیە، کۆمەڵەی سیۆصۆفیش بازاڕگەرمی دەکەن بۆ ئەو چەمكو واتایانە.

موحەممەد تۆفق دیاب هەوڵ دەدات بڵێت بەهەشتو سزای رۆژی دوایی تەنها مەعنەویە، یەکێك لە زانیان بەرنگاری بووەتەوەو بە تەواوی بیرۆکەکەی تێکشکاندووەو بە بەڵگەی قورئانی دەیسەلمێنێت کە بەهەشتو سزای رۆژی دوایی هەستپێکراو و مەعنەویشن.

بەردەوام مەسەلەکانی تەصەوف فەلسەفی لە بیری ئیسلامیدا نەوە دوای نەوە نوێ دەکرێنەوەو لە زانکۆکاندا بواری تایبەت بە توێژینەوەیان دانراوە تا دڵی گەنجانی بۆ بوروژێننو و گومانی تێدا جێبهێڵنو لەژێر ناوی زانستە فەلسەفیەکاندا ساختەکاری ئەنجام بدەن.

بێگومان ئەم هاندانەی ڕۆژئاوایی و شاڵاوی ڕۆشنبیریو ڕۆژئاواگەریە بۆ تەصەوفی فەلسەفی لە وڵاتی موسڵماناندا کە کتێبی لەسەر دەنووسنو نووسینی پڕ لە ژەهری لەبارەوە بڵاو دەکەنەوە بەتایبەت نووسینەکانی حەلاج و ئیبن فارز و ئیبن عەرەبی، ئەمە ئامانجێکی قووڵی لەپشتەوەیە.

چونکە بێگومان ئەمەیە چەمکو واتای ڕەسەنی ئیسلامی دەشێوێنێتو مۆرکە ڕاستەقینەکەی خۆی دەگۆڕێتو بنەماکانی وێران دەکات، بەتایبەت چەمکو واتای جیهادو قوربانیدانو خۆبەخت کردنو ویستی بەهێزی ئازادی دژ بە ڕێگری لە ئازادی و مافەکان.

ئە ورێبازە صۆفیگەریە فەلسەفیانە هەوڵ دەدەن دیارترین چەمکو واتاکانی یەکخواپەرستی پوخت لە ناخی تاکی موسڵماندا لەناوببەن، ئەمەش بە بانگەوازکردن بۆ زوهدێکی نارەوا کە لە مەسیحیەتەوە وەرگیراوە، یان بە پاڵدانەوە بە لایەنە ڕۆحیە پوختەکانەو کەنارگرتن لەو ڕۆحیەتەی کە هەریەك لە ماددەو ڕۆح پێکەوە کۆدەکاتەوە، ئیسلام بڕوای بەو قەناعەتە نیە کە دەڵێت خوا لە جەستەی مرۆڤدا تواوەتەوە یان بڕوای بە فەنابوونی زاتی مرۆیی لەناو زاتی خواییدا نیە، ئیسلام بانگەشە ناکات بۆ ڕەهبانیەت یان کەنارگرتن لە ژیان، بەڵکو ڕاشکاوانە ڕێ نادات ژیانو کۆمەڵگە لێك جیابکرێتەوە، بەڵکو بانگەوازەکەی بۆ کارکردنو پەرستشو چاودێری خواییە لە کارو پەرستشدا.

لە ئیسلام دەستەی باتینی و دەستەی ڕووکەشی نیە، بەڵکو هەردوو دەستەکە لە یەکدا کۆدەبێتەوە، هەم فیقهو هەم ڕەوشت پێکەوە

کۆدەکرێنەوە، ئیتر فیقهێکی وشکو تەصەوفێکی نەرمونیان بوونی نیە، هەموو ئەمانە برێ چەمکی رۆژئاوایی‌و مەسیحین کە رۆژهەڵاتناسان لە ئایین‌و رۆشنبیریەکانی خۆیانەوە وەریانگرتووەو وەك ژەهر رشتوویانەتە نێو ئاسۆی بیری ئیسلامیەوە تا کەسانی سادەو ساکاری پێ لەخشتە بەرن، ئەوانەی هێشتا جوان لە ئیسلامی دروست تێنەگەیشتون، قورئان وشەی زوهدی وەك ئاییندارى باس نەکردووە، بۆیە ئیسلام نکووڵی دەکات لەو لادان‌و شەتەحات‌و ناروونیەی کە هەیە، هەروەك نکووڵی دەەکات لەو تەئویلاتەی کە پیاوانی تەصەوف فەلسەفی دەیسازێنن بۆ دەقە قورئانیەکان، چونکە ئەو تەئویلاتانە لە دەرەوەی چەمكو واتای رەسەنی ئیسلامیەوەن.

ئەوەی لە کتێبی تەوواسینی حەلاج و فصوصولحیکەم‌و کتێبەکانی تری ئیبن عەرەبی یان سەهرەوەردی یان شعیرەکانی ئیبنولفارزدا هاتووە لە دیدی ئیسلامەوە شتێکی رەسەن نیە.

بێگومان زۆری ژمارەی ئەو هەموو رۆژهەڵاتناسانەی تاویان داوەتە مەیدانی تەصەوفو خۆ سەرقاڵکردنی هەندێکیان بە تاکە کەسایەتیەکەوە تا ئاستێ کەسی وەك لویس ماسینیۆن ماوەی چل ساڵی تەمەنی خۆی سەرقاڵ بکات بە حەلاجەوە، بۆ ئەوەیە تا ئەو مەبەستە ژەهراویە کوشندەی هەیە بیخاتەڕوو، ئەوەی نیکلسۆن‌و ماسینیۆن دەیڵێن کە صۆفیگەرا موسڵمانەکان هەندێ لە بیردۆزەو رێنماییەکانی خۆیان لە مەسیحیەتەوە وەرگرتووە وەك دیدی خۆشەویستی خوایی یان هەندێکیان لە رۆشنبیری یۆنانی ئەفلاتۆنیەوە

وەرگرتووە وەك دیدی ئیشراقو مەعریفەو حبوور، یان ئەوەی برۆنو جۆلد یەمەر و کەسانی تر دەیلێن کە صۆفیگەرایی موسڵمانان کاریگەر بووە بە بوزاییو هیندیو لە دیدو مەسەلەی فەنادا زۆر پێی کاریگەر بوون، هەموو ئەمانە دروستن، چونکە ئیسلام لە چەمكو واتای دروستی خۆیو بانگەوازی یەکخواپەرستیو فیترەتیدا لەگەڵ ئەو جۆرە گومانە ئاڵۆزانە ناگونجێتو دانیان پێدا نانێت.

سەرچاوەکانی تەصەوف فەلسەفی بریتین لە: فەلسەفەی ئیغریقی و ئایینە هیندیەکان و فەلسەفەی فارسی و بووزی و لاهووتی مەسیحی:

یەکەم: ئەو دیدەی فەلسەفەی یۆنانی کە بڕوای هەیە بە وەحدەتولوجودو خوای گەورە و دروستکراوەکانی لەیەك جیا ناکاتەوەو پێی وایە هەموو بوون بریتیە لە خوا، ئەم دیدە دزەی کردە ناو تەصەوفەوە.

دووەم: چەمكو واتای فەلسەفەی هیندی و هیندۆکی سەبارەت بە تەناسوخ دزەی کردە ناو تەصەوفەوە، ئەو دیدەی کە دەیتوت یەك نەفس چەند جار دێتەوە ناو ژیانو لە دیدی ئواندا ئامانج لەو تەناسوخە ئەوەیە چەند جارێ دەرفەت بدرێت بە نەفس تا خۆی پاك بکاتەوە، هەروەك چەمكو واتای فەنا کە بریتیە لە نەرڤانا و لای ئەوان باری لەدەستدانی هەستەو تیایدا دەروون هەستکردن بە ئازاری جەستەیی نامێنێ، ئەمەش دزەی کردە ناو تەصەوفەوە، زەرڤانا بوونێکی ئیجابی نیە، بەڵکو خۆرزگارکردنە لەو بوونە بە ئازارەی هەیە تا بیباتە باری بەختەوەری و خۆشگوزەرانی.

سێیەم: ئازاردانی دەروونو وازهێنان لە هەوڵدان لە ژیاندا دزەی کردە ناو تەصەوفی فەلسەفیەوە، هەروەك چەمكو واتای حلوولیش هەر لە مەسیحیەتەوە وەرگیراوە.

چوارەم: هەروەك لە فەلسەفەی یۆنانیەوە تەئویلی فەلسەفی دزەی کردە ناو تەصەوفی فەلسەفیەوەن هەریەك لە حلوول و ئیتیحادو تەناسوخیش وەرگیراوی تەصەوفی هیندی بوون، هەروەك بەزاندی جەستە بە خۆماندووکردنو دوورگرتن لە وەچە نەنانەوە وەرگیراوی مەسیحیەت بوو.

بێگومان تەصەوفی فەلسەفی بە هیچ جۆرێك لەگەڵ چەمكو واتای رەسەنی ئیسلامیدا ناگونجێت، ئەوەی حەلاج و ئیبن عەرەبی و سەهرەوەردی و ئیبنولفارز و ئیبن سەبعین دەیڵێن، کاریگەر بوونە بە ئەفلاتۆنیەتی نوێ و ئەو دیدانەی ئیخوانوصەفا کە لە دیدی ئیغریقی و مەسیحیەتو فارسیەوە وەریانگرت لەوانەش رێبازی مانەوی و زەردەشتی و فەلسەفەی فیلۆنی جوولەکەیی و فەلسەفەی رەواقیەکان.

حەلاج بانگەواز دەکات بۆ حلوولو ئیتیحاد، دوای ئەو ئیبن عەرەبی هاتو بانگەوازی دەکرد بۆ وەحدەتولوجود، سەهرەوەردی بانگەوازی دەکرد بۆ ئیشراق، بێگومان بیرۆکەی حلوول و ئیتیحادو وەحدەتولوجودو ئیشراقیش نامۆن بە ئیسلام.

دیارترین چەمکەکانی ئەم فەلسەفانە بریتین لە: تەجەلی و صدوور و ئیشراقو وەحدەتولوجود و ئیتیحادو حلوول و فەنا، هەموو ئەمانەش

وەرگیراوی فەلسەفەی جوولەکەیی و مەسیحیو ئیغریقیو فارسیو هیندینو خزێنراونەتە نێو بیری ئیسلامیەوە.

ئیبن عەرەبی بانگەوازی دەکرد بۆ یەکبوونی بوونو یەکبوونی ئایینەکان، ئەمەشی لە بنەڕەتی دیدی حەلاجەوە وەرگرتبوو، ئیبنولفارزیش بانگەوازی دەکرد بۆ ئیتیحاد، ئیبن عەرەبیو ئیبنولفارز بڕوای وەحدەتولوجودیان هەبوو کە ئیسلام بەرپەچی دەداتەوە، ئەو بڕوایەش ئەوەیە کە دەڵێت خوا و جیهان یەك شتە، سەهرەوەردیش بانگەوازی دەکرد بۆ ئیشراق.

ئیبن تەیمیە رەخنە دەگرێت لە هەریەك لە ئیبنولفارز و ئیبن عەرەبیو ئیبن سەبعینو حەلاجو ساختەکانی ئەوانە ئاشکرا دەکاتو پێی وایە ئەوانە شتێکی نوێیان هێناوەتە ناو ئیسلامەوە کە لەگەڵ فەرمایشتی خواو فەرموودەی پێغەمبەری و وتەی هاوەڵانیدا ناگونجێت.

بیری باتینی لەنێو هەریەك لە شیعەگەری و صۆفیگەریدا جێی خۆی کردەوە، هەروەك هەریەك لە لاهووتی مەسیحی و فەلسەفەو مەنتیقی ئیغریقیو فەلسەفەی ئیشراقی وەرگیراو لە بیروباوەڕی ئاسیاییو فەلسەفەی حلوولی وەرگیراو لە فەلسەفەی هیلینیستی جێی خۆیان کردەوە.

بێگومان داڕشتنەوەی ئەو چەمکانە لە سەردەمی نوێدا ئامانج لێی لاوازکردنی چەمكو واتای رەسەنی ئیسلامو گومان نانەوەو پەرتکردنی یەکبوونی چەمكو واتای رەسەنی سوننیە.

## یەکەم: وەحدەتولوجود:

یەکێك لە مەترسیدارترین ئەو ڕێچکانەی کە ڕۆژهەڵاتناسی لەناو تەصەوفی فەلسەفیدا زیندووی دەکاتەوە بریتیە لە ڕێبازی وەحدەتولوجود، ئەمەش ڕێبازێکی هیندی بەرهەمی بوو، بنەڕەتی ئەمانەش وەرگیراون لە کتێبە ئایینیەکانی هیندیو بیری فەلسەفییانەوە، ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئەو پەیامەی ئیسلامە کە خواو بەدیهێنراوەکانی لەیەك جیا دەکاتەوە، بەڵام چەمکی وەحدەتولوجود بەدیهێنراوەکان بە خوا دادەنێتو هەموو بوون بە خوا دەزانێت، ئەمە نهێنی ئەو گرنگیدانەی ڕۆژهەڵاتناسانە بە هەریەك لە ئیبن عەرەبی و حەلاج.

ئیسلام بە تەواوەتی خوا و جیهان لەیەك جیا دەکاتەوە، ئەمەش پەیامی فیترەتی پاکی مرۆییو عەقڵی ساغە، هەم سروشتو هەم عەقڵ ڕازی نابن بەو دیدەی خواو بوون بە یەك بزانێت، ئەم دیدە ڕێ نادات لەسەر بنەڕەتێکی پتەو ڕەوشت دامەزرێو ڕێگرە لە بەردەم بەرپرسیارێتیو پاداشتدا.

بیردۆزەی وەحدەتولوجود سەرچاوەیەکی ڕەسەنی نیە، لەناو عەرەبو خاوەن ئایینە ئاسمانیەکانیشدا نەبووە، بەڵکو بیرۆکەیەکە کە لەناو فەلسەفە مرۆییەکانو ئەو کەسە ئارەزووبازانەدا هەبووە کە هەوڵیان دەدا مرۆڤ لە سەختی کارو بەرپرسیارێتی ئەخلاقی دەربزا بکەن تا بە ئارەزووی خۆی هەنگاو بنێ، ئیتر چاكو خراپو تەقوا و خراپەکاری و زوهد و دنیاپەرستیو بەرزی و پەستی لێك جیاناکاتەوە، بەڵکو لە بنەڕەتدا نکووڵی کردنە لە بوونی خوا.

پەیامی ئیسلام پەیامی رەسەنایەتیە، خوای گەورە واجبولوجوودەو دوورە لەوەی لەگەڵ بەدیهێنراوەکانی یکبخرێت یان تیایدا بتوێتەوە، کەون شتێکی جیایە لە خوا و جیهان جیایە لە خوا، خوای گەورە هەموو بوونی بەدیهێناوەو رایسپاردن‌و پاداشت‌و سزای دانا بۆ ئەرکەکان، بۆ ئەمەش کتێبی دابەزاندو پێغەمبەرانی نارد، جا پەیامی وەحدەتولوجود نکوولّی کردنە لە خوا و تەنها سەلماندنی کائیناتە، مامۆستا موحەممەد غەزالی دەڵێت وەحدەتولوجود ناونیشانێکی تری ملهوڕیە بەرامبەر بە مەسەلی بوونی خواو تەنها بڕوای بە ماددە هەیە، ئیتر بڕوای بە شتێ نیە لەودیو جیهانەوە، جا ئەوەی خوا ە ناو بازنەی جیهاندا دادەنێت وێنەیەکی ترە بۆ نکوولّی کردن لە خوا.

ئەگەر زەوی مرواری و مەرجان بوایە شیاوی ئەوە نەبوو زاتی خوا بێت، مووشەك جیایە لە مرۆڤ کە دروستی کردووە، جیهانیش جیایە لەو پەروەردگارەی کە بەدیهێناوەو بەڕێوەی دەبات، خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو شتێکەو بەسەر هەموو شتێکدا زاڵەو هەموو ئاسمانەکان‌و زەمینی بەدەستە.

مامۆستا عەبدولمونعیم خەلاف دەڵێت رێبازی وەحدەتولوجود هێرشی بردووەتە سەر بیروباوەڕی هەندێ لەو فەیلەسووف‌و صۆفیانەی کە نەگبەتییان لەوەدا بوو داوایان دەکرد لەرێی هەستەوەرەکانەوە بگەن بە خواو ئەودیو سروشت، دەیانویست بەو هەستەوەرانەی کە سروشتی پێ درك دەکەن‌و بە عەقڵی دروستکراوی مرۆیی کە بۆ درك کردن بە کائیناتی سروشتی بەکاری دێنن

درك بكەن بە خوا، جا كە نەیانتوانی خوا ببینن‌و بەو جۆرەی دەیانویست دركی پیّ بكەن، وتیان دەی هەر دەبیّت خوا هەمان بوونە رووكەشە بیّت كە هەیەو تیایدا تواوەتەوەو بوونیّكی جیا لە بوون‌و جیهانی نیە، بەوجۆرە ئەو بتپەرستیەی كە ئایین‌و فەلسەفەكان دژایەتییان دەكرد لەم فەلسەفەیەوە پالّپشتیّكی گەورەی دەستكەوت.

پیّغەمبەری خوا(ﷺ) لەم بوارەدا ریّنموونیان دەكات‌و دەفەرمویّت (بیر بكەنەوە لە بەدیهیّنراوەكانی خوا، بەلاّم بیر مەكەنەوە لە زاتی خوا، ئەگەرنا بە هیلاكەتا دەچن).

هەلّەی وەحدەتولوجود ئەوەیە كە دەلّیّت هەموو خوایەو خواش هەمووە، راستیەكەی ئەوەیە كە هەموو هی خوایە، خوای گەورە تاكە راستەقینەی پشت ئەم جیهانەیە، راستەقینەیەكی بیّكۆتایی، خوای گەورە تیّكەلّ بە جیهان نابیّت‌و جیهانیش تیّكەلّی نابیّ‌و لە ماددەشدا تیّكەلّئالاو نابیّ، بۆیە هەوادارانی وەحدەتولوجود كە دەلّیّن خواو ماددە یەكەیەكی لیّك جیانەبووەن، دەرچوونە لە چەمك‌و واتای دروستی ئیسلام، ئەم دیدە دەلّیّت هەموو جیّهۆكاریّ دەبیّت هۆكاریّكی هەبیّت و هەموو مەعلوولیّ دەبیّت عیللەیەكی هەبیّت، جیّهۆكار لە خۆیەوە نایەتەدی بەلّكو دەبیّت هۆكاری هەبیّت، مەعلوولیش هەروا لە خۆوە نایەتەبوون، بەلّكو دەبیّت عیللەیەكی هەبیّت، جا ئەگەر هۆكار یان عیللەكە نەما ئەوە جیّهۆكار یان مەعلوولەكە نامیّنیّت.

خوای گەورە دێرینو یەکەمو کۆتایشە، خوا بەدینەهاتووە وەك ئەوەی مەعلوولیّ بێت، ماددە مەعلوولەو بەدیهاتووەو بەدیهێنەرێکی هەیە، جا ئەگەر باسی پێشینەبوونی ماددە بکرێت ئەوە ماددە دەکرێتە هاوبەشی خوا لە پێشینە بووندا.

موسڵمانان بڕوایان هەیە بە دوانەیی بوون کە ئەویش ئەوەیە بوون هەیەو جیایە لە خوا و خوای گەورەش زاتێکی جیا لە بوونی ماددیە، هەموو بوون بە هەموو جووڵەو بوارێکیەوە بە دەست خوایەو بەردەوام خوا ئاداگاریەتی، ئەگەر خوا وازی لیچ بهێنێت ئەوە بوون نامێنیّ، واتە ئیسلام دان نانێت بە بڕوای وەحدەتولوجوددا و خوای گەورە خاوەنی هەموو ئەو بوونانەیە.

ئیبن عەرەبی کە زۆر کاریگەرە بە بیردۆزەی ئەفۆتینو حەلاج لە مەسەلەی لاهووت و ناسووتدا، بانگەشەکەری ئەم رێچکەیە، هەرچیەك بگەڕێتەوە سەر وەحدەتولوجو یان حلوول، ئەوە هیچ پەیوەندیەکی نیە بە چەمكو واتای رەسەنی ئیسلامیەوە، لە سەدەمی پێشینی صالّحدا نەبووەو گەورە زانا سۆفیەکانیش ئەوەیان نەوتووە، بەڵکو دەکرێت ئەو بڕوایە کەسەکە لە بیروباوەڕی ئیسلام بباتە دەرەوە.

روانین لە تەصەوف بەم واتایە وەك دکتۆر موحەممەدی بەهی دەیڵێت رێیەکی نەگبەتیە بۆ زۆربەی موسڵمانانو رێدانە بە هەر نارەواییەك کە مرۆڤ بەرەو ئارەزووبازی ببات، ئەمەش لە ژێر پەردەی بیروباوەرش یان ملهوڕیەك کە

مەبەستی لەناوبردنی ئیسلام بێت لە رێی گومان نانەوە یان کەسی موعەتتەلی کە هەوڵ دەدات تاك لە ئەركی دیاریكراوی ناو قورئانو سوننەت كەنار بخات.

كەسێتی ئیبن عەرەبی یەكسانە بە وەحدەتولوجود

ئیبن عەرەبی لە هەموان بوێرانەتر قسەی كردو گەمەكردنی بە وشەكان دیارترین هەنگاوی ئسلوبە مەجازیەكەی بوو كە زۆر كەسی پێ هەڵخەڵەتاند، نهێنی ئەمەش ترسی بوو لە كوژرانو سووربوونی بوو لەسەر شێواندنی بیروباوەڕ، زۆر كەس پێی هەڵخەڵەتان، كتێبی (الفتوحات المكیه) و (فصوص الحكم) ی لە مەترسیدارترین كتێبەكانی ئەو كەسێتیەن، ئیبن عەرەبی دیدی وەحدەتولوجودی لە تێكەڵەی غەنووصیەتو ئەفلاتۆنی نویچو مەسیحیەتەوە وەرگرتووە.

ئەم بیرۆكەی وەحدەتولوجودە شەپۆلێكی ململانێی هزری توندی نایەوەو كەسانی هەڵگری رەسەنایەتی ئیسلامی چ لە فەرموودەناسانو چ لە فیقهناسانو موفەسیرین و صۆفیەكانیش ئەمەیان بە بیروباوەڕێكی پێچەوانەی بیروباوەڕی ئیسلام داناو دەیانوت بە هیچ جۆرێك لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا ناگونجێت، ئەسین باسیۆس كتێبەكەی خۆی سەبارەت بە ئیبن عەرەبی ناونا (مفكر الاسلام المتنصر)، بێگومان ئیبن عەرەبیئسلوبی وێناكردنی سۆزداری و هێما و پشتبەستن بە خەیاڵاتی لە دەربڕیندا كردە رێیەكی پاككراوەو دوور لە مەترسی تا لەوێوە ژەهری خۆی بڕژێت، ئیتر لەنێوان راوبۆچوونە ژەهراویەكانیو راوبۆچوونی ئەهلی سوننەدا ئەمبەرو ئەوبەری بوو تا ئەگەر

دادگایی کرا یان ساختەی وتەکانی دەرکەوت بیانوویەکی بە دەستەوە بێت، ئەمەشدا لە حەلاج فێڵبازتر بوو.

دکتۆر موحەممەد یووسف مووسا دەڵێت موحیەدین ئیبن عەرەبی لە تەصەوفە فەلسەفیەکەیدا بە هیچ جۆرێك صۆفیەکی موسڵمان نەبوو، بەڵکو ئیبن سینا لە فەلسەفەدا چۆن بوو ەویش لە تەصەوفدا ئاوا بوو، چونکە ئیبن سینا لە هیچ شتێکدا وێنای ئیسلامی نەدەکرد، بەڵکو درێژەپێدەری فەلسەفەی یۆنانی بوو، موحیەدین ئیبن عەرەبیش صۆفیەکی موسڵمان نەبوو، بەڵکو فەیلەسووفێ بوو کە هیچ نوێچنەرایەتی ئیسلامی نەدەکردو خێرا تەصەوفەکەی دەچووە قاڵبی رێبازێکی فەلسەفی پێچەوانە بە ئیسلامو هەموو ئایینێك، ئەو پیاوێکی ئایینیو کەسێکی خاوەن زوهد نەبوو، تەصەوفیشی نەگرتبوویەبەر، بەڵکو فەیلەسووفێکی غەنووصی سەرکەوتووو رێکخەرو گونجێنەر بوو، وێنەی ئەفلۆتینو فیلۆن بوو و غەلسەفە نەزەریو ئەخلاقیەکەی تەواو لە دینەوە دوور بوو:

یەکەم: مەسەلەی وەحدەتولوجود کە هەموو جیهانی بە دەرخەر و نیشاندەری خوا نیشان دەدا و پێی وابوو هەموو بوون خوایە، ئیتر واتایەکی بۆ ئەو بەرپرسیارێتیە ئەخلاقیە نەدەهێشتەوە کە پێوەری پاداشت و سزایە، چونکە کەسی تاوانبار لە رووی ئەخلاقیەوە دەڵێت کەسێك کە منی کردووە بە رووکەشێ بۆ خۆی هەر ئەوە خۆی ئەو شتەی کردووەو دەبێت چیم پێ بکات، ئیتر بۆ من بەرپرسیار بم؟

دووەم: ئیبن عەرەبی وا نیشان دەدات نایەوێت لە مەسەلەی ئەخلاقدا ڕێچکەکەی تا ئەو ئاستە بڕوات، پێی وایە ئەوەی دەگاتە پلەی خۆشەویستی حەق ئیتر بۆی ڕەوایە سنووری دیاریکراو ببەزێنێت، ئەمەش دوای ئەوەی پێشتر ماوەیەکی زۆر ئەو سنوورەی نەبەزاندووە، بێگومان ئیبن عەرەبی بەم دوو ڕوانینەی سنووری خوا و ڕەسەنایەتی ئیسلامی بەزاندووە، ئەمەش مەترسیدارترین بواری بانگەوازەکەیەتی کە ئەویش بریتیە لەوەی ڕووکەشی شەرعی خوا پشکی خەڵکی گشتی بێت، لەبەرئەوەی ئەهلی تەصەوف باتینێکی تایبەتیان هەیە بۆیە سنووری تایبەتیان بۆ هەیە، لەمەشدا ئەو ئسلوبی تەئویلە دەگرێتەبەر کە باتینیەکان دایانهێنا.

## دووەم: حلوول و ئیتیحاد:

صۆفیەکان بیرۆکەی حلوول‌و ئیتیحادیان لە مەسیحیەتەوە وەرگرت، ئەویش لە هیندۆکیەوە وەریگرت، ئەمە لایەنێکی گەورەی ڕێنماییەکانی مەسیحی گرتووەتەیە-بە وتەی بیرۆنی سەرچاوەکەی هیندیە- ماکس مۆلەر دەڵێت لێکچوونێك لە نێوان ئایینی مەسیحی‌و ئایینی بووزی لە چەند روانگەیەکەوە بەدیدەکرێت بەتایبەت سەبارەت بە حلوول(توانەوە) و تەجەسود (شێوە پێدان)، سیۆپۆفیای نوێیش بیردۆزەی حلوولی لە مەسیحیەتەوە وەرگرتووە، نزیکیەکی بەهێز هەیە لەنێوان تەصەوفی هیندی‌و مەسیحیەتی سیانەخواییدا، ئەم دیدە دزەی کردووەتە ناو تەپەوفی فەلسەفیەوە، لەلایەن ئیسماعیلیەکانەوە کە بانگەوازیان دەکرد بۆ حلوول و خوایی بوونی پێشەواکان، بۆیە صۆفیەکانیش ئەو دیدەیان لێ وەرگرتون بۆ پێشەوا کە لای ئەوان بە قوتب ناسراوە.

حەلاج بڕوای حلوولی مەسیحیەتی هەبوو و چەمك‌و دەستەواژەکانی بەکاردەهێنا، بەمەش چەمکی پێچەوانەو نەگونجاو لەگەڵ یەکخواپەرستی پوختی دەهێنایە ناو ئیسلامەوە.

موحیەدین ئیبن عەرەبیش بیردۆزەی حلوولی لەوەوە وەرگت وەك چۆن ئەو لە مەسیحیەتی کاریگەر بوو بە بووزیەت وەریگرتبوو، هەروەك ئیبن عەرەبی بیرۆکەی سیانەخوایی گرتەبەر و بڕێ وشەو حەقیقەتی موحەممەدی بەکاردەهێنا کە هەموویان چەمك‌و واتای وەرگیراو لە فەلسەفەی مەسیحی بوون.

ئاسین بلاسیۆس لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە ئیبن عەرەبی ئاماژەی داوە بە کاریگەری نەصرانیەت لەسەر دیدی ئیبن عەرەبیو دەڵێت ئەو بنەڕەتە مەسیحیە هەندێ جار هەندێ بیری بیانی لەگەل خۆی دەبرد کە پێشتر لەبەر دراوسێیەتی مشتومڕی نێوانیان پێیان کاریگەر بووبوو، ئیبن عەرەبیش بێ ئەوەی پاکتاوێکیان بکاتو ئاگاداری بنەڕەتەکە بێت هەموو وەرگرت، بۆیە صۆفیگەراییەکەی لەسەروو رۆحانیەتی مەسیحیەوە هەندێ هەنگاوی دەگرتەبەر کە گەڕانەوە بوو بۆ ئەفلاتۆنیەتی نوێی ئەسکەندەریو بیردۆزەکانی قنووص و ئەو تێکەڵیە شێواوەی هەیبوو و مەزدەکیەتی فارسی و بەڵکو تەنانەت بووزیەتی هیندی.

بێگومان ئەمەش ئیبن بە تەواوەتی عەرەبی لە بازنەی دیدو روانینی رەسەنی ئیسلامی دەکردە دەرەوە.

رۆژهەڵاتناسان زۆر لەسەر بیرۆکەی حلوول و فەنا و خۆشەویستی خوایی وەستاونەتەوە تا بەو ئامانجەی خۆیان بگەن، ئەوان پێیان وایە ئەو چەمکانە دەتوانن موسڵمانان لە حەقیقەتی دینەکەیاو یەکخواپەرستی پوختو جیهادی رێی خوا دەربکەن، چونکە بڕوابوون بە حلوول هەموو ئەرکەکان لەکار دەخات، لەو نێوەندەشدا جیهاد پەك دەخات، چەمکی خۆشەویستی خوایی کە خۆشەویستی فەنابوونە، وا دەکات لە بانگەشەکەرانی پابەندی ئەو یەکبوونەی کۆمەڵی ئیسلامیە نەبن کە ئیسلام بانگەشەی بۆ دەکات، بەڵکو بە تەواوەتی

پێچەوانەی بیرۆکەی جیهادی ڕێی خواش دەوەستێتەوە، هەروەك دژی بنەمای هاوسەرگیری و پێکهێنانی خێزانیش دەوەستێتەوە.

ڕۆژهەڵاتناسان چاك دەزانن چەندە گرنگە ئەو بیروبۆچوونانە بڵاو بکەنەوە، چونکە بیرۆکەی ئیتیحاد خۆی لە خۆیدا پەکخستنی حوکمەکانی شەرعە، پەیامی ئیسلام سەبارەت بە تەنهایی خوا و پاکڕاگرتنی لە هاوبەش بۆ دانانو سیفەتەکانی هەڵدەوەشێنێت، لەبەرئەوەی شوێن بیرۆکەی تەناسوخیش دەکەوێت، بۆیە خوای گەورە دەکاتە بوونەوەرێکی جێگۆڕکێ کەر، ئەمەش لەگەڵ سیفەتەکانی خوادا ناگونجێت، هەروەها ڕۆژهەڵاتناسی بە بانگەواز کردن بۆ ئیتیحاد و حلوول هەوڵ دەدات بازاڕگەرمی بکات بۆ ئەو بیرۆکەی مەسیحیەت کە عیسا پێغەمبەر بە خوا دادەنێت، بانگەواز بۆ شتێ کە لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێت کە ئەویش پێککەیشتنی خوایەتی و مرۆیی یان پێککەیشتنی خوایەتی و پێغەمبەرایەتیە لە یەك کەسدا، ئەمەش ئاواتو گەورەترین ئامانجی ڕێبەرانی پیلانی دژ بە ئیسلامە.

ڕێبازی حلوول پێچەوانەی پەیامی ئیسلامو ئایینی حەقی خواییە، چونکە حلوول پێی وایە خواو جیهان تێکەڵ بە یەك بونو خواو هێزە کارا نێوخۆییەکانی جیهان هاوواتای یەکن، ئەمەش بە ڕێچکەی یەکبوونی نێوان خواو جیهان ناسراوە، بەلام ئایینی حەقی خوایی پێی وایە خواو جیهان و بەدیهێنەر و بەدیهێنراو و ڕۆحو مادده لەیەك جیان نەك یەك بن، بەڵکو ئیسلام دان نانێت بەو یەکبوونەی کە دەڵێت خواو جیهانو ماددەو ڕۆحو بەدیهێنەر و بەدیهێنراو یەکێکن.

موسڵمانان ئەو وتەی ئیبن عەرەبییان بەرپەرچ داوەتەوە کە دەڵێت زاتی خواو زاتی خۆی بوونەتە یەك زاتو دیمەنە جیاوازەکانی جیهان هەموویان دیمەنی خوان، واتە خوا تەنها ئەو بوونەی هەیە کە لەنێو بەدیهێنراوەکاندا بەدی دەکرێت، بەڵکو موسڵمانان بڕوایان وایە خوای گەورە بەدیهێنەرو خاوەنی هەموو شتێکە، بەلام خۆی بەشێك نیە لەو شتانە، بۆیە ئیسلام بە هیچ شێوەیەك دان نانێت بە توانەوەی خوا لە جەستەی مرۆڤ یان هەر شتێکی تردا.

ئەوەی ئیبن عەرەبی دەیڵێت چەمكو پەیامێکی نامۆ بە ئیسلامو بیروباوەڕی ئیسلامیەوو بیروباوەڕی ئیسلام تەواو پێچەوانەیەتی.

پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵێت یەکبوونی نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراو شتێکی نەگونجاوە، چونکە ئەگەر ئەو دوانە یەك بخرێن یان دەبێت دوای یەکبوونەکە وەك پێشتر ببنەوە بە دوو کە ئەمەش فرەییە نەك یەکبوون، یان دەبێت لە گەڵ سێیەمدا ببنە یەك وەك چۆن ئاو و شیر و ئاگر و ئاسن یەکدەگرن، دەی بەوەش دەبێت بەدیهێنەر بتوێتەوەو ببێتە حەقیقەتێك وەك هەموو ئەوانەی تر کە یەکدەگرن، ئەمەش نەگونجاوە بۆ خوا چونکە ئەمە واتە نەبوونی ئەوەی کە بووە، دەی خوای گەورە واجیبولوجودە بە زاتو سیفەتەکانیەوە کە سیفەتی کەمالی هەیەو ئەگەر ئەوە نەبێت ئەوە کەموکورتی دەدرێتە پاڵ خوا، خواش بە دوورە لە کەموکورتی.

پێشەوا غەزالی لە کتێبەکەیدا (فضائح الباطنية) دا ئاماژەی داوە بە ناڕەوایی بیرۆکەی حلوول و بەوپەڕی گەمژەیی وەسفی دەکات، چونکە ناکرێت

حلوول لەنێوان دوو بەندەدا رووبدات ئیتر چۆن لەنێوان خواو بەندەدا رووبدات، رۆحی صۆفیگەری بگاتە چ ئاستێکی صەفاش چۆن دەکرێت ئەو بانگەشەیە بکرێت، با وا دابنێین ئەمە بۆ کەسێك ببێت ئەی چۆن بۆ هەموو دەروونەکانی تر نابێت، ئەوکات هەموو جیهان دەبنە خوا، دەی نەگونجاوە خوا لە نەفسەکاندا بتوێتەوەو وێنەی مۆرکی مەی لە شیردا مۆرك بگرێت، چونکە ئەمەیان سیفەتی جەستەییە.

دکتۆر مەحموود قاسم وتەی پێشەوا غەزالی بە بەڵگە دێنێتەوەو سەبارەت بە ئیتیحاد دەڵێت ئەو عەقڵەی بەڵگەمان بۆ دێنێتەوە سەبارەت بە بیرۆکەی حلوول هەمان ئەو عەقڵەیە بەڵگەی ئەوەمان بۆ دێنێتەوە کە بیرۆکەی حلوول پووچیەکی زۆری نیشانداوە، چونکە ئەوەی دەڵێت بەندە بووە بە خوا، ئەوە وتەیەکی پێچەوانە لەگەڵ خۆیەتی، بەڵکو پێویستە خوای گەورە لەوە پاك راگیرێت کە خەڵکیٚ بتوانن قسەی وا بە زمانیاندا بێت.

رێی بەڵگەهێنانەوە بۆ خراپیو نارەوایی ئەو بابەتە لای غەزالی ئەوەیە سیٚ ئەگەر بۆ ئەو جۆرە ئیتیحادە بانگەشە بۆ کراوە بخەینەڕوو:

یەکەم: یان هەریەك لەو دوو زاتە هەن.

دووەم: یان یەکێکیان لەناو بچێتو ئەوی تریان بمێنێتەوە.

سێیەم: یان هەردووکیان پێکەوە لەناوبچن.

لە باری یەکەمدا یەکبوون روونادات، لە دووەمیشدا چۆن دەکرێت بڵێیت یەکبوونیٚ لەنێوان بوویەك و نەبوویەکدا روویداوە، لە سێیەمیشدا ناکرێت هیچ

باسی ئیتیحاد بکەیت بەڵکو چاکتر وایە باسی نەبوون بکەین، بۆیە نەگونجان لە هەموو ئەگەرەکاندا روونە.

عەقڵ بڕیاری بوونی ئەو نەگونجانە دەدات، هەر عەقڵ قبووڵی ئەو نەگونجانە ناکات، ئەمەش دوای ئەوەی شەرعی خوا نەگونجانو خراپی بیرۆکەی ئیتیحادی لای مەسیحیەکان خستەڕوو، جا بنەڕەتی ئیتیحاد پووچە.

## کەسێتی حەلاج[1] یەکسانە بە حلوول:

کەسێتی حەلاج راستی بارو حاڵی حەلاج و بانگەوازەکەی دەخاتەڕوو.

نووسەری کتێبی (الفهرست) دەڵێت حەلاج کەسێکی تەڵەکەباز بوو رێچکە صۆفیگەریەکانی بەکاردەهێنا و زمانی ئەوانی بەکاردەهێنا و لای هاوەڵانی بانگەشەی خواەتی دەکرد و باسی حلوولی دەکرد و دەیوت (انا الحق) حەلاج خەڵکی گشتی بە برێ ساختە لەخشتەبردبوو کە پێشتر بۆ چالاکی خۆی بەکاری دەهێنا، هەروەها نووسەر دەڵێت حەلاج زۆر بوێر بوو بەرامبەر بە سوڵتانەکانو باسی هەڵگەرانەوەی دەوڵەتانی دەکرد، پێشەوای دوو حەرەم ئیمامی جوەینی دەڵێت حەلاج دەیویست دەوڵەت لەناوبەرێ و وڵات تووشی شڵەژانو گەندەڵی بکات، ئیبن خەلەکان دەڵێت ئەو پەیوەندیەکی پتەوی هەبوو لەگەڵ

[1] - خوێنەری خۆشەویست بۆ بەرچاورِوونی زیاتر لەسەر کەسێتی حەلاج، کورتەیەك لەسەر ژیانی ئەو کەسێتیە وەك پاشكۆیەك لە دوای ئەم بەشەوە دادەنێین. (وەرگێڕ)

قەرمەتیەکاندا، هەروەك لە ناوچەکانی خیلافەتی ئیسلامیدا زۆر هاتوچۆی دەکرد و هەلگری بانگەوازی شیعەگەر و بانگەوازی قەرمەتی بوو، بۆیە دەولەت بە مەترسیەکی دانا بۆ سەر خۆی و ویستی لە دەستی دەربازی بێت.

حەلاج بانگەوازی بۆ حلوول دەکرد، واتە توانەوەی خوا لەناو مرۆڤدا، واتە مرۆڤو خوایش یەك شتن وەك چۆن مەسیحیەکان بانگەشەیان بۆ دەکردو دەیانوت سروشتی خوایی لەگەڵ سروشتی ناسوتیدا تێکەڵ دەبێت، چەمکی حلوول هاوتای بیروباوەڕی تەجەسودە، تەجەسودیش لەسەر بنەمای دوانەیی سروشتی خوایی وەستاوە یان بە لاهووت و ناسووتیٚ دەریدەبڕێت کە لە پەیامی مەسیحیدا کەسێتی مەسیحی پیٚ وەسف دەکات، یەکێك لە گومانەکانی حەلاج ئەوەیە کە دەڵێت ئەولیاکان لە پێغەمبەران چاکترن، هەرکەس لە ئەولیاییدا بگاتە لووتکە ئیتر شەریعەتی لەسەر نامێنێتو حەرامەکانی بۆ حەڵاڵ دەبێت، بێگومان ئەمە پەیامەکەی حەلاج بە تەواوەتی لە ئیسلام دەردەکات، غەزالی باسی بیردۆزەکەی حەلاج دەکاتو دەڵێت ئیتیحادی بەندە لەگەڵ خوادا لەڕووی عەقڵیەوە بەسەرهاتێکی ئابڕووبەرانەیەو لەرووی نەقڵیشەوە قبووڵ نەکراوە.

حەلاج بە کەسێکی بنەڕەت مەجووسی وەسف کراوە کە سەرقاڵی شتی نائاساییو فرتو فێڵ بووەو بانگەشەی زانینی نهێنیەکانی کردووە، دواتر بانگەوازی پێغەمبەرایەتیو پاشان بانگەوازی خوایەتی کردووە، خزمەتکارانی کۆشکی موقتەدیر بیللاهی عەبباسی لەخشتە بردبوو تا ئامانجەکەی خۆی بەوان بێنێتەدی، ئەمەش بوویە هۆی کوژرانی.

پێشەوا جوەینی لە کتێبەکەیدا باس لەوە دەکات حەلاج و جەنابی سەرکردە قەرمەتیەکان رێککەوتنێکی نهێنی لەنێوانیاندا هەبوو بۆ لەناوبردنی دەوڵەت، ئەمەش هۆکاری راستەقینەی کوشتنی حەلاج بوو.

هەروەها حەلاج تۆمەتبار کرابوو بە دژایەتی کردنی قورئان.

نیکسۆن دان بەوەدا دەنێت گومان لەسەر حەلاج زۆرەو ئەو یەکێك بووە لە بانگخوازانی قەرمەتی و هەم باوەڕداران‌و هەم بێباوەرانی بانگ دەکرد بۆ رێبازەکەی، لێرەوە بڕیاردان لەسەر کوشتنی دادپەروەرانە بوو، دیارە حەلاج لە رۆژانی خەلیفە موقتەدیردا دادگایی کراو لیستی تۆمەتەکانیشی بریتی بوون لە:

یەکەم: نامەو پەیوەندیە نهێنیەکانی لەگەڵ قەرمەتیەکاندا کە دوژمنی دین‌و خیلافەتیش بوون.

دووەم: دەیوت حەج مەبەستێکی گشتی ئایینی نیە.

ماوەی چەند ساڵ موسڵمانان رێیان دا حەلاج لەناو بازاڕی بەغداددا بانگەواز بکات أنا الله، أنا الحق، سبحاني ما أعظم شأني، وازیان لێهێنا بەم هەموو لاداناوە قسەکانی خۆی بکات.

دکتۆر نەشار دەڵێت حەلاج لەبەر ئەوە نەکوژرا کە بانگەوازی بۆ ئیتیحاد دەکرد، بەڵکو وەزیر حامیدی کوڕی عەبدولعەزیز کوشتی یان داوای کرد لە فیقهناسان تا فەتوای کوشتنی بدەن، ئەمەش لەبەر هۆکارێکی سیاسی بوو، یان بە واتایەکی تر بە هۆکارێکی زانستی، چونکە لە ماوەی کۆتایی ژیانیدا بانگەوازی دەکرد بۆ لەکارخستنی پایەیەکی کرداری ئیسلام کە ئەویش حەجی

ماڵی خوایە، حەلاج دەیوت حەج بە هیممەت دەکرێت و حەجی هیمەتیش جۆرێکی میعراجی صۆفیگەریە کە تیایدا دەروون لە شوێنێکەوە دەچێت بۆ شوێنێکی ترو بەربەستەکان دەبرێت تا بگاتە پێگەی کۆتایی خۆی، کاتێك ئەم بانگەوازەی کرد موسڵمانان نەیانکوشت، بەلام کاتێك لە ماڵی خۆیدا کەعبەیەکی دروست کردو بە موسڵمانانی دەوت لەوێ حەج بکەن، ئیتر شمشێری شەرعی بۆ هەڵکراو پێی کوژرا، زۆربەی مێژوونووسانی تەصەوف ئاماژە بەم هۆکاری کوشتنەی دەکەن، تەنانەت دەبینین ئیبن عەرەبی باسی ئەوە دەکات و دەڵێت فیقهناسان فەتوای کوشتنی حەلاجیان دا لەبەرئەوەی حەجی لەکاردەخست، داوی دەکرد زەکاتو صەدەقە ببرێت بۆ لای ئەو، هەوڵیدەدا بنەڕەتی پەرستشەکان لەکاربخات.

بەڕێز رەشید رەزا ئاماژە دەکات بۆ بانگەشەکانی حەلاجو دەڵێت ئامانجی ئەوەبوو وا لە خەڵکی تێبگەیەنێت کە خوای گەورە زانستی غەیبو توانای نائاسایی‌و لە سنووربەدەری پێبەخشوە، زۆربەی شتە نائاساییەکانی حەلاج فێڵ‌و تەڵەکەی رێککەوتنی ژێربەژێر بوون، لەگەڵ کەسانێ رێکدەکەوت تا لەناو خەڵکدا بڵێن حەلاج کەراماتی هەیە، ئەمەش هەر لە سەردەمی خۆیدا ئاشکرا بوو وەك چۆن تەنووخی لە جامع التواريخ دا باسی دەکات، لەوانە کەسێك وەك رێنموون‌و هەواڵبەر بوو، حەلاج پێی وت حەزت لە چیە بیڵێ، ئەویش وتی ماسی تازەم دەوێت، ئەوان لە ناوچەیەکی شاخاوی دوور لە رووبارو دەریا بوون، ئەویش چوویە ژوورێکی چۆڵەوەو دەرگای لەسەر خۆی داخستو دوای

ماوەیەکی زۆر گەڕایەوەو تەپوتۆز گرتبووی و لەسەر ئەژنۆ کەوت و ماسیەکی بەدەستەوە بوو، دەیوت داوای لە خوا کردووەو ئەویش فەرمانی پێکردووە بکەوێتەڕێ‌و ئەویش چووەو تا ئەهواز چووەو لەوێ ئەو ماسیەی هێناوە، کابرا وتی رێم دەدەیت بچمە ناو ئەو ژوورەوە ئەگەر زانیم هیچ فێڵێك بوونی نیە ئەوە باوەڕت پێ دێنم، ئەویش وتی دەی بڕۆ، کابرا چوویە ژوورەوەو پاش ماندووبوونێکی زۆرو پشکنینی ورد رێیەکی دۆزیەوە بۆ ماڵێکی گەورە کە باخێکی گەورەی تێدا بوو و جۆرەها میوەو بەرهەم و شمەکی تێدا بوو، شتی وای تێدا بوو کە هی ئەو کاتە نەبوون بەڵام بە فێڵی زانستی پارێزرابوون، بڕێ خەزێنەی پڕ خوێی بینی کە جۆرەها خواردنی پێگەیشتوو و شمەکی تری تێدا بوو کە خێرا ئامادە دەکران، حەوزێکی ئاوی بینی کە پڕ بوو لە ماسی، دانەیە لەوانەی گرت‌و هاتە دەرەوە، حەلاج کەوتە شوێنی و ئەویش ماسیەکەی بە روویدا فڕێ دا و رایکرد، حەلاج سوێندی خوارد ئەگەر ئەوە بۆ کەس باس بکات دەیکوژێت ئەگەر لە ژێر زەویشدا خۆی شاردبێتەوە، کابرا بۆ کەسی باس نەکرد تا حەلاج کوژرا، چونکە دەیزانی ئەگەر حەلاج فەرمان بکات بە یەکێك لە شوێنکەوتوانی ئەوە دەیکوژن.

## سێیەم: ئیشراق:

ڕێبازی ئیشراق ڕێبازێکی یۆنانیە کە سوودی وەرگرتووە لە بیرۆکەی ئەفلاتۆنی نوێو سەهرەوەردی بانگەشەی بۆ دەکرد، بڕێ بەشی فەلسەفەی بتپەرستی یۆنانی و فەلسەفەی مەجووسی فارسیو بڕێ راو ڕەوتی بایەخ پێدراوی سریانەکان بوون کە لە سەردەمی وەرگێراندا گوازرانەوە نێو بیری ئیسلامی، حیکمەتی ئیشراقی دەدرێتەوە پاڵ ئەفلاتوون، دواتر دەدرێتەوە پاڵ بانگخوازانی ئەفلاتوونی نوێ لە خوێندنگەی ئەسکەندەریە، ڕێبازی ئیشراق بە تەواوەتی لە دەرەوەی چەمكو وتای ئیسلامەوەیەو خوا وەك ڕووناکی و جیهانەکان بە ڕوونکاوی وەرگیراو لە خوا دەناسێنێت، ئەمەش نە لە قورئانو نە لە فەرموودەو نە لە وتەی هاوەڵاندا نەهاتووە.

دەستەیەك لە ڕۆژهەڵاتناسان گرنگی زۆر دەدەن بە سەرهرەوەردو بیردۆزەکانیو ئەو کتێبە کۆنانەیك ە موسڵمانان سەرو بنیان ئاشکرا کردوون دەخەنەوە بەرچاوو لەپێناو زیندووکردنەوەی ئەو چەمكو واتایانەدا دەیناهێننەوە مەیدان تا لە ئاسۆی بیری ئیسلامیدا بیانخەنەوەڕوو، ئەمشە لەپێناو گومان نانەوە لە دەروونی هەندێ موسڵماندا کە جوان لە چەمكو واتای ڕەسەنی ئیسلامی تێنەگەیشتون، برۆکلمان و ارتیز وفادی برج ڕێبەرانی ئەوانەن، وەرگێرانی کتێبی (هیاكل النور)ی سەهرەوەردی هی ئەوانە، ماسینیۆنی دۆستی حەلاجیش گرنگی داوە بە نووسینەکانی سەهرەوەردیو لەژێر ناوی (الحكمة المشرقية) دا کۆی کردوونەتەوە، هەریەك لە باول كراوس و

هنری کوربان گرنگیەکی زۆریان بەوە داوەو پێیان وایە کەسێتی‌و نووسینەکانی سەهرەوەردی ساتی جەوهەرین لە مێژووی هزری ئیسلامیدا.

عەبدوڕەحمان بەدەوی و ئیبراهیم مەدکورو ئەحمەد ئەمینیش کەوتنە وەرگێڕان‌و گرنگیپێدانی ئەو بەرهەمانە، بەلام پیاوانی بیری رەسەنایەتی ئسلامی سەهرەوەردی بە کەسێکی ساختەکار و گومڕا ناودەبەن، بەڵکو تۆمەتباری دەکەن بە بیری تەعتیل و دەڵێن بیروباوەڕی لێکهەڵوەشاندووە بەتایبەت لەوەی دەڵێت خوای گەورە توانای هەیە پێغەمبەرێك دوای موحەممەد بنێرێ، مەبەستی لەوەش خۆی بوو.

ڕێبازی ئیشراقی بە گشتی ڕێبازێکی ئەفلاتوونیە کە هەڵگری پەیامەکانی ڕەوتە پێشووەکانی فەلسەفەی ئیسلامیە، بەتایبەت نووسینەکانی ئیبن سینا، خوای گەورەی بە رووناکی رووناکیەکان وەسف کردووە، بیرۆکەی دە عەقڵەکە بەکاردێنێت: بتپەرستی یۆنانی لەژێر ناوی رووناکیەکاندا دەخاتەڕوو، ئیتر جیهانێکی لەنێوان جیهانی هەستی‌و جیهانی عەقڵیدا اناوەو ناوی  ناوە بەرزەخ، ئەمەشی لە ئەفلاتوونەوە وەرگرتووە.

ڕێبازەکە تێکەڵەیەکی فەلسەفەی یۆنانی‌و فەلسەفەی فارسیەو هەموویشیان بتپەرستین‌و بڕوایان نیە بە خوای تاك‌و تەنهاو لەگەڵ چەمکی یەکخواپەرستی ئیسلامیدا ناگونجێن، لە مەسەلەی پشت بەستن بە بیری کۆنی هیلینی‌و غەنووصیشدا پەیوەندیەکی روون هەیە لەنێوان ئیبن عەرەبی‌و حەلاج‌و سەرهرەوەردیدا.

کەسێتی سەهرەوەردی چەمك‌و واتای دروستی رێبازەکەی دەخاتەڕوو، یەکێك لە بەرگریکارانی کە بیرەکەشی بڵاو دەکاتەوە(سامی کیالی) بە جوانی راستی سەهرەوەردی دەخاتەڕوو و دەڵێت شکڵ‌و شێوەی هی شان‌و شکۆو رێز نەبوو لە دەروونی موستەقبەلیدا، خۆی پشتگوێ خستبوو تا ئاستێ هەندێ لەوانەی ژیانی دەنووسنەوە دەڵێن شێوە ناشیرین‌و جلوبەرگ پیس‌و جەستە چڵکن بوو، جل‌و جەستەو دەستی نەدەشۆرد، نینۆکی نەدەکردو سەری نەدەتاشی، زیاد لەوەش دەڵێن ئەسپێ دادەکەوتنە سەر دەموچاو و جلوبەرگی، هەرکەس ببینیایە لە دەستی رایدەکرد.

ئەم وێنەیە عەقڵ‌و هزر نیشان دەدات، بانگخوازانی ئیسلامی هەمیشە نموونەی چاکوخاوێنی‌و جوانی جەستەو رەوشت بون، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێش بوون بە پێغەمبەریش ناسرابوو بە بۆنخۆشی، شەهرەزووری مامۆستای کە نووسەری کتێبی (نزهة الأرواح) ە وا وەسفی دەکات کە لە ئاستی خەڵکی گشتیدا بوو، قژو ریشی زر درێژ بوو، زۆر حەزی لە گوێ گرتن بوو، زۆر بە سووکایەتیەوە دەیڕوانیە دیمەنی دەسەلاتداری و خۆنواندنی دنیایی.

هەموو ئەو سەرچاوانەی باسیان کردووە باسی پیس‌و پۆخڵی سەهرەوەردی دەکەن، لەوانە کتێبی (آثار البلاد) و (أخبار العباد)ی قەزویني و (اعلام النبلاء بتأریخ حلب الشهباء)، بیروبۆچوونەکانیشی لە دەرەوەی بازنەی چەمك‌و واتای رەسەنی ئیسلامیەوە بوون، گفتگوی لەگەڵ زانایاندا نەزانی و

گومان‌و تەڵەکەبازی و دووفاقی وتەکانی نیشان دەدات تا ئاستێ زانایان تۆمەتباریان دەکرد بە گومان لەدڵی و لێکهەڵوەشانی بیروباوەڕی.

ئەو فەلسەفە ئیغریقی‌و هیندی‌و فارسیانە عەقڵیان تێکدابوو و دەیویست لەو تێکەڵەوە فەلسەفەی ئیشراقی دابهێنێت، ئەگەر هەڵوێستی بەرامبەر بە نەیارانی ئیسلام نەرم نەبوایەو هاوکاری نەکردنایەو پەیوەندی نەبوایە لەگەڵیان، ئەوە سەهرەوەردی بەو جۆرەی بەرامبەر نەدەکرا کە کرا.

دکتۆر عومەر فەرحو دەڵێت ئەو تۆمەتەی لەرووە بریتیە لە ملهوڕی و ئیلحاد، بەلام وادیارە هۆکارە راستەقینەکە ئەوە بێت کە لەلایەن دەوڵەتی ئەو کاتەوە گومانی لەسەر بووە، چونکە زۆر جووڵاوەو چالاکی سیاسی لێ بەدیکراوە، سەیفەدینی ئامدەی دەگێڕێتەوە دەڵێت کاتێك لە حەلەب چووم بۆ لای سەهرەوەردی قسەیەکی پێ وتم‌و وتی دەبێت ببمە خاوەنی ئەم زەویە، منیش وتم مەبەستت زانستە؟ وتی نا، بۆیە بێ دوودڵی داینابوو ببێتە خاوەنی زەوی، ئەوەش سەرچاوەی دادگایی کردن‌و کوشتنی بوو لە ساڵی 632 ی کۆچیدا.

بێگومان رێبازی رۆژهەڵاتناسی دوورە لە کرۆکی ئیسلامەوە، بەڵکو چەمك‌و واتای رەسەنی ئیسلامی لەسەر برێ بنەمای چەسپاوی قورئان‌و سوننەتی صەحیح دامەزراوەو ژیان‌و ئاکاری پێغەمبەری خوای(ﷺ) کردوەتە نموونەیەکی پەیڕەوکاری تا موسڵمانان تووشی بیدعەو ئارەزووبازی نەبن‌و چاویان لە زیادەرەوی نەبێت، بڕوایان بەوەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچی لە

ئوممەتەکەی نەشاردووەتەوەو هاتووە تا رەوشتە بەرزو جوانەکان کامڵ بکات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هۆشیاری داوە بە موسڵمانان تا نەچن بە کونی بزنەماردا، چونکە پێشتر بتپەرستە شوێنکەوتەکانی بیری ساختەی مرۆیی چوون بەو کونەدا، ئەو بیرە ساختەی کە لە ئیغریق‌و فارس‌و هیندەوە هێنرابوو.

## بیرۆدزەی فەنا

ئەمەش بیرۆکەیەکی هیندۆسیەو لە بووزیەتەوە وەرگیراوە، ئەم بیرۆکەیە دەڵێت فەنای کۆتایی لە ناکۆتاییدا روودەدات، هەڵەکەشی ئەوەیە کە بەدیهێنەر و بەدیهێنراو بە یەك شت دادەنێت، توێژەران دەڵێن دیدی صۆفیەکان بۆ فەنابوون کە وایکردووە بڕوایان هەبێت بە ئیتیحاد، لە کتێبەکانی صۆفیگەراییەوە هێنراوەتە ناو فەلسەفەی صۆفیگەراییەوەو کاری کردووەتە سەر ئیبن سەبعین کە دەڵێت خۆشەویست لەناو خۆشەویستەکەیدا فەنا دەبێت تا جیاوازیەك نەبێت لە نێوان خۆشەویست‌و خۆشەویستەکەیدا، ئیسلام فەنابوونی زاتی مرۆیی لەناو زاتی خواییدا قبووڵ ناکات و دانی پێدا نانێت.

سۆفیگەراکان کاریگەر بوون بە شیعرەکانی فارس و چی دیدی حلوولی تێدا بوو پێی کاریگەر بوون تا بیرۆکەی وەحدەتولوجودی یۆنانیش دەرکەوت و لە شیعرەکانی ئیبنولفارز و ئیبن عەرەبیدا خۆی نواند و دواجار بیردۆزەی ئیبن

عەرەبی سەبارەت بە مرۆڤ دەرکەوت، جا ئەم بیرۆکەیە سەرچاوەکەی ئیسلامی نیە، بەڵکو وەرگیراوی وتەکانی ئەرستۆ و ئەفلاتوونەو فارابی و دەستەیەك لە دەستەی ئیخوانوصەفا دووبارەیان کردەوەو ئیبن عەرەبیش لە نووسینەکانیدا بەکاری هێنا، ئەمەش بازنەی رێنماییەکانی بەرهەمی بوو و سەرچاوەکەی مانەوی ئێرانی کۆن بوو، هەروەك هەمان بیرۆکە لە فەلسەفەی فیلۆن و لە فەلسەفەی بووزیشدا هاتووە، چونکە لای ئەوان بووزا کامڵترین بەدیهێنراوی خوایە.

بیرۆکەی مرۆڤی کامڵ ئامانج لێی دروستکردنی قوتبێ یان نێوەندێکە بۆ گەیشتن بە خوای گەورە، بۆیە ئەو بیرۆکەیە لە دیدی ئیسلامیدا هەڵەو نارەوایەو بە هیچ جۆرێ ئیسلام دان نانێت بە بوونی نێ،ەندێك لەنێوان خوای بەدیهێنەر و مرۆڤدا.

جا ئەوانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە شێوەیەکی نامۆ و دوور لە سیفەتە رەواکانی خۆی وەسف دەکەن کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەم بیردۆزەوە، بەڵکو ئەوانە لەو وەسفو وێنە لایانداوە کە قورئانی پیرۆز و هاوەڵو گەورە تابعیەکان خستوویانەتەڕوو.

# ئیبنولفارز

ئیبن تەیمیە وا لە ڕێبازەکەی فارز تێگەیشتووە کە یەکبوونێکی بوونیەو لەسەر بنەمای حلوول و ئیتیحاد دامەزراوە، جا پێی وایە ئەوانەی بڕوایان هەیە بە وەحدەتولوجود وەك مەسیحیەکان وان، قسەکانیان کوفرو گومڕاییەکی تێدایە زۆر زیاتر لەوەی جوولەکەو مەسیحیەکان دەیڵێن، ئیبن تەیمیە دەڵێت هەڵوێستی ئیبنولفارز لەگەڵ ڕێنماییەکانی ئیسلامدا تەبا نیە، پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵانو تابعینو زانایانی پێشینەوە وەرگیراوە، بڕوابوون بە وەحدەتولوجودو حلوول بڕوایەکی زۆر خراپو پێچەوانە بە ئیسلامی دروستە.

ئیبن تەیمیە بەرامبەر بە ئیبن سەبعین و حەلاج و کرمانی و عەفیفەدینی تلمسانیو ئەوانەی تریش کە بڕوایان هەیە بە وەحدەتولوجود هەمان ڕای هەیە، چونکە ئەوانە لە دوو ڕوانگەوە پێچەوانەی ئایینی ئیسلامن، چ لە ڕووی عەقڵیو چ لە ڕووی نەقڵیەوە، یەکێك لەو دوانە دەیسەلمێنێ کە حلوول و ئیتیحاد و دیدی وەحدەتولوجود ڕای ئەوانەیە کە پێیان وایە بوون یەکەمو هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان خوای گەورە کە واجیبولوجوبە لەگەڵ بوونێ کە بەدیهێنراوە.

دووەمیشیان بەڵگەهێنانەوەیە بە قەدەر بۆ کرداری ڕێ پێنەدراو، لە دیدی ئیبن تەیمیەدا واجبە بڕوات هەبێت بە قەدەرو نابێت لە لادان لە فەرمانی خوا و بەزاندنی سنوورەکانیدا قەدەر بکەیتە بەڵگە.

زانایان مشتومڕێکی وردی ئەو ئاراستەیە دەکەن‌و زۆرێکیان ئیدانەی دەکەن وەك ئیبن حەجەر و بورهانەدین ئیبراهیم بقاعی کە دوو کتێبی نووسیوەو تیایدا هێرشی بردووەتە سەر ئیبن عەرەبی و ئیبنولفارز و گومڕایی رێبازو خراپی بیروباوەڕو لێکهەڵوەشاوی رەوشتی هەردووکیانی روونکردووەتەوە، دوو کتێبەکەش بریتین لە:

(تنبیه الغبي علی تکفیر ابن عربي)

(تحذیر العباد من اهل العناد ببدعة الإتحاد)

عەزودەدینی ئیجی نووسەری کتێبی (المواقف عن ابن عربی) ە دەڵێت ئیبن عەرەبی درۆزن‌و وێنەی هەرچی و پەرچیان بووەو ئەوەی دەڵێن بوونی کائینات خودی خوایە واتە هیچ پێغەمبەرو نێردراو و بۆ نێردراویٚ بوونی نیە.

هەروەها دەڵێت ئیبن عەرەبی فێڵ‌و تەڵەکەی زۆری هەبووەو توانیویەتی خەڵکێکی زۆر لەخشتە بەرێت، دەستەیەك لە مێژوونووسانیش لەسەر ئەم وتەیە دەستخۆشی لە عەزودەدین دەکەن، چونکە پێشتر شارەزای نەبون، زانایان کۆدەنگن لەسەر بەکافر دانانی ئیبن عەرەبی، هەروەها سەبارەت بە ئیبنولفارز دەڵێت لە سەردەمی خۆیدا کەس نەبووە دان بنێت بە دادپەروەری‌و راستی ئەو کەسێتیەدا، نەبینراوە شارەزای زانستێکی ئایینی بێت‌و بە قەصیدەیەکیش وەسفێکی پێغەمبەری خوای نەکردووە، ئەمەش نیەتی خراپی نیشان دەدات.

هەوادارانی رێبازەکەی‌و رەخنەگرانیشی لە ئەهلی سوننە لە سەردەمی خۆیدا تۆمەتی فیسق‌و سنووربەزێنی تۆمەتباری دەکەن، بەقاعی ناوی نزیکەی

چل زانای هێناوه که هەموویان گەورە زانایانی سەردەمی ئیبنولفارز تا سەردەمی بقاعی بون‌و هەموویان ڕێڕەوی بێباوەری یان زندیقی‌و بیروباوەڕی خراپ دەدەنە پاڵ ئیبنولفارز، لەوانەس عیزەدینی کوڕی عەبدوسەلام و ئیبن دەقیقولعید و تەقیەدین سەبکی و بەدرەدین بن جەماعەو زەینەدینی حەنەفی، بەقاعی هەریەك لە ئیبنولفارز و ئیبن عەرەبی تۆمەتبار دەکات بە ڕەوشتیان، بەڵگەش بۆ ئەوە بە ئاماژەکەی نووسەری کتێبی المواقف دێنێتەوە که دەڵێت هەردووکیان حەشیشیان بەکارهێناوە، ئەو بیروباوەڕی یەکبوونەش که دەیڵێن زادەی ئەو خەیاڵ‌و پڕوپووچیەیە که بەهۆی حەشیشەوە دێتەبەرهەم.

ئیبنولفارز یەکێکە لە ڕێبەرانی بیری وەحدەتولوجود و ئەوانەی بانگەشەی ئیتیحادو حلوول دەکەن، ئەمەش دەرچوونە لە ڕێنماییەکانی قورئان‌و سوننەت، ئیبنولفارز حەقیقەتی موحەممەدی بەرامبەر بە حەقیقەتی خوایی دادەنێت.

بیردۆزەی لاهووت‌و ناسووت که حەلاج بانگەشەی بۆ دەکرد، لای هەریەك لە ئیبن عەرەبی و ئیبنولفارز بەدیدەکرێت‌و یەکێکە لە بنەڕەتەکانی مەسیحیەت که تێکەڵ کراوە بە هزری فەلسەفی سۆفیگەری، وتنەوەی وتەی یەعقووبیەکانە که پێیان وابوو مەسیح خوایەو خواو مرۆڤ یەکیان گرتووەو لە سروشتی مەسیحدا خۆی نواندووە، لاهووت‌و ناسووت نە لە فەرهەنی عەرەب و نە لە شەریعەتیشدا بوونی نیە، بەڵکو داهێنراوی مەسیحیەتە.

خوای گەورە دەفەرموێت: (لقد كفر الذين قالوا إن الله هو المسيح بن مريم)

دواتر حەلاج ئەو چەمکەی بەکارهێناو زۆر بەکاری دەهێنا، ئیتر لە دەقە فەلسەفیەکاندا بووبووە نوێنەری ئەو دیدە مەسیحیە، ئەمەش پەیوەست کرابوو بە ئەفلاتوونی نوێوە.

رۆژهەلاتناسان گرنگیەکی زۆریان داوە بە ئیبنولفارز، ئیمیل در منجم کتێبێکی وەرگێڕاوە بە ناونیشانی (خمرية سلطان العاشقين) و پێشەکیەکی سەبارەت بە تەصەوف بۆ نووسیوەو دەیباتە ئاستی تامو گرنگی چوارینەکانی خیام.

هەر لە سەدەی حەڤدەهەمەوە شیعرەکانی ئیبنولفارز وەرگێڕاونەتە سەر زمانی لاتینیو ئیتالیو ئەڵمانیو ئینگلیزی.

تەصەوفی فەلسەفی هەوڵ دەدات لە چەند بابەتێکدا پەیامی ئیسلامی بشێوێنێت:

یەکەم: ئیسلام دان نانێت بە توانەوەی خوا لە جەستەی مرۆڤدا یان بە فەنابوونی زاتی مرۆیی لە زاتی خواییدا، هەروەك دان نانێت بە وەحدەتولوجوددا یان ئەوەی دەڵێت خوا کۆکراوەی ئەو بوونەوەرانەیە کە هەن، ئیسلام پێی وایە دوو بوون هەن، واتە خواو جیهان، خوا بەدیهێنەرەو جیهان بەدیهێنراوە، خوا کارسازەو جیهان بەڕێوە دەبرێت، خوا حاڵ نیە لە جیهان بەڵکو خوا بەدیهێنەر و کارسازیەتیو چاكو خراپ بە دەستی خوایەو بەپێی کردەوەیان پاداشتو سزای خەڵکی دەدات.

دووەم: ئیسلام دان نانێت بە نەمانی بەرپرسیارێتی و بەجێگەیاندنی پەرستشەکان لەسەر تاك، بەو بیانووە کەسێك بڵێت مادەم گەیشتووم بە خوا

ئیتر ئەرکو پەرستشم لەسەر نیە، ئەم قسەیە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بوونی نەبووە کە ئەوەش بەرزترین لووتکەی باری موسڵمانانە، پێغەمبەری خواو موسڵمانان تا لە ژیاندا بوون پەرستشو فەرزەکانیان بەجێدەگەیاندن بێ ئەوەی ئەو ئەرك و پەرستشانەیان لەسەر هەڵگیرێت.

سێیەم: ئیسلام بڕوای نیە بە بیروباوەڕی جەبریو بیرۆکەی زوهد بە دیدە سلبیەکەیو دابڕنا لە جیهادو کارکردن، بەڵکو ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ بنیادی ویستو بەدەستهێنا و نکووڵی دەکات لە دەستبەرداربوون لە ژیانی دنیا.

چوارەم: ئیسلام دان نانێت بە بانگەشەی تەصەوفی فەلسەفیدا کە پێی وایە ترسی خوا نەمێنێ و تەنها هیوابوون بە خوا هەبێت، بەڵکو هەریەك لە ترس و هیوابوون لە یەك کاتدا دەبێت لە ناخی تاکی موسڵماندا هەبن.

پێنجەم: ئەو قسەی دەڵێت تەصەوف زمانێکی جیهانیە نارەوایە، بەڵکو تەصەوف چەندین بنەمای بتپەرستی هێنایە ناو ئیسلامەوە، یان دەوترێت تەصەوف پاراویەکی زۆری بەخشیوە بە کۆمەڵگەیەکی وشكو برنگ.

هەموو ئەمانە ژەهری رۆژهەڵاتناسیو شاڵاوی رۆشنبیرین، ئەو تەصەوفەش کە هۆی موسڵمانبوونی خەڵکە، ئەو تەصەوفە رەسەنەیە کە هەبووە نەك تەصەوفی فەلسەفی،مەسەلی وشکی و پاراویش لە ئیسلامدا بوونی نیە، چونکە عەقڵو دڵ پێکەوە کۆدەکاتەوە.

ئەو تەصەوفەی کە ئیسلام دانی پێدا دەنێت ئەوەیە کە نکوڵی ناکات لە هیچ بنەماو لقو بەشێکی ئیسلام.

ئیسلام دان نانێت بە بانگەوازکردن بۆ کەنارگرتنو بێزاندنی دنیا یان کەنارگرتن لە خەڵك یان سزادانی جەستەو حەرامکردنی پاکیەکان، هەروەك لە هەمان کاتدا زێدەڕۆییش قەدەغە دەکات، هەروەك دان نانێت بە نەمانی ئەرك یان لەکارخستنی شەریعەت لە هیچ بارو کاتێکی موسڵماندا.

هەمیشە فیترەتی ئیسلامی دورو بووە لە ئاڵۆزیەکانی تەصەوفی فەلسەفی، هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیانەوە ئەو پرسانە دارمانو خراپییان ئاشکرا بوو، بەردەوام بەو جۆرە بوو سەرلەنوێ شاڵاوی ڕۆشنبیری هەوڵیدا ئەو بیرە گومڕاییە زیندوو بکاتەوە.

بێگومان برێ گومان لەپشت مێژووی تەصەوفی فەلسەفیەوە حەشاردراون، ئەو تەصەوفە پەیوەست کراوە بە چەند هەڵوێستێکی سیاسیەوە کە شێوازێکی کارکردنە بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلمی، پەردەیەکیش بوو بۆ داپۆشینی چەند بزووتنەوەیەکی شێوێنەری وەك بزووتنەوەی باتینی یان قەرمەتی یان زەنج و چەندینی تر، بەڵکو ئامانجی بوو خەڵکی بەرەو لای ئەو ڕەوتانە ڕاکێش بکات، داگیرکەریش لە سەردەمی نوێدا هەوڵی داوە بۆ هەمان مەبەست پشت ببەستێت بە تەصەوفو موسڵمانان دوور بخاتەوە لە ڕاستی ئایینەکەیان و نغرۆکردنیان لە کەشێکی ئاڵۆزی وادا کە کەناریان بخات لە خەباتکردن بۆ ڕزگارکردنی نیشتیمانیانو دوورگرتن لە جیهاد و ڕوونی ئیسلامی لە تێگەیشتن

له مەسەلەکانو کەنارگرتن له هێز، رۆژهەڵاتناسانی تەصەوف فەلسەفی بەشێك بوون له پیلانی سیاسی داگیرکاری.

ئەگەرچی حەلاج و سەرهرەوەردی کوژراون، بەڵام لەبەر راوبۆچوونیان نەکوژران، بەڵکو لەبەر پیلان گێرییان کوژران.

چەمکی رەسەنی ئیسلامی لەسەر ئەم بنەڕەتانە دامەزراوە:

یەکەم: خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو شتێکەو هیچ هاوبەشێکی نیە، هەموو شتێکی بەدیهێناوە ئیتر چ وزەی پەتی وەك موگناتیس و رۆح و فریشتەکان یان کەرەسەتیەك بێت وەك داروبەرد و گژوگیاو ئاژەڵو گیاندارەکان.

دووەم: بەدیهێنەری گەورە بەشێك نیە له بەدیهێنراوەکانیو بەدیهێنراوەکانیشی بەشێك نین له خوای گەورەو له سیفەتو کرداردا لێکچوو نین، بەڵکو بەدیهێنراوەکان به زانستو ویستو توانای خوا بەدیهێنراون.

سێیەم: بەڵگەی بوونی خوای گەورەو بەدیهێنەر له بەدیهێنراوەکانیەوە دەردەکەوێت، چونکە ئەوە شوێنەواری توانای خوا نیشان دەدات، بەدیهێنراوەکانی خوا هەرچەندە زانستیان پێ درابێت بەڵام ناگەنە ئەو ئاستەی شارەزای هەموو شتێك بن سەبارەت به خوا.

چوارەم: ئیسلام بانگەواز دەکات تا هەموو جۆرە پەرستشو هەوڵێك بگیرێتەبەر بۆ قووڵکردنەوەی چەمكو واتای تەقواو وەرع، ئەمەش به هیچ جۆرێ واتای زوهدێ نیە کە بریتی بێت له دوورگرتن له دنیا یان خۆ

یەکلاکردنەوە بۆ پەرستش‌و وازهێنان لە کارو کاسبی، ئیسلام تەنها ڕۆچوون لە ئارەزووەکانی حەرام کردووە تا دڵ بێئاگا نەکات لە پەرستشی خوا.

پێنجەم: ئیسلام دان نانێت بە نەمانی شەریعەت‌و فەرزەکانداو هیچ هۆکارێ بۆ ئەوە بە ڕەوا نازانێت، ئەوەی حەلاج بانگەشەی بۆ دەکرد و دەیوت شەریعەت نەماوە لە ئیسلام دەیباتە دەرەوە، لەراستیشدا بڕیارەکانی شەریعەت پێچەوانەی کاری دڵ نین، بەڵکو پەرستشەکان دیاردەی خۆیان هەیەو بەشێکی جیابووە نین لە ناخ.

بیرۆکەی پێکگەیشتنی ئایینەکان یان ئەوەی تەصەوف زمانێکی جیهانیە، یەکێکە لە مەترسیدارترین و خراپترین بانگەوازەکان‌و زۆر دوورە لە ئیسلامەوە، هەوادارانی وەحدەتولوجود ئەو بانگەشەیە دەکەن‌و ڕۆژهەڵاتناسانیش بازارگەرمی بۆ دەکەن، ئەمەش بە زیندووکردنەوەی بیری فەلسەفەی سۆفیگەرایی لە سەردەمی نوێدا، بۆیە ئەوە دروست نیە کە جیاوازی نێو ئایینەکان جیاوازی ڕووکەشی بێت، ئەوەش ڕاست نیە دەڵێت هەموویان ڕێی بەرەو خوا چوونیان گرتووەتەبەر، ئەو پەیامی یەکخواپەرستیە پوختەی کە شیرك‌و فرەخودایی وەلاوە دەنێت پەیامی ئیسلامەو لە پەیامدا هیچ جۆرە شیرکێ بوونی نیە.

هەموو شیعرەکانی جەلالی ڕۆمی و نووسینەکانی ئیبن عەرەبی لەم بارەوە ساختەو سەرشێوێنن، ئەوە ڕاست نیە بڵێیت کوفر و ئیمان جیاواز نین، یان خاوەن ئایینان و بتپەرستان لە یەك ئامانجا یەکن، یان تەورات و قورئان یەکن.

ئێمە دەزانین تەورات لەلایەن حیبرەکانی جوولەکەوە نووسراوەتەوەو کتێبی دابەزیوی خوا نیە بۆ پێغەمبەر مووسا.

هەروەها یەکێك لە خراپترین ئەو پەیامانەی کە بانگخوازانی رۆژئاواگەری بانگەشەی بۆ دەکەن ئەوەیە کە جیاوازی نێوان صۆفیەت و فیقهناسان دەخنەوەروو، ئەوە ناکۆکیەکی کاتی بوو کە کۆتایی هات و سڕایەوە، ئێستا نەماوە، هەروەها ئەوەی دەڵێت موسڵمانان بۆ چەند دەستەیەك دابەش بون و هەڵگرانی پەیامی رەسەنایەتیش بە یەکێك لەو دەستانە تەماسا بکەن، بێگومان ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە ئەهلی سوننە نەوەد لە سەدی ژمارەی موسڵمانان پێکدێنن و تەنها وەك دەستەیەك نین، بەڵکو زۆرینەی هەرە زۆری موسڵمانانن و کۆمەڵی رەسەنایەتین کە پەیامی خۆیان لە قورئان و سوننەتی صەحیحەوە وەردەگرن.

هەروەها ئیسلام دان نانێت بە بە زۆر قسەکردن سەبارەت بە کەراماتی ئەولیا و ئەنجامدانی کاری نائاسایی، بەڵکو پێی وایە برێ مەسەلەی تایبەت هەن تایبەتن بە تاکەکانەوە و کاریگەرییان نیە لە کۆمەڵگەدا، بە هیچ جۆرێکیش رێ نادات فەرزەکانی پەرستش لەکاربخرێن، موسڵمان لە هەر ئاستێکی ئیمان و ئەولیاییدا بێت هیچ ئەرك و پەرستشی لەسەر لاناچێت.

ئیسلام بەرامبەر بە تەصەوف فەلسەفی وێنەی هەڵوێستی بەرامبەر بە ئیعتیزال هەڵوێست دەنوێنێ، هیچکام لەو دوو رێچکانە وێنای ئیسلام ناکەن، صۆفیەکان دڵ دەکەنە پێناوی مەعریفەو نکوڵی لە توانای عەقڵ دەکەن لە

تێگەیشتن لە ئولوهیەت‌و نهێنیەکانی‌و بەرامبەر بە موعتەزیلە خوویان داوەتە دڵ، بەڵام چەمك‌و واتای مەعریفەی رەسەنی ئیسلامی دڵ‌و عەقڵ پێکەوە کۆدەکاتەوە، دڵ لە غەیب و سروش تێدەگات و عەقڵیش بینراو تێدەگات و دان دەنێت بە سروشدا.

بێگومان رۆژهەڵاتناسی‌و بانگخوازانی رۆژئاواگەری و پیلانی دژ بە ئیسلام دەتوانن ئەو دوانە جیا بکەنەوەو بیانخەنە هەڵوێستی دژ بە یەك‌و ململانێوە، دەستەیەك لە رۆژهەڵاتناسان عەقڵ بەرز رادەگرن‌و دەستەیەکی تریش دەدەنە پاڵ صۆفیگەرایی‌و حەدەس و ویژدان بەرز رادەگرن.

ئیسلام لە پەیامی رەسەنی خۆیدا دڵ‌و عەقڵ‌و شەریعەت‌و حەقیقەت‌و ناخ‌و رووکەش پێکەوە کۆدەکاتەوە، جەخت لەوەش دەکاتەوە مەعریفەیەکی سەربەخۆ لە رێی دڵەوە یان مەعریفەیەکی سەربەخۆ لە رێی عەقڵەوە نیە، بەڵکو چەمك‌و واتایەکی گشتگیر هەیە کە ئەویش ئیسلامە.

ئیسلام جەخت دەکاتەوە لە بیرۆکەی هاوسەنگی لە نهێنی‌و ئاشکرادا تا ناخی تاك لە رووکەشدا خۆی بنوێنی‌و جیاوازیەك نەبێت لە نێوان ئەوەی پێی دەوترێت ناخ‌و رووکەش ئیتر لە نێوان مرۆڤ‌و خوادا بێت یان لەنێوان مرۆڤ‌و مرۆڤدا بێت، جەخت لەوەش دەکاتەوە کرداری ناخ بنەمای کرداری رووکەشن، کرداری رووکەشیش بەڵگەی خۆی جێهێشتووە، ئەگەر کەسەکە پیاوچاك بووو ئەوە شوێنەوارەکانیش چاك بوون، ئیبن خەلدوون دەڵێت شەریعەت بڕیاری هەیە بەسەر راسپێراواندا لە روانگەی رووکەشی کرداریان هەروەها لە روانگەی

ناوەڕۆکی کردارییانەوە، خوای گەورە برێ لە حوکمەکانی نەشاردووەتەوەو هەندێکی تریان بخاتەڕوو.

بێگومان ڕێی حەق یەکە، بەڵام ناحەقی ڕێی زۆری هەیە، بۆیە چەند ڕێباز و بیردۆزەی جیاوازی لاڕێبوو دەرکەوتون، بەڵام ڕێی خوا بە روونی دەرکەوتووە، خوای گەورە دەفەرموێت (وأن هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله).

هەروەك ئیسلام جەخت دەکاتەوە لە مرۆیی بوونی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو مرۆیی بوونەی کە جەختکردنەوەیە لە حەقیقەتی خودایی، حەقیقەتی یەکخواپەرستی (قل إنما انا بشر مثلكم يوحى إلي أنما إلهكم إله واحد)، ئیسلام خوایەتی و پێغەمبەرایەتی لێك جیادەکاتەوە، عیصمەتی پێغەمبەرانو تواناکانی جیا لە پێغەمبەران جیادەکاتەوە هەرچەندە پیاوچاكو قوتب و ئەولیا بن، بەڵکو کەسانی جگە لە پێغەمبەران بە هیچ جۆرێك عیصمەتیان نیە.

هەروەها ئیسلام حەقیقەتو شەریعەت لە چەمكو واتای گشتگیری خۆیدا پەیوەستی یەك دەکات، پێشەوا تەرتووشی دەڵێت زۆر لەسەر مەسەلەیەکی دین چوون کە ئەویش وێرانکردنی ئایین بوو، بانگەشەیان ئەوە بوو کە شەریعەت شتێکەو حەقیقەت شتێکی ترە، ئەگەر یەکێکیان تووشی تاوان بوایە بە تاوانبارەکەیان دەوت ئەوە ئەهلی حەقیقەتەو گگلەیی لێ ناکرێت، یان بە پێچەوانەوە دەیانوت ئەوە ئەهلی شەریعەتە پێویست ناکات لێی ورد بیتەوە، وەك ئەوەی وابزانن خوای گەورە دوو ئایینی بۆ خەڵك دابەزاندووەو بە دوو

دیدی جیاواز لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات و بە دوو چەشنی جیاواز هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکات.

بێگومان ئەهلی سوننە راشکاوانە پێیان وایە شەریعەتو حەقیقەت هەردووکیان لە رێنماییەکانی پێغەمبەری خواوە سەرچاوە دەگرن و تەواوکەری یەکترن.

ئەمە راستە کە ئەگەر رێنمایی نهێنی لە ئیسلامدا هەبوایە ئەوە زانایانو فیقهناسان بەو رێنماییانەیان دەزانی و قورئانی پیرۆزیش باسی دەکرد.

شوێنکەوتوانی مەجووسیەت بۆ لارێکردنی ئیسلام لە باری لاوازیو دارماندا ئەم چەمكو واتایانەیان هێنانە ناو ئیسلامەوە، ئەمەش زادەی کینەیانە بەرامبەر بە بەهێزی ئیسلامو هیواو ئاواتیانە بۆ لەناوبردنی ئیسلام، رۆژهەلاتناسان و شوێنکەوتە رۆژئاواگەراکانیان بە هەمان ئامانج درێژە دەدەن بەو هەڵمەتە.

شێخ عەبدولقادری گەیلانی لەم بارەوە قسەیەکی یەکلاکەرەوەی هەیەو دەڵێت: هەر حەقیقەتێك پێچەوانەی شەریعەت بێت ئەوە زندیق بوونە، شەرع رووکەشەکەیەتی و هەر شەرعیش ناوەڕۆکەکەیەتی، ئەگەر بینیت کەسێك بە ناو هەوادا دەفرێ دانی پێدا مەنێ تا وتەکانی بە تەرازووی شەرع دەپێویت.

بێگومان ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت (لا رهبانية في الإسلام) بەربەستێکی تەواوە بۆ لادان رووەو زوهدی مەسیحیەت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (حەنیفیەتی سپیم بۆ هێناون، شەوی وەك رۆژی وایەو تەنها

بەهیلاکا چوو لێی لادەدات)، هزری ئیسلامی بە درێژایی سەدەکان لەسەر ئەم بنەمایە خۆی خستووەتەروو کە بریتیە لە خۆ رزگار کردن لە دەستوەردانە بتپەرستیە مەسیحی‌و جوولەکەیی و فارسی‌و هیندیەکان.

# پاشکۆ

## مەنسووری حەلاج

مێژووی ئیسلامی خاڵێکی دیاری تێدا بەدیدەکرێت کە ئەویش بریتیە لە دەرکەوتن و ڕۆڵی کەسایەتیەکان لەو مێژووەدا، ئیتر کەسایەتیەکان باشن یان خراپن، هەواداری ئەو دەسەڵاتە یان ئایینەن یان دژ بەو دەسەڵاتە یان ئایینەن، حەقبێژن یان حەقکوژن.

یەکێك لەو کەسایەتیانەش کە لە مێژووی ئیسلامیدا ڕۆڵی دیاری هەبووە و مەودایەکی گەورەی گرتووە و بەردەوام قسەی لەسەر کراوە و تەنانەت تا ئەمڕۆش ڕۆڵی ماوە، بریتیە لە (مەنسوری حەللاج 224-309ك/858-922ز) ئەم کەسایەتیە تا ئەمڕۆش لە نێوان دوو تێڕوانیندا خۆی دەبینێتەوە، دەستەیەك هاواری بۆ دەکەن کە خواپەرستێکی ڕاستگۆ بووە و لەسەر حەقیقەت و چاکسازی کوژراوە و ئەو کەسایەتیە لەوە گەورەتر بووە کە دەسەڵاتی عەبباسی و زاناکانی دەربار لێی تێبگەن، بەم پێیە بە بانگەشەکاری خواپەرستی دادەنێن، دەستەیەکی تریش پێیان وایە ئەم کەسایەتیە خراپەکارو گێرەشێوێن و دوژمن بە ئیسلام و موسڵمانان بووە و حەقیقەتی لێ ونبووە و تێکەوتووە و داوای پایەبەرزی و دواجاریش داوای خوایەتی کردووە، بەم پێیە بە بانگەشەکاری خوایەتی ویستی دادەنێن.

گرفتەکە لێرەدایە کە تاکەکانی ئەمڕۆ هێشتا دەستبەرداری نەبوون و بەردەوام قسەی لەسەر دەکەن، هەوادارەکانی پێیان وایە حەللاج هەموو ڕاستیەکانی پێبووە وەك ئەوەی سەرچاوەکانی حەقیقەت لەدوای حەللاج

ونبووبن، پەروایانە بەدوای وتە وکردارەکانی حەللاجدا دەڕۆن تا بیخەنە قاڵبی ئەمڕۆ و بزوتنەوەکەی زیندوو بکەنەوە، لەپێناو ئەوەشدا کە حەقبوونی حەللاج بسەلمێنن ئامادەن هەر لێکدانەوەیەك بکەن و هەموو شتێکی دژبە دیدی خۆیان بۆ حەللاج بەرپەچبدەنەوە، بەڵکو سەرچاوەکان تا ئەو کاتە ڕاست دەکەن کە حەقبوونی حەللاج دەسەلمێنن، ئیتر هەمان ئەو سەرچاوانەی وتەو کردوەکانی حەللاجیان گواستۆتەوە و لەو کاتەدا ئەمانەتپارێز بوون، کاتێك شتێك لەسەر حەللاج دەڵێن کە دژ بە دیدی ئەوانە (دیدی پیرۆز ڕاگرتنی حەللاج ) ئەو سەرچاوانە دەبنە ئەمانەت نەپارێز و دەسەڵاتخواز و ماستاوچی و...هتد. واتە لەیەك کاتدا ڕاستگۆ و درۆزن، حەقبێژ و دژەحەقن، ئەمانەتپارێز و ناپاکن.

ئەمەش دەرەنجامی دەمارگیری کوێرانەیە بۆ کەسایەتیەکان، چونکە هەرکات سەرچاوەکانی حەقیقەت دیاری نەکران، هەموو شتێك دەبێتە حەقیقەت وەرگر.

لەئیسلامدا ئەگەر قورئان و سوننەت تاکە سەرچاوەن و هاوەڵانیش نمونەی باڵان، ئەوا کەسایەتیەکانی مێژووی ئسلامی هەموویان جێی ئەوەن تا بە تەرازووی قورئان و سوننەت پێوانە بکرێن و بە بێژنگی سەرچاوەی ئایینی ئیسلام لە بێژنگ بدرێن.

لێرەدا هەوڵدەدەین کورتەیەك لە ژیانی حەللاج لە سەرچاوەکانی مێژووەوە باس بکەین.

**یەکەم : ژیانی حەللاج :**

ناوی حوسەینی کوری مەنسوری کوڕی مەحمی ئەبو عەبدوڵڵای ئەبو موغیثی فارسی بەیزاویە، لە شاری بەیزا لە ناوچەی فارس لە ساڵی (224ک/858ز) لەدایکبووە،دەشوترێت ناوی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی فارسی بووە، مەحمی باپیرەی ئاگرپەرست بووە.

ڕاجیاوازی هەیە کە بۆچی پێی وتراوە حەللاج، لەمبارەیەوە سێ ڕای سەرەکی هەیە :

1- لەبەرئەوەی نهێنیەکانی ناو دەروونی خەڵکی زانیوە و وتویەتی، بۆیە پێیان وتووە (حلاج الاسرار) دواتر ئەو نازناوەی بەسەردا سەپاوە.

2- چونکە کە چوەتە شاری واسیت چووە بۆلای هەلاجێك و ناردوویەتی بۆ کارێك، هەلاجەکە پێی وتووە : من سەرقاڵی کاری خۆمم، ئەویش وتوویەتی تۆ برۆ من کارەکەی تۆ دەکەم، پیاوەکە چووەو گەڕاوەتەوە سەیر دەکات هەموو خورییەکەی تەواوکردووە، بۆیە ناوی لێنرا حەلاج.

3- دەڵێن پێش هەموو ئەمانە ئەوەبووە کە باوکی هەلاج بووە، ئیتر ئەو ناوە بەسەر ئەمیشدا سەپاوە.

**سەبارەت بە نازناوەکانی :**

لە هیندستان پێیان دەوت (موغیث)، لە تورکستان بە (موقیت )، لە خۆراسان بە (ئەبوعەبدوڵڵای زاهید)، لە خوزستان بە (الشیخ حلاج الاسرار) و لە بەغداد بە (المصطلم) و لە بەسرە بە (المعبر) بانگدەکرا.

حەللاج هەرجارەو جۆرە بەرگێکی دەپۆشی، بەرگی شێوە ئایینی و سەربازی و...هتد، لەگەڵ بنەماڵەکەیدا چوو بۆ واسیت لە عیراق و لەوێ سەرقاڵی وەرگرتنی بڕێك زانست و زانیاری بوو، ئینجا چوو بۆ توستور و لەگەڵ (سوهەیلی کوری عەبدوڵڵای توستوریدا ) ماوەی دوو ساڵ هاودەم و برادەرایەتی هەبوو.

پاشان چوو بۆ شاری بەسرە کە پێگەیەکی گرنگی تەسەوف بوو، ئەوکات تەمەنی هێشتا(18) ساڵان بوو، لەوێ بوو بەدۆست و هاودەمی (عەمری کوڕی عوسمانی مەککی ) و ماوەی (18) مانگ لەگەڵیدا مایەوە و کومەڵێك زانیاری لێوەرگرت، دەڵێن حەللاج چەند کتێبێکی لە (عەمر) دزیوە و عەمریش دوعای لێکردوە کە خوا دەست و پێی ببڕێت.

لە بەسرە کۆمەڵێك وتە و گوفتاری هەبوو کە شێخەکانی تەسەوف پێی بێزار بوون، چونکە وتەو کارەکانی پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام و تەریقەتی دنیانەویستان بوون، عەمری کوڕی عوسمان دەڵێت: ڕۆژێك ئایەتێکی قورئانم خوێند، حەللاجیش گوێی لێبوو، وتی: (یمكنني أن أؤلف مثله وأتكلم به ) (منیش ئەتوانم شتی وادابنێم و وەك ئەوەش بڵێم).

پاشان حەللاج کچی (ئەبو یەعقوبی ئەقتەعی) هێنا کە لەگەڵ عەمردا لە ڕکەبەریدا بوون، ئەمەش لێزانی حەللاج بوو تا بەو نەیاریەی کە عەمر بۆی هەبووە بەرامبەر بەوە بتوانێت پاڵپشتی بۆ خۆی پەیدا بکات لەلایەن شێخێکی سۆفیەوە کە (ئەبو یەعقوبی ئەقتەع) بوو، بەڵام (ئەبوو ئەقتەع)ی گەورە زانای

صۆفی دەڵێت: ( من کە ژنمدا بە حەللاج لەبەرئەوە بوو کە رێگە و عیبادەتیم باش دەهاتە پێش چاو، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم بۆم دەرکەوت کە جادووگەرێکی فێڵباز و کافرێکی زۆر پیسە).

پاشان حەللاج بەسرە بەجێ دەهێڵێت و دەچێت بۆ بەغداد و دەچێتە خزمەت پێشەوای گەورەی تەسەوف (جونەیدی بەغدادی)(رەحمەتی خوای لێبێت) و باسی رکەبەری نێوان عەمر و ئەبو یەعقەبی بۆ دەکات تا وانیشانبدات ئەو حەزی بە رکەبەری و نەیاری نیە و خوێنی خۆیشی شیرین بکات و ئەو حەقیقەتەش نەشارێتەوە، پێشەوا جونەیدیش ئامۆژگاری دەکات لەسەرخۆ و هێور بێت، ئەویش ماوەیەك بەوجۆرە دەکات، ئینجا سێ جار سەفەری حەجی کرد و کەسانێکی لەگەڵدا بوو، دواتر دەستبەرداری حەج بوو و رای گۆڕا.

حەللاج لە بەغداد دەچێتە لای جونەید و پرسیاری لێدەکات، بەڵام جونەید بە پرسیارەکەی بێزارە و وەڵامی ناداتەوە، کارە ناباوەکانی حەللاج دەگەنە ئاستێك کە سەلام بۆ جونەید بکات و جونەیدیش وەڵامی نەداتەوە.

حەللاج کە پێشتر دەچووە حەج لەهەیوانی مزگەوت و لەبەر خۆر دادەنیشت و جگە بۆ پێویستی دەستکەیاندن بە ئاو یان بۆ تەواف لە شوێنی خۆی نەدەجولا، نان و ئاویشی زۆر کەمکردبوویەوە، ئەوگەشتەی حەجیشی کە وایکرد ماوەی ساڵێکی خایاند، ئینجا گەڕایەوە بۆ بەغداد و ئەو پرسیارەی جونەید هاتەپێشەوە و لەبەرامبەر ئەو هەڵوێستەی جونەیدا حەللاج ترساو لەگەڵ ژنەکەی چوو بۆ توستور و لەوێ نزیکەی ساڵێك مایەوە وخەڵکی زۆر بە

گەورە و خواناس لە قەڵەمیان دەدا، لەگەڵ ئەوەدا بەرگی سۆفی لابردو وەك خەڵكی تر كڵاوێكی كردەسەری و ماوەی حەوت ساڵ دووریگرت و گەشتیكرد بۆ خۆراسان و ئەودیو ڕووبار و سجستان و كرمان و ئینجا گەڕایەوە بۆ فارس و كەوتە قسەو بانگەواز و لێدوان بۆ خەڵك، ئینجا چوو بۆ ئەهواز و لەوێ خەڵكی پێشوازییانلێكرد و چوون بە دەمیەوە، ئینجا دووبارە چوویەوە بۆ بەسرە و پاش ماوەیەكی كەم لەوێوە بۆ جاری دووەم چوویەوە بۆ مەككە و هەمدی هاتەوە بۆ بەسرە و مانگێك لەوێ مایەوەو داوتر چوو بۆ ئەهواز و لەوێوە لەگەڵ كۆمەڵێك لە كەسە دیارەكانی ئەهوازدا چوو بۆ بەغداد و ساڵێك لەوێ مایەوە، ئینجا بڕیاریدا بچێت بۆ هیند تا لەوێ بانگەواز بۆ خوا بكات.

ئەبو قاسمی قوشەیری دەڵێت: كە عەمری كوڕی عوسمان لە مەككە بووە چووە بۆلای حەللاج، سەیر دەكات لە وەرەقەیەكدا شت دەنووسێت، عەمر پێی وت: ئەوە چیە؟ حەللاجیش دەڵێت: بەمە ڕكەبەری و بەرهەڵستكاری قورئان دەكەم. عەمر تووڕەبوو وە سەركۆنەی ئەبو یەعقوبی كرد كە بۆچی كچی پێداوەو لای خەڵكیش كەوتە دژایەتیكردنی حەللاج.

حەللاج كە چووە هیندستان لەوێ فێری جادووگەری بوو، ئەو دەیوت دەیەوێت بە جادووگەری بانگەواز بۆ ئایینی خوا بكات، ئاخۆ هیندستان پێگەی دێرینی جادووگەری و ئەفسانە و تەڵەكە سیحرییەكان بوو، حەللاجیش لە تێكەڵی ئایینەكانی ئەوێوە شتی وەردەگرت و فێری جادووگەری بوو، ئینجا دەیوت دەیەوێت ئایینی خوا بگەیەنێت، دیارە جادووگەریش بە یارمەتی جنۆكە

و شەیتانەکان دەبێت بە تێڕوانینی ئایینی ئیسلام و جادووگەریش لە ئیسلامدا و بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغە کراوە و حوکمی کوشتنی لەسەردراوە. ئەگەریش بیەوێت بۆ چاکە بەکاری بهێنێت، ئەوا لە ڕێگەیەکەوە کە خوا پێی خراپ بێت و پیس بێت چارەسەری خراپە ناکرێت، وەك چون لەبارەی (مەی) یەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت خۆی دەردە نەوەك دەرمان.

ئەو گەشتەی حەللاج بۆ هیندستان خاڵی گۆڕانی گەورە بوو لە ژیانی حەللاجدا، چونکە لەمەوبەدوا کارە ناباوەکانی حەللاج زیاتر دەبن.

حەللاج بۆ سوودوەرگرتن لە ڕێرەوەکان دەیدایە پاڵ دەستە جیاجیاکان، ئەو جارێك خۆی بە سوننە دەزانی و جارێك بە شیعە و جارێك سۆفی و...هتد.

لێرەدا کۆمەڵێك بیانوو دێننەوە کە حەللاج وتویەتی بۆ فێربوونی جادووگەری دەچمە هیندستان بۆ شاردنەوەی مەبەستی حەقیقی مەعریفی خۆی بووە، بەڵام ئەمە لە دوو لایەنەوە جێی قبوڵ نیە:

1- حەللاج هیچ کات ترسی نەبووە لەوتنی ئەوەی بڕوای پێیەتی.

2- دواتر بەڕوونی ڕۆڵی جادووگەری لە ژیانی حەللاجدا بەدیدەکرێت.

حەللاج کە لە سەفەری هیندستان گەڕاوەتەوە، تەمەنی نزیکەی (46)ساڵان بووە، ئینجا لە ماڵەوەی خۆیدا کەعبەیەکی بچووکی دروستکردووە و فتواگەلێکی جۆربەجۆری داوە، ئەمە بوویە هۆی ئەوەی حەللاج بەرەو دادگا ئاراستە بکرێت، دادگاییەکەیشی نزیکەی (8) ساڵی خایاند، واتە لە ساڵی (301) تا ساڵی (309ك) ئینجا دادگاییەکەی تەواو بوو.

حەللاج چوار تۆمەتی بەرەو ڕوو کراوەتەوە :

1- بوونی پەیوەندی لەگەڵ قەرمەتیەکاندا.

2- گوفتاری أنا الحق کە واتای داوای خوایەتی لەخۆدەگرت.

3- دەوروبەرەکەی وەك خوا سەیریاندەکرد.

4- فەتوادانی سەبارەت بە حەج.

لێرەدا پێویستە پیش ئەوەی باسی دادگاییەکە بکەین باسێکی ڕەوشی سیاسی ئەوکاتەی جیهانی ئیسلامی بکەین تا لەو دادگاییە تێبگەین.

لەوکاتەدا جیهانی ئیسلامی خۆی لە دوو دەسەڵاتی سەرەکی دەوڵەتی عەبباسی و دەوڵەتی فاتمیدا دەبینیەوە و دەسەڵاتگەلێکی تری وەك قەرمەتیەکانیش هەبوون، هەرچی عەبباسیەکانن سوننە مەزهەب بوون، بەلام شیعە بوەیهیەکان دەستیانگرتبوو بەسەر دەوڵەتی عەباسیدا و ڕۆڵی دەسەڵات و خەلیفەیان نەهێشتبوو، ئەمەش بەڵگەیە دژ بەوانەی کە دەڵێن عەبباسیەکان لە ترسی دەسەڵاتی خۆیان حەللاجیان کوشتووە، خۆ دەسەڵات لەدەست شیعەی بوەیهیدا بوو و ئەوانیش لەگەڵ نەیارانی عەبباسیدا خۆشیان دەهات. بەتایبەت کەسایەتیەکانی نەیاری سوننەگەرایی، ئیتر ڕۆڵی عەبباسی لەم مەیدانەدا چی بوو؟ بەڵکو بڕیاری دادگا لەدەست دەسەڵاتی عەباسی و بوەیهیەکاندا بەرتەسك نەبووبویەوە و ئەوەی لە دادگادا ڕۆڵی دەبینی زانایان بوون.

هەرچی فاتمیەکانی شیعەمەزهەب بوون دژ بە عەباسییەکان بوون و حەللاجیش هەواداریەکی بۆ خیلافەتی فاتیمی هەبوو وەك لە وتەیەکیدا بە ئاشکرا دەریدەبڕێت.

هەروەها قەرمەتیەکانیش شیعە بوون و هەرئەوانیش بوون بەردەڕەشی کەعبەیان بۆماوەیەکی زۆر بردو کوشتارێکی زۆری موسڵمانانیان کرد، کاتێکیش حەللاج لەخاچدرا بانگەواز دەکرا ئەمە یەکێکە لە بانگەشەکارانی قەرمەتی بیناسن.

بەڵام بوەیهیەکان لەبەر لاوازنەبوونی دەسەڵاتی خۆیان لەلایەن دەسەڵاتە شیعەکانی ترەوە ئامادەنەبوون پاڵپشتی تەواوی فاتیمی و قەرمەتی بکەن، هەر ئەمە وای لێکردن کێشەی حەللاج بەلای خۆیاندا سەرنەخەن.

هەروەها سەردەمێك بوو ئەفسانەو جادووی هیندی و بیری ئاگرپەرستی پێشووی ساسانی و فەلسەفەی لادەری یۆنانی و دەمارگیری مەزهەبی ناوخۆیی حەقیقەتی شەریعەتیان لەبەردەم جەماوەردا ئاڵۆز کردبوو، حەللاجیش سوودی لەهەموو ئەمانە وەرگرت. ئایا بەمەبەست بووبێت یان نا، یان ئایا مەبەستی باش بووبێت یان خراپ.

## دادگاییکردنی حەللاج

پێشتر وتمان حەللاج چوار تۆمەتی بەرەو ڕوو کرابۆیەوە کە بریتی بوون لە:

1- بوونی پەیوەندی بە قەرمەتیەکانەوە.

2- وتەی (أنا الحق) کە لێکدانەوەی داوای خوایەتی بوو.

3- شوێنکەوتەکانی بە خوایان دەزانی

4- لە بارەی حەجەوە ڕای پێچەوانەی بنەمای ئیسلامی هەبوو.

لەسالّی 299ك.دا بڕیاری گرتنی حەللاج درا، ئەو ساڵەیش ساڵی دامەزراندنی دەوڵەتی فاتیمی بوو لە مەغریبی ئیسلامی، بەڵام گرتنەکەی لە ساڵی 301ك و لە سوس لە ئەهوازبوو، هێنرا بۆ بەغداد و هاوار دەکرا بەناو خەڵکدا کە ئەمە یەکێکە لە قەرمەتیەکان بیناسن، حەللاج خرایە بەندیخانە، پاش ئەوەی برا بۆ لای وەزیر عەلی کوڕی عیسا و پاش دادگاییکردن خرایە بەندیخانە.

لە بەندینخانەدا بڕیاری سزای توندی سێ نیوە ڕۆژی درا، لە ماوەی بەندیخانەکەیدا ڕێی پێدەدرا تا خەڵکی ببینێت و ڕای خۆی بڵێت، تەنانەت ژوورێکی لەپاڵ بەندینخانەکەدا بۆ دروستکرا تا لەوێ وانەکانی خۆی بڵێتەوە، ئەمەش جێی سەرنجە لەوکاتەی دادگاکانی تەفتیش زانا گەردونی و زانستیەکانیان لە ڕۆژئاوادا لەسێدارە دەدا، لە ڕۆژهەلآت و لە جیهانی ئیسلامیدا کەسی تۆمەتبار بە نەیاریی ئاین و دەوڵەت ئەو مافەی هەبێت، خوێندکارەکانی هەوڵیاندا حەللاج بفڕێنن، بەڵام حەللاج ئامادەیی نەبوو، ڕایەکی تریش دژ بەمە

پێی وایە حەللاج پێشنیاری وای بۆ نەکراوە، بەڵام حـەللاج کـە سـیحرو جـادوی هیندی فێرببوو دەیتوانی خۆی دەربـاز بکـات، سـەر چـاوەکانیش لەوبارەیـەوە نمونەیان هێناوە.

لـە سـاڵی 309ك.دا حـەللاج لەسـەر داوای وەزیـر ئەبوحامیـد دادگـایی کرایەوە و دادوەران لەسەر دوو ڕابوون، ئایا بکوژرێت یان ئازاد بکرێت، ئەوانەی دەیـانوت ئـازاد بکرێـت داوایـان ئـەوەبوو داوای تەوبـە لـە هەڵـەکانی بکرێـت، دەستەیەکی تریش بە زندیقیان لە قەڵەمدەداو وتیـان تەوبـەی لـیٚ داواناکرێـت، هەڵوێستی ئیبن بـەهلول بـۆ داوای تەوبـەلێکردنی و هەڵوێسـتی ئـەبوو عومـەری حەممادی بۆ کوشتنی بوو.

ئـەو دادگاییـە بـەبیٚ بڕیـاری کۆتـایی تـەواوبوو، ئینجـا دادگاییـەکی تـر ئامادەکراو ئەمجار لە جیاتی زانا ئـیبن بـەهلول زانـا ئەبولحوسـەینی ئەشناسـی هـات، حـەللاج لەسـەر نوسـینەکانی دادگـایی کـرا، چـەند کەسـێکیش لـە دوورو نزیکانی خۆیشی شایەتییان لەسەردا.

لەمەسەلەی حەجدا حـەلاج فەتوایـەکی پێچـەوانەی بنـەماکانی شـەریعەتی نوسیبوو، ناچار بۆ خۆرزگارکردن وتی ئەوەی لە کتێبی (الاخلاص)ی حەسـەنی بەسری وەرگرتووە، بەڵام لەو کتێبەدا شتی وا نەبوو، دواجـار بڕیـاری کوشـتنی حەللاج دراو حەللاجیش هاواریکرد کە لە خوا بترسن خوێنم لە ئێوە حەڵاڵ نیە، بۆ ئەوەش دەیوت من نوسینم لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننەش هەیەو لـە بـازاڕی وەراقینە.

هەوادارانی حەللاج گومان لەسەر شایەتەکان و دادگاییەکە دروستدەکەن لە پێناوی ئەوەی بڵێن بە ستەم کوژراوە، نەیارانیشی بێ خەوشی دادگاییەکە دەخەنەڕوو، بەڵام لە ڕاستیدا دادگاییەکە بە ڕێژەی زیاتر دادگاییەکی ڕەوابوو، ئەگەر دەست تێوەردانی وەزیر ئەبوحامید نەبوایە کە کەمێك خەوشی خستە دادگاییەکەوە، زانایانیش زۆرینەیان لەسەر ئەوەن کە بڕیاری دادگا لەسەر حەللاج بڕیارێکی ڕەواو شەرعی بووە، کەمینەیەکی ناو سۆفیەکانیش ئەوە بە ستەم دادەنێن.

لە 23 زیلقەعدەی 309ك.دا حەللاج بە ئامادەبوونی خەڵك کوژرا، شێوەی کوشتنەکەشی بڕینی دەست وپێ و لەخاچدانی بوو، هەوادارانی حەللاج دەڵێن: لەژێر شوێنەکەیدا بە خوێنەکەی نوسراوە(الله) یان شتی تریش دەڵێن، هەروەها دەڵێن لێو بەخەندە بووە، لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەکان بەوپەڕی گومانەوە ئەو دەقانە دێنن و لە لایەنی زێدەڕۆیی هەوادارانی حەللاجەوە باسیان دەکەن.

هەروەها دەڵێن حەللاج نوێژی کردووە، نەیارانیشی دەڵێن نەخێر بەڵکو وتویەتی من ناکوژرێم و ماوەیەکی تر دێمەوە بۆ لاتان، واتا خۆی چواندبێت بە عیسا(علیەالسلام)ەوە. هەوادارانیشی وەك سامی مەکارم و ماسینیون بە سەرسامیەوە حەللاج دەچوێنن بە عیسای مەسیحەوە، پاشان جەستەکەی سوتێنراو پرژێنرا بە ناو ڕووباری دیجلەدا و سەریشی لەگەڵ دەست وپێیدا مانەوەو دوو ڕۆژ هەڵواسران و دواتر بۆ ساڵێك سەری لە کۆشکی خیلافەتدا هێڵرایەوەو لە 310ك.دا برا بۆ خوراسان.

هەوادارانی حەللاج ئاوی دیجلەیان بە پیرۆز سەیر دەکرد و دەیانخواردەوە بۆ مندالبون و سکپڕی، زۆرێکیشیان چاوەڕوانی هاتنەوەی بوون، بەڵکو هەندێکیان دەیانوت پاش چل ڕۆژ حەللاجیان لەسەر گوێدرێژێك بینیوە، ئەمەش شتێکی دوور و چاوەڕوان نەکراو نیە، چونکە جنۆکەکان هوندێکجار بۆ لەخشتەبردن بێت یان بۆ خۆشەویستی بێت خۆیان بە کەسێك دەچوێنن، وەك ئەوەی بۆ ئیمامی ئیبن تەیمیە ڕوویدا کە لەو کاتەی لە بەندیخانە بوو جنۆکەیەك لە خۆشەویستیدا خۆی بە ئیبن تەیمیە چواندبوو و وەڵامی پرسیاری کەسانێکی لەوپەڕی جیهانی ئیسلامیەوە دابوویەوە، کە ئەمە بە ئیبن تەیمیە وترا، وتی ئەوە کاری جنۆکەکانەو لەوە زیاتر لە ئیسلامدا جێی نابێتەوە، پێدەچێت بۆ حەللاجیش لەلایەن جنۆکەکانەوە ئەمە کرابێت تا مرۆڤەکان لە خشتە ببەن‌و دوچاری شیرکیان بکەن.

هەندێکی تریش کە نەیاری بوون سوپاسی خوایان دەکرد کە لە دەستی کەسێکی شێوێنەری بنەماکانی ئیسلام ڕزگاریان بووە، زانایانیش بوونە دوو ڕای جیاواز، زۆرینەیان بە سۆفیەکانیشەوە لە دژی بوون و بە کوشتنی ڕازیبوون، کەمینەیەکی ناو سۆفیش بە کوشتنی نا ڕازی بوون

## بەرهەمەکانی حەللاج

1- لماسين الأزل والجوهر الأكبر والشجرة الزيتونة النورية.

2- الأحروف المحدثة والأزلية والأسماء الكلية.

3- الظل الممدود والماء المسكوب والحياة الباقية.

4- حمل النور والحياة والأرواح.

5- الصهيون.

6- تفسير (قل هو الله أحد).

7- الأبد والمأبود.

8- قران القرآن والفرقان.

9- خلق الإنسان والبيان.

10- كيد الشيطان وأمر السلطان.

11- الأصول والفروع.

12- سر العالم والمبعوث.

13- العدل والتوحيد.

14- السياسة والخلفاء والأمراء.

15- عالم البقاء والفناء.

16- شخص الظلمات.

17- نور النور.

18- المتجليات.

19- الهياكل والعالَم والعالِم.

20- مدح النبي والمثل الأعلى.

21- الغريب الفسيح.

22- النطفة وبدء الخلق.

23- القيامة والقيامات.

24- الكبر والعظمة.

25- الصلاة والصلوات.

26- خرائن الخيرات.

27- العين.

28- التوحيد.

29- النجم اذا هوى.

30- الذاريات ذروا.

31- كتاب في أن الذي أنزل عليك القرآن لرادك الى معاد.

32- الدرة.

33- السياسة.

34- هوهو.

35- كيف كان وكيف يكون.

36- الوجود الأول.

37- الكبريت الأحمر.

38- السمري وجوابه.

39- الوجود الثاني.

40- لاكيف.

41- الكيفية والحقيقة.

42- الكيفية بالمجاز.

43- موائد العارفين.

44- خلق خلائق القرآن.

45- الصدق والأخلاص.

# بەشی سێیەم

## زیندووکردنەوەی بیری فەلسەفی

ئیسلام هەڵوێستێکی روونی هەیە بەرامبەر بە فەرهەنگی فەلسەفەی وەرگێڕاوی یۆنانیو فارسیو هیندی، ئەویش ئەوەیە ئەو خوێندنگەی سەرقاڵی فەلسەفەیەو لە سەروو هەموویشیەوە کیندی و ئیبن سیناو فارابی، درێژکراوەیەکی خوێندنگەی یۆنانی ئیغریقیەو بەرهەمێکی پوختی ئیسلامی نیە، ئیسلام لەو سەرچاوەی خۆیەوە رووەو هزری فەلسەفی ئیسلامی رێ دەبڕێ کە پێشەوا شافیعی بە کتێبی (علم أصوال الفقە) دەستی پێکرد، هەر لە رۆژی یەکەمەوە هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر فەلسەفەی مەشائی یۆنانی و فەلسەفەکانی تریش هەبووە، دەستەی رەسەنیەتی ئیسلامی هەڵوێستی راشکاوانەیان بەرامبەر بەو فەلسەفانە نواندووە.

ئیسلام بڕیاری خۆی داوە بەرامبەر بەو داروپەردوە زۆرەی فەرهەنگی پێش ئیسلام، ئیتر چ ماوەی بیری غەنووصی رۆژهەڵاتی یان بتپەرستی هێلێنی بێت، چونکە چەمكو واتای رەسەنی ئیسلامی ناگرێتەخۆو بە بەشێك لە فەرهەنگی ئیسلامی دانانرێت، بەڵکو ئیسلام هاتووە تا ئەو فەلسەفانە بەرپەرچ بداتەوەو ساختەو ناراستیان ئاشکرا بکاتو ئەو ئارەزووە مرۆییەی هەیە بۆ دەرچوون لە سنووری خوا و فیترەتی مرۆیی لەکاربخات، ئەو توێژینەوەی زانایانی موسڵمان کاریان لەسەر کردووەو پێشڕەوی ئەوانەش شافیعیو غەزالیو ئیبن تەیمیە، دواجار گەیشتنە نیشاندانی کەسێتیەکی تایبەتمەندی ئیسلامی لە بواری

مەعریفەو مەنتیقدا کە تەواو جیاوازە لەو چەمكو واتا یۆنانیە هێلینەی هێنرابوو، هەروەك ئەوەیان ئاشکرا کرد کە ئەو هەوڵەی ئیبن سیناو فارابی پێی هەستان لەپێناو نزیککردنەوە یان پەیوەستکردنی فەلسەفەی یۆنانی بە یەکخواپەرستی ئیسلام، هەوڵێکی شکست خواردوو بووەو نەیتوانیوە هیچ بەرهەمێکی هەبێت، چونکە هەوڵیداوە بتپەرستی یۆنانی و زانستی بتپەرستی بخاتە بازنەی یەکخواپەرستیەوە، پشتیشی بەستووە بە بڕێ سەرچاوە کە خراپیو نارەواییان سەلمێنراوەو دەستکاریکردنێکی زۆریشیان تێدا ئەنجام دراوە، ڕێبازی ڕەسەنی ئیسلامی ئەو داروپەردوەی وەلاناوە کە لە وەرگێڕاوی فەلسەفە یۆنانی و فارسیو هیندیەکان بوونو بڕیاری لەسەر داوە، جا کە سەردەمی نوێ هات، ڕۆژهەڵاتناسانو ڕۆژئاواگەراکانو شاڵاوی ڕۆشنبیری گەرموگوڕ لێنەوین بۆ زیندووکردنەوەی ئەو فەلسەفانەو ورووژاندنی پرسەکانی ئەو بوارەو وێناکردنی هزری ئیسلامی بە هزرێکی کاریگەربوو بە هزری یۆنانیو ئەو دیدەی دەڵێت ئەرستۆ لای موسڵمانان پلەوپایەیەکی بەرزی هەبووە، هەر لەو کاتەوەی ڕۆژهەلاتناسان هاتن تا توێژینەوە بکەن لە کەرەستکانی فەلسەفەدا، چەمكو واتایەکی ساختەیان دەسەپاند کە ئەویش ئەوەیە فەلسەفەی ئیسلامی فەلسەفەیەکی یۆنانیەو بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوەو دواتر کەسێ دێ نووسینەکانی ئەرستۆ وەردەگێڕێ بەو بانگەشەی ئەو فەیلەسووفە کاریگەری هەبووە لە هزر و شارستانیەتی ئیسلامیداو دەتوانێت ئەو ڕاپەڕینە نوێ بکاتەوە کە جیهانی ئیسلامی هاوچەرخ تیایدایە.

ئەم قسەیە راست نیە، بەڵکو هزری رەسەنی ئیسلامی بەرپەرچی ئەرستۆ و هەموو بیری یۆنانی دەداتەوە، بەڵکو پێی وایە بیری کۆمەڵگەی کۆیلایەتیەو تەواو جیاوازە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی، بەڵام رەوتی رۆژئاواگەری پشتگیری ئەو ئاراستە یۆنانیە دەکاتو زۆر کەس پێی لەخشتە براون، هەندێ لە رۆشنبیران پێیان وایە جاران هزری یۆنانی پێگەو کاریگەری هەبووە بۆ سەر هزری ئیسلامیو دەکرێت هزری رۆژئاوایی کاریگەری هەبێت لە هزری ئیسلامی نوێدا.

ئەمە بانگەشەیەکی زۆر مەترسیدارە کە دکتۆر تەها حوسەین بانگەشەی بۆ دەکات، ئەمە لووتکەی پیلانی دژ بە ئیسلامە، چاوەڕێی ئەوەش کراوە بزووتنەوەی رۆژئاواگەری و شاڵاوی رۆشنبیری لە سەردەمی نوێدا ئەو کارە ئەنجام بدات کە جاران بزووتنەوەی وەرگێرانی لە سەردەمی یەکەمی ئیسلامیدا پێی هەستا، لەبەرئەوەی هزری ئیسلامی بەردەوام ماوەی دوو سەدە یان زیاتر بەرنگاری هزری فەلسەفی یۆنانی بوویەوە،بۆیە ئەمڕۆ هەوڵ دەدەن هەمدی فەلسەفەی یۆنانی نوێ بکەنەوە، ئەو فەلسەفەی لای یۆنانیەکان بە فەلسەفەی بتەکان ناسراوە، فەلسەفەی مەجووسی و مەزدەکی و بابەکی و فەلسەفەکانی تری هزری غەنووصی رۆژهەڵاتی، گرنگیەکی زۆریشیان دا بەو فەلسەفە تەصەوفیەی کە پشت دەبەستێت بە وەحدەتولوجود و حلوول و ئیشراق، ئەو توێژینەوە کۆنانەی لە ژێر دراروپەردووی کۆندا بوونو موسڵمانان بەرپەرچیان دابوونەوەو ساختەیان ئاشکرا کرابوو، سەرلەنوێ زیندوو کرانەوەو سەرلەنوێ

چاویان پێدا خشێنرایەوە تا لەمرۆدا ئەو نووسینە ژەهراویانە بخەنەوە مەیدان کە هەوڵ دەدەن هزری هاوچەرخی ئیسلامی بە کەمتەرخەمیو ناتەواوی وەسف بکەن، چونکە لە بواری فەلسەفەدا جیاوازە.

ئەو هەوڵانە بەردەوامن و بە ناوی فەلسەفەی عەرەبی ناوزەد کراون تا لە داهاتووی فەلسەفەی ئیسلامیدا جێپێیەکیان هەبێت، هەموو ئەمەش لەپێناو تەنگهەڵچنین بە هزری ئیسلامی لەرێی فەلسەفە کۆنو نوێکانیشەوە، پێیان وایە شبلی شمبل رێی فەلسەفەی عەرەبی دەستپێکردووە کاتێك بانگەشەی کرد بۆ رێبازی داروینی، ئەو پەیامە توندە ماددیەی هێرش دەباتە سەر ئایینو ئەخلاقو بیروباوەڕو مەبەستی لەپێخستنی هزری نوێی ئیسلامیە، هزرێ کە لەرێی هزری رابردوویو ئیسلامیەوە پارێزراوەو دەرباز بووە لە شوێنەواری فەلسەفە بتپەرستی و ماددیەکانو بەپێی چەمكو واتای رەسەنایەتی ئیسلامی لە ژێر ناوی ئەهلی سوننەو جەماعەدا خۆی رێکخستووەتەوە، هەموو ئەو هەوڵانەی نوێ دەکرێنەوەو هەریەك لە جەمیل صلیبا و عەبدوڕەحمان بەدەوی و جۆرج یووحەننا و لویس عوز و زەکی نەجیب مەحموود و بانگخوازانی مارکسیەت و راڤەی ماددی بۆ مێژوو و بانگخوازانی بوونگەرایی رێبەری دەکەن، ئامانجیان یەك شتەو پێیان وایە هزری نوێی عەرەبی بیرێکی سەربەخۆ و جیایەو هیچ پەیوەندیەکی نیە بە ئیسلامەوە، بەڵکو لەدایکبوویەکی فەرەنسی و هەناردەی موژدەبەری مەسیحی لوبنانیە، بۆیە ئازادە تا دوور لە

ئیسلام هەنگاوی خۆی بنێو ئەزموونی هەڵمەتی رۆژئاوایی مارکس لیبرالی بوونگەرایی و ...هتد بگرێتەبەر.

لێرەوە کەوتنە هێرش بردنە سەر شافیعیو ئیبن حەنبەل و ئەشعەری و غەزالی و ئیبن تەیمیە، چونکە ئەوانە دڕکی چقڵی چاوی هەر هەوڵێکی تەنگهەڵچنین بە ئیسلام و بە رۆژئاواییکردنی هزری ئیسلامین و هەر ئەوانە رێی گەڕانەوە بۆ رەسەنایەتی هزری ئیسلامییان کردەوە، بێریارە موسڵمانەکانیش هەمدی ئەو ئەزموونەی ئەوان لەسەر هەمان ئەو بنەمایانەی ئیسلام دووبارە دەکەننەوە، وەك ئەوەی شێخ موستەفا عەبدورەزاق رێخۆشکەری بۆ کرد و دکتۆر سامی نەشار و موحەممەد عەلی زیبان هەنگاوی گەورەیان تێدا نا، ئەو خوێندنگەو شوێنکەوتەکانی رێی راستی ئیسلامیان گرتووەتەبەر.

لێرەوە پیلانێکی تر دەرکەوت کە ئەویش بێدەنگکردنی هەر کەسایەتیەکی هزری ئیسلامی بوو کە نەیاری فەرلسەفەی یۆنانی بێت، هاوکات زەقکردنەوەو بەرزراگرتنی هەموو ئەو ناوانەی کە ئالآهەلگری فەلسەفە بوون، ئیتر دەیان توێژینەوەیان لەبارەوە دەکرا، زۆربەشیان لە پێوەری رەسەنایەتی ئیسلامیدا دەرنەدەچوون، لە هەموان زیاتر ئەوانەی تۆمەتیان بەرەو رووە بریتین لە فارابی و ئیبن سینا.

جا ئەوەی نوێخوازانی فەلسەفەی کۆنی ئیسلامی نەیانخستووەتەڕوو ئەوەیە کە ئەو کەسانە ناوی مەشائیە موسڵمانەکانیان لێ نراوەو بە درێژەپێدەری فەلسەفەیو عەقڵی یۆنانی دادەنرێن، کۆمەڵگەی ئیسلامی بە

تەواوەتی لەناوخۆدا دەریانکردن وێنەی شاعیرانی بێڕەوشی وەك ئەبوونەواس و بەشار، بەڵکو کۆمەڵگە بە دەرچوو لە کۆمەڵگەی ڕەسەنی ئیسلامی داینان، تەنها ڕۆژهەڵاتناسان لەبەر ئارەزووی خۆیان بەرگرییان لەوانە کردووە، ئەویش بۆ ئەوەی ئەو فیتنەو گومانو ژەهرەی کە پێشتر فەلسەفەی یۆنانی خستیەڕوو و سریانەکان وەریانگێڕاو ویستیان بیبەنە ناو چەمكو واتای مەسیحیەتەوە، هەمان ئەمە لە کۆمەڵگەی هاوچەرخی ئیسلامی و هزری ئیسلامی نوێدا بخەنەوە ڕوو و تێکەڵ بە پەیامی بتپەرستی و فرەخودایی بنەونە لێدنی بنەمای یەکخواپەرستی کە پایەو کۆڵەکەی ئیسلامە.

یەکەم: کۆدەنگیەك لەسەر ئەوە هەیە هێنانی فەلسەفە بۆ نێو هزری ئیسلامی کۆشکی شارستانیەتی داڕووخاند، مۆرکێکی شوومو خراپ بوو و نەمانی دەسەڵاتی موسڵمانانی لێکەوتەوە، ئەوەبوو مەئموون جڵەوی خیلافەتی عەبباسی گرتە دەستو بووە هاندەری فەلسەفەو بازاڕگەرمی بۆ دەکرد و توانی دیارترین کتێبەکانی فەلسەفە لە یۆنانو صین و هیندەوە بهێنێت و کەسانی زۆر شارەزای وەرگێڕان لەە سریانی و کلدانی و سەنکریتی و فارسیەوە ڕاسپێرێت بۆ وەرگێڕانی ئەو کتێبانە.

ئیتر کارکردن لەسەر وەرگێڕانی ڕێچکەو ڕێبازە هێنراوەکان و ئازادانە وتنی هەموو ڕایەك خۆی نواند، لەو سەردەمەدا گومان بڵاوکرایەوەو نارەوایی بازاڕی گەرم بووو ڕەشەابەیەکیش لەو دیو ئەم بارەوە هەڵیکرد و ڕەچەتەی ڕێچکە جیاجیاکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت، بڕێ ڕەوت دەرکەوتن کە خەریك بوو

بیروباوەڕ و ئایینێکی نوێ بهێننە کایە، هێندەی نەبرد دەوڵەت لەبەردەم شالاوبەرانی تەتەر و مەغۆلدا تیچکشکا و پایەکانی رووخان، زۆرێك لە شوێنکەوتوانی ئەو رەوت و رێچکانەش بوونە پاڵپشتی دوژمن بۆ بەدیهاتنی ئەو ئامانجە(لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلامی).

ئیتر عەرەب بیروباوەڕی ئیمانی سورشتی و هێزی پوختی بیوباوەڕیان لەدەستداو ئایینیان دایە دەست برێ موتەکەلیم و کەسانی لەخشتەبراو تا چەند بەرگی رەنگاورەنگی بیروباوەڕی جیاجیا بکەنە بەری ئیمان‌و گومان‌و فیتنەو قسەو قسەلۆکی لێکەوتەوە.

دووەم: تۆمەتبارکردنی پێچەوا غەزالی بەوەی رێرەوی هزری و رۆشنبیری لای عەرەب وەستاندووە، ئەویش کاتێ بە توندی دژی فەلسەفەی ئیلاهی وەستایەوەو ساختەو ناراستیەکانی خستەڕوو.

لەراستیدا هەڵمەتێکی ورد و نەخشە بۆدانراو هەبوو تا موسڵمانان بانگهێشت بکات بۆ فەلسەفەی رۆژئاوایی و هانیان بدات ئەو رێ و ئامانجەی ئەوان بگرنەبەر، هاوکات موسڵمانانی بە دوواکەوتوو نیشان دەدا لەبەرئەوەی لەو کاتەوەی غەزالی فەلسەفەی وەستاندا ئیتر لە بواری فەلسەفەدا هەژار بون، بێگومان ئەمەش پیلانێکی سەرشێوێنیە، چونکە پێویست ناکات موسڵمانان شوێن ئەو فەلسەفانە بکەون لەبەرئەوەی ئەمان وەك ئەورووپیەکان پێویستیان نیە بەو فەلسەفانە، ئەورووپیەکان کە نەیانتوانیوە لە بیروباوەڕی خۆیانەوە پەیامی میتافیزیقی تەواو و دروست و رەسەن وەربگرن، چ لەرووی پەیوەندییان

لەگەڵ خوا یان پەیوەندییانلەگەڵ کەون یان تێگەیشتنی مرۆڤ لە رووی مرۆڤبوونیەوە، ئەمە کەموکورتی بیری هزری لاهووتی رۆژئاواییە، لە راستیشدا تەنها برێ راڤەی مرۆییەو هیچی تر، هزری رۆژئاوایی ناچار بوو بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکان ئەو رەوتو رێچکەو ئایدۆلۆجیایانە بسازێنێ، ئەمانەش بەدەم رەشەبای ئارەزووەوە بڵاوبوونەتەوە، ئیتر لە لیبرالیەتی تاکە کەسی یان فرۆیدی یان بوونگەرایی یان مارکسی و راڤەی ماددی و راڤەی ئابووری و راڤەی جنسی و راڤەی جوگرافی بۆ ژیانو مێژوو و شارستانیەت بێت، بەلام موسڵمانان رێبازێکی کامڵو تەواویان هەیە بۆ میتافیزیقیای کەونی و مرۆیی کە سەرچاوەکەی لە خواوەیە، لە هەمان کاتدا دەتوانێت ئاسایش و ئارامی و پێویستی مادی و تاسەی رۆحی دەروونی مرۆیی دابین بکات بێ ئەوەی هیچ لە کەموکورتی و هاوسەنگیەکەی کەم بکات، دوور لە هەر جۆرە زێدەڕەوی یان هەڵەی رەهبانیەت.

ئەو سەرسامیەی لە رۆشنبیری عەرەبیدا دەیبینین، لەو هاوارانەوە سەرچاوەی گرتووە کە شوێنکەوتوانی بیری رۆژئاوایی مەسیحی دەریدەبڕن، لە بواری هزری ئیسلامیدا موسڵمانان دەزانن بە هیچ جۆرێ پێویستیان نیە بەو هاوارە بەرزانەی داوای شێوازی فەلسەفە دەکەن، موسڵمانان شێوازی فەلسەفی بە شێوازێکی چاکو دروست نازانن، بەڵکو شێوازێکی قۆناغیە، لەوانەیە موسڵمانان بۆ ماوەیەك بەکاری بهێنن وەك لە سەرەتای سەردەمی ئیعتیزالدا بۆ بەرنگاربوونەوەی پەیامی مەسیحی و جوولەکەیی بەکاریان هێنا، یان

جەمالەدین و موحەممەد عەبدەو ئیقبال و کەسانی تر لە سەردەمی نوێی بێداریخوازی ئیسلامیدا بۆ بەرنگاربوونەوەی هەڕەشەی رۆژئاواگەری و شالآوی هزری بەکاریان هێنا.

بەڵام شێوازی دروستو رەسەن لای موسڵمانان بریتیە لە شێوازو بەرنامەی قورئانی، پێشەوا غەزالی خراپەو نارەوایی فەلسەفەی ئیلاهی خستووەتەڕوو، بەلام نەنەویوەتە فەلسەفەی بیرکاری و سروشتی و مەنتیق.

ئەمە تاوانێکە تا ئێستا نووسەرانی رۆژئاواو بانگخوازانی رۆژئاواگەری لێی خۆش نەبون، چۆن غەزالی بەرامبەر بیری بتپەرستی و زانستی بتەکان دەوەستێ و نارەواییان ئاشکرا دەکات و رێ نادات موسڵمانان تیایدا نغرۆ بن تا وەك چۆن جوولەکایەتی و مەسیحیەتی لەناوبرد ئاوا تەنگ بە موسڵمانانیش هەڵچنێ، ئەمە تاوانە گەورەکەی غەزالیە کە بەردەوام پیاوانی رۆژئاواگەری بێ وەستانو رۆژ دوای رۆژ دەیدەنەوە بەنێو چاوانی غەزالیدا.

لەراستیدا غەزالی هێرشی نەکردووەتە سەر ئەو فەلسەفە خواییەی کە لای یۆنانیەکان زانستی بتەکان بوو، بەڵکو دەڵێت ئەو زانستەی دەڵێت عەقڵ ناتوانێت شارەزای بابەتەکانی ئەودیو سروشت بێت، فەیلەسووفان ناتوانن بە بەڵگەی مەنتیقی ئیلاهیات بخەنەڕوو، بەڵکو بە گومان و مەزندەی نادڵنیا بڕیار دەدەنو بۆ راستی زانستی ئیلاهیان نیشاندانی زانستی ژمێریاری و مەنتیقی خۆیان بە بەڵگە دێننەوەو خۆ دەگەیەننە بیرلاوازن، با تەنانەت زانستە ئیلاهیەکانیان لەگەڵ بەڵگەکان بگونجێن و مەزندەیەك نەبێت و بەس وەك

زانستە ژمێرەییەکانیانئەو مادده پێوانەییەی بۆ بەڵگە لە مەنتیقدا بەکاری دێنن نەیانتوانیوە لە زانستی ئیلاهیاندا بەکاری بهێنن، بڕیاری عەقڵ لە بیرکاری و بابەتە سروشتیەکاندا راستە، بەلام لە زانستی ئەودیو سروشتدا تەنها عەقڵ ناتوانێت بە تەنها بگات بە دڵنیایی.

هەروەها دەڵێت مەسەلی سیفەتە خواییەکان و ئەزەلیو هەمیشەیی بوونی جیهان و لەناونەچوونی دەروونی مرۆیی بە تەرازووی عەقڵی مرۆیی پێوانە ناکرێت، بەڵکو عەقڵ بۆ تێگەیشتن لەوانە پێویستی بە پێناوێکی ترە کە ئەویش ئاشکراکردنی ناوەکی و ئیمانی دڵو سروشی دینیە.

دیارترین ناکۆکی غەزالی لەگەڵ فەیلەسووفاندا ئەوەیە کە پەیوەستە بە بابەتە خواییەکانەوە کە بنەڕەتێکی ئایینن.

غەزالی لە سێ مەسەلەی بنەڕەتیدا پێچەوانەی فەیلەسووفان دەوەستێت: سێ مەسەلە کە تیایدا فەلسەفەی یۆنانی پێچەوانەی پەیامی رەسەنی ئیسلامە(ئەگەرچی نزیکەی بیست هەڵەی ئەوانی ژماردووە):

یەکەم: پێشینەبوونی جیهان.

دووەم: خوا ئاگادار نیە بە وردەکاریەکان(خوای گەورە بەدوورە لەو نارەوا وتنەی ئەوان).

سێیەم: نکوولی کردن لە زیندووبوونەوە.

ئیسلام پێی وایە جیهان نوێیەو درووست بووە، تەنها خوا دێرینەو خوای گەورەش زانا و ئاگادارە بە هەموو وردەکاریەکان(وما تسقط من ورقة إلا يعلمها

ولا رطب ولا يابس إلا في كتاب مبين)، زیندووبوونەوەش حەقەو هیچ گومانێکی تێدا نیە.

غەزالی بەرنگاری ئەو راوبۆچوونانە بووەتەوە کە پێچەوانەی شەرعن، هێرشی کردووەتە سەر فەیلەسووفە دەهریەکان، ئەوانەی نکوولّی دەکەن لە بوونی بەدیهێنەر و پێیان وایە جیهان هەر هەبووەو هەموو جۆرە ئاژەڵەکان هەر لە دێرینەوە هەبوون، دەهریەکان زندیقن، هەروەها هێرشی کردووەتە سەر سورشتیەکان، ئەوانەی دەڵێن گیان دەمرێت و جارێکی تر زیندوو نابێتەوەو نکوولّی دەکەن لە بوونی رۆژی دوایی و پاداشتو سزا، هەروەها هێرش دەکاتە سەر فەیلەسووفە ئیلاهیەکانی وەك سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ، چونکە ئەوانە بڕوایان هەیە بە دێرینەبوونی جیهان و نکوولّی زیندووبوونەوە دەکەنو دەڵێن خوا ئاگاداری وردەکاریەکان نیە.

بەوجۆرە دەبینین ئەو هەڵمەتەی رۆژهەلاتناسان و بانگخوازانی رۆژئاواگەری لە سەردەمی نوێدا دەیکەن هەڵەو پڕوپووچە، ئەوانە راکەی غەزالی بە هەڵمەتێکی بێبنەما ناودەبەن، لەراستیدا غەزالی ئەوپەڕی ویژدان و دادپەروەری بەکارهێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا غەزالی بێبەش نەبووە لە گورزی دەستەی رەسەنایەتی ئیسلامی، ئەوەتا ئەبووبەکر ئیبنولعەرەبی کە یەکێکە لە شارەزاترین کەسان بە غەزالی دەڵێت مامۆستامان ئەبووحامید چووە نێو جەرگەی فەیلەسووفانەوەو دواتر ویستی بێتە دەرەوە، بەلام نەیتوانی.

ئامانجی غەزالی ئەوەبوو ڕێبازی فەیلەسووفان لە ئیلاهیاتدا پووچەڵ بکاتەوەو خەڵکی رووەو سەرچاوەی ڕەسەنایەتی راستەقینە ئاراستە بکات تا جوان لە میتافیزیقیا و ئەودیو سروشت تێبگەن، ئەویش بە تێگەیشتنی قورئانی پیرۆز، بۆیە ئاماژە بەوە دەکات فەیلەسووفان لە زانینی مەسەلەکانی ربووبیەتدا کەرەستەیان کەمەو تەنها ئایینی حەق دەتوانێت بەو شێوە رەهایەی ئارامی و دڵنیایی لەگەڵە لەو بوارەدا زانیاری دروست بە دەروونی مرۆیی بەخشێت.

سێیەم: فەلسەفەی ئەرستۆ:

موسڵمانان بە وردی بەرپەرچیان داوەتەوەو نەگونجانی لایەنەکانی ئەو فەلسەفەیان لەگەڵ ئیسلامو ڕێبازی ئەزموونیدا خستووەتەڕوو.

کاتێك رۆژهەلاتناسانو رۆژئاواگەران لە سەردەمی نوێدا ویستیان ڕێبازەکەی ئەرستۆ زیندوو بکەنەوەو دەنگۆیەکی گەورەی لەدەور بنێنەوە(تەها حوسەین و لوتفی سەید و ئیبراهیم بیومی مەدکوور) هزری ئیسلامی بە تەواوی ئەو چەمكو واتایەی تێکشکاندو زیاتر لەوەشی خستەڕوو، نارەوایی و ساختەو درۆی بانگەشەکارانی رۆژئاواگەری خستەڕوو کە دەیانوت ڕێنیسانسی رۆژئاوایی لەسەر پەیام و ڕێبازی ئەرستۆ دامەزرا، بەڵکو لە راستیدا دوای لەناوچوونو تێکشکانی پەیامی ئەرستۆ روویدا، بەڵکو کاتێ پەیامی ئەزموونی ئیسلامی گیرایەبەر ئەوکات رویدا، بیریارە رۆژئاواییەکان لە سەردەمی نوێدا بە هەمان چەکی دەستی موسڵمانان لە هەزار ساڵ لەمەوبەر بیری ئەرستۆیان

تێکشکاندووە، ئەو تێکشکاندنە لە دەرکەوتنی رێنیسانسی ئەورووپییەوە بوو کە پشتی بەستبوو بە رێبازی ئەزموونیی ئیسلامی، دواتر جارێکی دی رۆژئاواییەکان هاتن‌و کەوتنە لەخشتەبردنی موسڵمانان و ساختەکردنی زانستەکەیان و بانگهێشتیان دەکردن بۆ رێبازەکەی ئەرستۆ نەك بۆ ئەو رێبازەی کە ژیاری رۆژئاوایی خۆیان پێ بنیاد نا، ئەرستۆ پیلانێکی گەورەی سەردەمی وەرگێران بوو لە سەردەمی نوێیشا بەکارهێنرا، رۆژهەڵاتناسان‌و رۆژئاواگەرە شوێنکەوتەکانیان تا توانییان ئەو پیلانەیان قۆستەوەو دژ بە ئیسلام بەکاریان هێنا.

لە توێژینەوەی پوختی زانستیەوە دەردەکەوێت کە بانگەشەی شەپۆلی رۆژئاواگەری بۆ لەناوبردنی رەسەنایەتی ئیسلامی چەندە خراپ‌و ناڕەوایە، چونکە لە راستیدا مەنتیقی ئەرستۆیی کە گوازرایەوە بۆ جیهانی ئیسلامی، تەنها لە خوێندنگە مەشائیە ئیسلامیەکاندا کاریگەری هەبوو: خوێندنگە شرۆڤەکاران (کیندی و فارابی و ئیبن سینا، خوێندنگەکانی تر کە زادەی رەسەنایەتی ئیسلامی بوون تەواو دووربوون لە ئەزموونەکانی مەنتیقی ئەرستۆیی، بەڵکو مەنتیقێکی تەواو جیاوازیان هەبوو لە مەنتیقی ئەرستۆیی چ لە رۆحیەت و چ لە وردەکاریەکانیدا.

زاڵبوونی مەنتیقی ئەرستۆ کاتێك دەستی پێکرد کە لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا هزری ئیسلامی پەرت بووو تێکەڵ بوو بە زانستەکانی یۆنان، لەگەڵ ئەوەشدا فیقهناسانی دواتر و موتەکەلیمە ئەشعەریەکان لە لایەك و زانایانی

سەلەف لەلایەکی ترەوە ڕێیان نەدا ئەو مەنتیقە بەکاربێت‌و بە توندی دژایەتییان کرد، دواتر فەیلەسووفە مەشائیەکان لە بازنەی هزری ئیسلامی دەرچوون چ لە ڕووی ڕۆحی و چ لەڕووی دەقەوە، هەروەها لە ڕووی بیروباوەڕ و هزری‌و ژیانیشەوە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی چوونە دەرەوە، ئیتر ماوەیەکی زۆر بوو فەلسەفەی مەشائی لە جیهانی ئیسلامیدا مرد، دەرفەتی زیندووبوونەوەشی نەبوو ئەگەر هەوڵەکانی ڕۆژهەڵاتناسان‌و ڕۆژئاواگەران نەبوایە کە ئامانجیان لەناوبردنی ئیسلام بوو لەناوخۆوە، ئەویش بە نانەوەی دووبەرەکی و دروستکردنی دەستەو ڕێچکەی کۆنی فەلسفەی و زیندووکردنەوەو زاڵکردنیان لە زانکۆو خوێندنگەکاندا وەك ڕێبازێکی زانستی سەرشێوێن.

لە سایەی ئەم ئاراستەی ڕۆژهەلاتناسانەوەو دواتر پاشکۆیی بانگخوازە ڕۆژئاواگەراکانی وەك تەها حوسەینەوە ئەو ئامانجە دەرکەوت کە تەها حوسەین ڕاشکاوانە دەڵێت:

(پێشینانمان فەلسەفەی یۆنانیان وەرگرت -فەلسەفەو ژیاری ئەورووپا کە درێژەپێدەری فەلسەفەی یۆنانیە- بۆیە پێویستە ئێمەش هەموو شتێ لەو خوێندنگە ئەورووپیەوە وەربگرین).

ئەم بانگەشەیە هەر لە بنەڕەتدا بێمانایەو چی بەڵگە هەیە دژیەتی، چونکە موسڵمانان بیری یۆنانیان نەکردووەتە بنەمای بیرکردنەوەیان، بەڵکو بەرپەرچیان داوەتەوەو ناراستی ئەو ڕێبازەیان خستووەتەڕوو، پاشان لەمڕۆشدا هەمان هەڵوێستیان هەیە بەرامبەر هزری ڕۆژئاوایی کە زادەی بیری یۆنانیە.

دیاره مەنتیقی نوێی هزری رۆژئاوایی کە لەسەر بنەمای لەناوبردنی مەنتیقی ئەرستۆ دامەزراوە، لە سەدەی سیانزەی زاینیدا دەستی پێکرد، کاتێك موسڵمانان رۆحی زانستیو بیرکارییان گواستەوە بۆ ئەورووپا، ئەمەش لە رێی رۆجەر بیکۆن کە بانگەوازی کرد بۆ رزگاربوون لە رێبازی ئەرستۆ چونکە ئەو رێبازە لاواز و بێتوانا بوو، رۆجەر وتی دەتوانین بە بیرکاری بەڵگە بهێنینەوە بۆ هەر پێویستیەکی زانستی سروشتی، تۆماس ئەکوینیش سەرلەنوێ فەلسەفەی ئەرستۆی هێنایەوە.

چوارەم: ئەو هزرە یۆنانیەی کە فەیلەسووفە موسڵمانەکان (کیندی، ئیبن سینا، فارابی) پشتیان پێ دەبەست سەرچاوەکەی دروستو ساغ نەبوو، بەڵکو لەو بەراوردکاریانەی کە لەم دواییانەدا ئەنجام دران توێژەران جەخت لەوە دەکەنەوە ئەو دەقە فەلسەفیانەی وەرگێردرانە سەر زمانی عەرەبی هەمان فەلسەفەی رەسەنی یۆنانی نەبوون، بەڵکو تێکەڵەیەکی فەلسەفەو چەمکە سریانیە مەسیحیەکان بوو، دواتر برێ هەڵەی زۆرو دەستکاریکردنی زەقی تێکەوت، ژمارەیەکی زۆر لە توێژەران ئاماژەیان بەمە داوە، ئیسماعیل مەزهەر پێی وایە ئەو رۆشنبیریەی وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی هەمان رۆشنبیری دروستی ئیغریقی نەبوو، بەڵکو وێنەیەکی مەسیحیەت بوو کە لە رێی یەعقووبی و نەستووریەکانەوە رەنگێکی ئیغریقی پێدرابوو، ئەمەش لە کاتی بانگەوازیان بۆ بیروباوەڕی مەسیحیەت لە رۆژهەڵاتدا، ئەمانە فەلسەفەی یۆنانییان کردە رێیەك بۆ گەیاندنی بیروباوەڕی خۆیان.

دکتۆر عەبدوڕەحمان مەرحەبا دەڵێت وەرگێڕان لە زمانی یۆنانیەوە بۆ عیبرانی و لە عیبرانیەوە بۆ سریانی و لە سریانیەوە بۆ عەرەبی واتاکانی لە راستی خۆی شێواندو ناتەواویەکی وای سازاند کە لە کەس نادیار نیە، بەڵکو وەرگێڕانەکان بوونە سەرچاوەی بەدەستهێنانی سامان نەك خۆشەویستی زانست، وێڕای ئەوەی وەرگێڕانیان بەکاردەهێنا بۆ سەرخستنی رێبازو رەوتی خۆیان، دکتۆر عومەر فەرووخ دەڵێت زۆربەی ئەوانەی وەرگێڕانیان دەکرد مەسیحی یەعقووبی و نەستووریەکان بوون و گوڕوتینی ئایینیان لەسەروو سپاردەکاری زانستیانەوە بوو، بۆیە دەستکاری وشەو ماناکانیان دەکرد.

هەڵەیەکی زەق‌و رەقیان کە کاریگەری زۆری هەبوو ئەوەبوو کە کتێبی ربووبیەت درایەوە پاڵ ئەرستۆ، کاتێك فارابی ئەو کتێبەی بینی و پێی وابوو هی ئەرستۆیە، هەستا بە نووسینەوەی بیردۆزە ناودارەکەی خۆی لە گونجاندنی راکانی ئەفلاتون‌و ئەرستۆدا و لەوەشدا پشتی بەست بەو کتێبە، هەرکە دەرکەوت ئەو کتێبە هی ئەرستۆ نیە، بەڵکو چەند بەشێکی وەرگێراو یان پوختکراوەی نووسینەکانی ئەفلاتوون‌و دوورن لە رۆحیەتی ئەرستۆ، خێرا فارابی کەوتە هەڵەوەو بیردۆزەی گونجاندنەکەی دارما، ئەو فەلسەفەی کە فارابی و ئیبن سینا هەوڵیاندا دایمەزرێنن تێکەڵەیەکی فەلسەفەی ئەرستۆیی‌و ئەفلاتۆنی نوێ بووو هەوڵەکەشیان شێواو و ناتەواو بوو، بەڵام ناونرا فەلسەفەی ئیسلامی.

لێرەوە دەزانین چۆن چەندەها بڕیاری فارسی و بتپەرستی و مەسیحیو جوولەکەیی خزێنراونەتە نێو هزری ئیسلامیەوەو هەوڵیانداوە بەپێی کاتو سەردەم خۆیان تێکەڵ بە بیری ئیسلامی بکەن.

پێنجەم: بیری یۆنانی گاڵتەی دەکرد بە ڕێبازی ئەزموونی، بەڵام بیری ئیسلامی ڕێبازی ئەزموونی گرتبوویەبەر، بەمەش مرۆڤایەتی بردە قۆناغێکی نوێوە لەکاتێکدا بیری یۆنانی ئەوەی پێ نەکرا.

موسڵمانان زۆر بە بێخەمی و بەوپەڕی متمانەوە ڕێبازی ئەزموونیان داناو ئەو بەربەستەیان تێکشکاند کە بیری یۆنانی لەبەردەمیدا چۆکی دادابووو لە ئاست مەنتیقی وێنەییدا وەستابوو، بەمەش موسڵمانان دیدو هزریان کردە بەڵگەی عەقلی و بەڵگەی ئەزموونیش، ڕۆجەر بیکۆن گەورەیی ئەو هەنگاوە گەورەی مێژووی مرۆڤایەتی تۆمار کردووەو فەرزڵەکەش دەگێڕێتەوە بۆ موسڵمانان.

دیارترین تایبەتمەندی ڕێبازی ئەزموونی ئیسلامی ئەوەیە کە ڕێبازی درك پێکردن یان ڕامانیە، بیریارانی ئیسلام بە چاکی درکیان بەوە کردبوو کە دەبێت ڕێبازێکی توێژینەوە دابنرێت جیاواز لە ڕێبازی یۆنانی، چونکە ڕێبازی یۆنانی دەربڕی ژیارێکی پێچەوانەو وێنایەکی ژیاری پێچەوانە بوو.

ڕێبازی ئەزموونی جیاکاری کرد لەنێوان ڕێبازێك کە گاڵتەی دەکرد بە ئەزموونو تاقیکردنەوەو ئەرستۆ گەورەترین ڕێبەری بوو، لەگەڵ ڕێبازێ کە بانگەوازی دەکرد بۆ ئەزموونو تاقیکردنەوەو ئەمەش لە ڕۆحی خودی

قورئانەوە وەرگیرابوو کە بانگەوازی دەکرد بۆ زانستی بوونێکی کرداری دوور لە توێژینەوە لە بوونی خوا، بەڵکو سەرقاڵ بە توێژینەوە لە بەدیهێنراوەکانی خوا، بۆیە هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر مەنتیقی ئەرستۆ یان هزری یۆنانی زادەی دژایەتیەکی خۆبەخۆ نەبوو، بەڵکو جەختکردنەوە بوو لە خودێتی و رۆحیەت و رەسەنایەتی و خاوەن مۆرکی تایبەتی هزری ئیسلامی، بۆیە موسڵمانان سەرقاڵی کرۆك یان ماهیەت یان ئەو وێناکردنانە نەبوون کە فەلسەفەی یۆنانی خۆی پێوە سەرقاڵ کردبوو، بەڵکو سەرقاڵی تایبەتمەندیەکان بوو، ئەمەشیان لە شێوەیەکی تەواوکاریدا ریزبەند کردبوو، ئەمە کرۆکی ناکۆکۆیەکە بوو کە رق‌و نەگونجانی بەرامبەر بە مەنتیقی ئەرستۆ هێنایە کایە، چونکە مەنتیقی ئەرستۆ لەگەڵ ریشەی رەسەن‌و بنەڕەتی رەسەنی ئیسلامیدا نەدەگونجا کە ئەویش یەکخواپەرستیە، ئەمەش زادەی ئاسۆبینی تەسك یان دەمارگیری مەزهەبی نەبوو.

لێرەوە بانگەوازی رێی بزاڤی رۆژئاواگەری بۆ توێژینەوە لە جیهانی غەیب لە رێی عەقڵەوە، بانگەشەیەکی تەواو نەیارە بە پەیامی یەکخواپەرستی ئیسلامی، ئەگەر ئیسلام رێی نەداوە لەسەر بنەمای هزری یۆنانی لێکۆڵینەوە بکرێت لە بواری میتافیزیقیدا، ئەوا بەرنامەیەکی تەواوو کامڵی داوە بە موسڵمانان بۆ شارەزابوون لەودیو دنیای بینراو هەر لە سەرەتای دروستبوونەوە تا کۆتایی ژیانی دنیا و دوای ژیانی دنیا و پاداشت‌و سزای رۆژی دواییش، هەروەك وێنەیەکی ئەودیو کەونی بەخشیوە، بەمەش تاسەی مرۆڤی بۆ

تێگەیشتن لەو جیهانانە شکاندووەو کردوویەتی بە بنەڕەتێ بۆ تێگەیشتن لە پەیامەکەی و بەرپرسیارێتی و گەڕانەوەی بۆ لای خوا، عەقڵیشی پێداوە تا لە چوارچێوەی توانای راستەقینەیدا هەنگاوی راست بنێ بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکی خۆی، ئیسلام لەم روانگەوە ئەوەی نیشانداوە کە عەقڵی مرۆیی بە سروشتی خۆی ناتوانێت بگاتە ماهیەت، بۆیە قورئان برێ مەسەلەی ئەودیو سروشتی بە تەواوی دیاری کردووەو داوای کردووە لەوە زیاتر لەسەری نەڕۆن، بەڵکو مرۆڤ لە توانای عەقڵی خۆی زیاتر نەڕوات، ئەمەش بنەماکەیە (بیر بکەنەوە لە بەدیهێنراوەکانی خوا، بەڵام بیر مەکەنەوە لە زاتی خوا ئەگەرنا بە هیلاکەتا دەچن).

توانای عەقڵیش بریتیە لە بیرکردنەوە لە جێدەستەکانی دەسەڵاتی خوا کە گەورەیی خوا نیشان دەدات، ئەمەش بە هەست پێکردن دەبێت، ئیتر زات و ماهیەت لە سەروو توانای عەقڵەوەیە، بۆیە سروشی بۆ نێردراوە تا ببێتە روونکەرەوەو رێنیشاندەری مرۆڤ.

(توێژینەوە لە تایبەتمەندیەکان نەك توێژینەوە لە ماهیەت)

ئەمە رێنماییەکی ئیسلامی قورئانیە کە سەرچاوەی هەنگاونانو کارێکە کە موسڵمانان پێی گەیشتونو هەموو نەوەکانی پێشوو نەیانتوانیوە بەدیبهێنن کە ئەویش بریتیە لە بەدیهێنانی رێبازی ئەزموونی.

لێرەوە بانگەوازێ کە ڕۆژئاواگەران بانگەشەی بۆ دەکەن و بریتیە لە توێژینەوە لە جیهانی غەیب لە ڕێی عەقڵەوە، تەواو پێچەوانەی چەمكو واتای یەکخواپەرستیە.

حەوتەم: ڕۆژهەڵاتناسانو بانگەشەکەرانی ڕۆژئاواگەری بانگەشەی ئەوە دەکەن کاتێك مەنتیقی ئەرستالیسی وەرگێڕدرا، پێشوازی لێکرا و کاریگەری جێهێشت لەسەر هەمو بوارەکانی ئیسلام (ئەمە قسەی ڕۆژهەڵاتناسانەو تەها حوسەینو لوتفی سەید و ئیبراهیم مەدکووریش دووبارەی دەکەنەوە).

لەراستیدا ئەمە پێچەوانەی ئەو واقیعەیە کە ڕوویداوە، چونکە ئەوانەی بیری یۆنانیو مەنتیقی ئەرستۆتالیسیان قبوولّ کرد بریتی بوون لە شرۆڤەکارانێ کە ڕێرەوی مەشائیەکانی ئەمڕۆیان گرتبوویەبەر، ئەوانەی بە مەشائیە موسڵمانەکان ناسراون و دیارترینیان بریتی بوون لە کیندی و فارابی و ئیبن سینا.

بەڵام زانایانی موسڵمان لە بواری ڕەسەنایەتیدا بە تەواوەتی بەرپەرچی ئەو بیرو مەنتیقەیان داوەتەوەو ئەوەیان خستووەتەڕوو کە مەنتیقی ئەرستۆتالیسی ڕێبازی توێژینەوەیە لە زانستی هزری و فەلسەفی یۆنان، ئەو مەنتیقە وردترین دەربڕینی ڕۆحی یۆنانیە لە دیدو ڕوانینی بۆ کەون و هەوڵی زیندووکردنەوەی ڕێبازی یۆنانی سەبارەت بە بوون، ئیسلام بە سەختی ئەو زانستانەی یۆنانی فڕێ داوەو بە سەختی دژایەتی دەکات، چونکە ڕۆحی ئیسلامی لە کەشو ڕەگەزێکی جیاواز و وێنایەکی نوێی ژیاریەوە بنەماکانی خۆی وەرگرتووەو تەواو

دووره له دیدی هزری یۆنانی بۆ میتافیزیقیا و فیزیا و بوارەکانی تر، بۆیه به دڵنیاییەوه ڕێبازێکی توێژینەوه جیا له ڕێبازی یۆنانی هەیه، بنەما و بنەڕەتەکانی خۆی له ژیاری زانستی خۆیەوه وەرگرتووەو بووەته مۆرکو تاکه کرۆکی ئەو ژیاره بنەڕەتیه.

زانایانی موسڵمان ئەوەیان ئاشکرا کردووه که فەیلەسوفه مەشائیەکانی ئیسلام وەك بازنەیەکی جیاو کەنارگرتوو له ڕەوتی گشتی هزری ئیسلامی وان، نوێنەرانی ڕاستەقینەی ئیسلامیش بریتین له فیقهناسو ڕەسەنایەتی خوازەکان و بیریارانی ئیسلامی، ئەوانەی دژی ڕێبازی یۆنانی و مەنتیقی ئەرستۆتالیسین، دکاۆر نەشا دەستی گەیشتووه به هەندێ بەڵگەنامەی ئەو زانایانه که تیایدا ساختەکاری ڕۆژهەڵاتناسان و شوێنکەوته پیلانگێڕەکانیشیان دژ به ئیسلام دەردەکەوێت، ئەوانەی بانگەشەی موسڵمانبوونیان دەکرد کەچی بیری خۆیان لەسەر بنەمای مەنتیقی یۆنان دانابوو، موسڵمانان توانیویانه گەورەترین دۆزینەوه پێشکەش بکەن که دواتر جیهانی ئەورووپی وەریگرت، ئەویش ڕێبازی ئەزموونی ئیسلامی بوو له تەواوترین و دروستترین شێوەیدا.

هەروەها دەڵێت موتەکەلیم و ڕەسەنخوازانی یەکەم بەهیچ جۆرێك هیچیان له مەنتیقی ئەرستۆتالیسیەوه وەرنەگرتووەو هەوڵیانداوه مەنتیقیێکی نوێ بنیاد بنێن، فیقهناسانی ئەهلی سوننەو جەماعه به تەواوەتی هەڵوێستی دژایەتییان گرتووەتەبەر بەرامبەر مەنتیقی ئەرستۆتالیسی و بەڵکو مەنتیقی یۆنانی به گشتی، بەڵکو هەندێ لەوانه هەندێ بەڵگەی گومانخوازانی یۆنانییان

خستووەتەڕوو و هەندێ بەڵگەی تریان بۆ زیاد کردووە، هەروەها ئاماژە دەکات بە شرۆڤەکارە ئیسلامیەکان کە درێژەپێدەری عەقڵی هیلینی بوون لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەو دەزووەی لەگەڵ بیرکردنەوەی مەنتیقی ئیسلامی پەیوەستی دەکردن تەواو خەیاڵی بوو، بۆیە کۆمەڵگەی ئیسلامی بە تەواوەتی فرێی دانە دەرەوەی خۆی.

دکتۆر نەشار دەڵێت ئەو بیرۆکەی دەڵێت موتەکەلمین کەسانێکی ئایینی بوون‌و مەنتیقی ئەرستۆیان لە مشتومڕی لاهووتییاندا بەکارهێناوە، قسەیەکی نارەوایە، مەنتیقی ئەرستۆ لەلایەن قوتابخانەی کەلامیەوە تا سەدەی پێنجەمیش وەڵامی درایەوەو دەستە کەلامیەکانی موعتەزیلەو ئەشعەری و شیعەش هێرشیان دەکردە سەر، ئیبن تەیمیە دەڵێت پاش ئەوەی ئەو رێچکە هات و موسڵمانان بە چاوی خۆیان کەموکورتیەکانیان زانی کەوتنە رەخنەلێگرتنی و لە پێوانی عەقڵی‌و شەرعیاندا لایان بەلادا نەدەکردەوە، ئیبن قەییمیش ئەمە دەڵێتەوە، ئیبن خەلدوونیش دەڵێت موسڵمانان بۆ بواری بیروباوەڕ هیچ سوودیان وەرنەگرتووە لە پێوانە یۆنانیەکان.

چەندین کتێب نووسراون سەبارەت بە رەخنە لە مەنتیقی ئەرستۆتالیسی، لەوانەش:

کتێبی (الدقائق)ی ئەبوبەکری کوڕی تەیب.

کتێبی (الآراء و الديانات) ی ئیبن نەوبەختی.

نووسینەکانی ئەبووعەلی جەبائی و ئەبووهاشم و قازی عەبدولجەبار سەبارەت بە رەخنەگرتن لە مەنتیقی ئەرستۆیی.

ئەبولعەبباسی ناشیئی موعتەزیلی دەڵێت: سیرافی بە ئیبن بیشر مەتای کوڕی یوونسی وت ئەم ناشیئە ئەبولعەبباسە رەخنەی لێگرتون و رێی ئێوەشی گرتووەتەبەر و لەنێوتاندایەو لاوازتان دەخاتەڕوو، کەچی تا ئەمڕۆ نەتانتوانیوە یەك قسەش وەڵامی بدەنەوە، تەنها ئەوەندەتان پێ ئەکرێت بڵێن ئامانجو نیازی ئێمە نازانێت.

## ئیبن حەزم:

ئیبن حەزم رەخنەی گرتووە لە مەنتیقی ئەرستۆ و کتێبێکی لەو بارەیەوە نووسیوەو ناوی ناوە (التقریب لحود المنطق) (صاعید لە طبقات الامم دا باسی کردووە)، تیایدا هونەری قسەکردن لەسەر روونکردنەوەی مەعریفەکانی خستووەتە بەرباس، تیایدا چەند نموونەو بەڵگەی شەرعی بەکارهێناوەو راشکاوانە لە هەندێ بنەڕەتدا دژایەتی ئەرستۆی کردووە.

غەزالیش هێرشی کردووەتە سەر مەنتیقی ئەرستۆ.

ئیمامولحەرەمین جوەینی هێرشی کردووەتە سەر مەنتیقی ئەرستۆ.

لوتفی سەید کە مامۆستا نەوەی رۆژئاواگەریە درۆیەکی زەق دەکات و دەڵێت:

(فەلسەفەی ئەرستۆ لای پێشین بە سینەیەکی فراوانە پێشوازی لێکرا و خەلیفەو کەسانی دیاری ناو زانایانی موسڵمان سوودیان لێ وەرگت و بوونە جێگرەوە ئەرستۆ و نوێنەرانی رێبازی مەشائیەکان)

جا نارەوایی ئەو روانینە روون دیارە، چونکە زانایانی موسڵمان بە جارێ مەنتیقی ئەرستۆ و فەلسەفەی یۆنانیشیان بەرپەرچ داوەتەوە، لەبەرئەوەی لەگەڵ پەیامی یەکخواپەرستیدا یەکناگرێتەوە، لەکاتێکدا پەیامی یەکخواپەرستی پایەو بنەڕەتی ئیسلامە.

حەوتەم: هەڵوێستی پێشەوا ئیبن تەیمیە لە بەرنگاربوونەوەی فەلسەفەی مەشائیدا لووتکەی گرتووە، راشکاوانە رایگەیاندووە هزری ئیسلامی مەنتیقێکی تایبەتی خۆی هەیە کە وەرگیراوە لە قورئان‌و سوننەتی موحەممەدیەوە، لەمەوە ئەو مەنتیقە نوێیەی لێ وەرگرتووە کە ناوی ناوە مەنتیقی ئیسلامی، ئەو مەنتیقەی کە بەهۆیەوە موسڵمانان بێباك دەبوون لە عەقڵیەتی رۆژئاوایی لە بڕیادران لەسەر شتەکان و بەرچاوروونی و رامانی فەلسەفیدا، بەڵکو بەرپەرچی مەنتیقیەکانی داوەتەوە، ئەوانەی کە بەهۆی کاریگەری بیرو مۆرکی یۆنانیەوە عەقڵی خۆیان کردووەتە بڕیاردەر و کەناریان گرتووە لە وەرگرتنی رێنمایی لە فەلسەفەو مەنتیقی قورئان و سوننەت.

مەنتیقی ئیسلامی لە قورئانی پیرۆزدا خۆی دەنوێنێ، ئیتر موسڵمانان لە مەسەلەکانی هزرو بڕیاردانی دروستدا بێباکن لە مەنتیقی یۆنانی و شێوازو ناو و پەیڕەوی ئەو هزرەدا، ئیبن تەیمیە دەڵێت ئەو بەڵگە عەقڵیە ئیلاهیانەی لای

پێشەوایانی ئەهلی کەلام و فەلسەفە هەن، قورئان بە حەق و راستی و تەواتر و دروستتر و بەهێزتر خستوویەتیە روو دوور لەو هەڵانەی ئەوان تێی کەوتون.

ئیبن تەیمیە رێبەری هەموو ئاراستە نوێکانی رەخنەگرتنە لە مەنتیقی ئەرستۆ، هەر لە ئەرجالۆن فرنسیس باکونەوە تا مەنتیقیەتی وەزعی، ئیبن تەیمیە گرنگیەکی زۆری داوە بە رەخنەگرتن لە فەیلەسووفانی ئیسلام (فارابی و ئیبن سینا و ئیبن روشد)و هەرکامێکی تر کە وێنەی ئەوان هەوادارە بە مەنتیقی ئەرستۆ، بەڵکو رێبازی خوێندنەوەی ئیسلامی خستووەتەروو، ئیتر ئەو مەنتیقە هەر لە سەرهەڵدانیەوە لەسەر دەستی موسڵمانان تا ئەوپەری پێگەیشتن‌و پێشرەوی دەخاتەڕوو، دواتر برێ زێدەکاری دەکات بۆ بەشەکانی ئەو رێبازە ئیسلامیە کە خۆی بە پشت بەستن بە رۆحی قورئان‌و سوننەت دایهێناوە، ئەمەشی لە کتێبەکەیدا (الرد علی المنطقیین) خۆی دەنوێنێ، ئیبن تەیمیە پێی وایە هزری ئیسلامی بەرپەرچی مەنتیقی ئەرستۆیی دەداتەوە، مەنتیقێ کە لەسەر بنەمای قیاس و بەڵگەخوازی نەزەری دامەزراوە، بەڵکو مەنتیقێکی نوێی دانا کە تایبەتمەندیەکانی خۆی جوانتر دەردەبڕی، ئەویش رێبازی هەستەوەریی ئەزموونیی بوو.

ناکۆکی نێوان ئەرستۆ و ئەفلاتوون دەخاتەڕوو، هەوڵی مەشائیە موسڵمانەکان دەخاتەڕوو کە کاریان شرۆڤەی فەلسەفەی یۆنانی بووە تا بتوانن گونجاندنێ لەنێوان ئەرستۆ و ئەفلاتووندا بکەن، ناکۆکی نێوان ئەو هەوڵەو نێوان بیروباوەڕی ئیسلامیش دەخاتەڕوو، بێتوانایی ئەو هەوڵەش روون

دەکاتەوە (هەوڵەکانی فارابی و ئیبن سینا)، دوابڕوای ئەزموونی پێچدان لەنێوان ئیسلام و ئەفلاتونی نوێدا روون دەکاتەوە، پێی وایە ئامانج لەوە لەناوبردنی ئیسلامە لەناوخۆوە، هێرش دەکاتە سەر موتەکەلمین و بە پێچەوانە جوولانەوەی قورئانو سوننەت تۆمەتباریان دەکات، لاوازی ئەو بەڵگانەیان دەخاتەڕوو کە دەیانویست بەوانە نەیارەکانیان بدوێنن، هەوڵ دەدات گونجاندنی نێوان عەقڵو ئایین بخاتەڕوو، بەڵام نەك لەسەر بنەمای ئەوەی عەقڵ هاوواتای فەلسەفەی یۆنانی بێت، بەڵکو پوختەی بۆچوونی ئەوەیە کە دیدی راشکاوی عەقڵ پێچەوانەی صەحیحی نەقڵ (قورئان و سوننەت) نیە، راکەی رازی و غەزالی بەرپەرچ دەداتەوە کە دەڵێن ئەگەر عەقڵ و نەقڵ پێکەوە نەگونجان ئەوە با عەقڵ پێش نەقڵ بخرێت، چونکە هەرکەس ئەو بانگەشەیە بکات تانەی داوە لە پێغەمبەر(ﷺ)، مەنتیقی ئیبن تەیمیە جێ پەنجەی روونی لە زۆر ئاراستەی مەنتیقی نوێدا جێهێشت، ئەو ئاراستە نوێیانەی مەنتیقی ئەرستۆ دەخەنەڕوو، بەتایبەت مەنتیقی ماددی بیکۆن و هیگل و مەنتیقی ریازی راسل و مەنتیقی سایکۆلۆجی.

موستەفا عەبدوڕەزاق دەڵێت توێژینەوەی مەنتیقیەکان ئەگەر لە سەردەمی ئیبن تەیمیەوە لەسەر هەمان ریبازی ئەو لە رەخنەگرتن بەڵکو لە شرۆڤەو قووڵبوونەوەدا بەردەوام بوونایە، ئەوا ئێستا گەیشتبووینە لووتکەیەکی زۆر بەرز.

ئیبن تەیمیە لە وەڵامدانەوەی مەنتیقگەرا یۆنانیەکان و شوێنکەوتە فەیلەسووفگەرا ئیسلامیەکاندا بە گەورەترین نوێنەری رۆحی ئیسلامی بەرامبەر بە فیتنەی یۆنانی دادەنرێت.

ئیبن تەیمیە رەخنە دەگرێت لە مەنتیقی ئەرستۆیی‌و زۆر بە بەهێزی تێکی دەشکێنێت، پێی وایە وا بۆ ئیسلام باشترە چەمك‌و دەستەواژە فەلسەفـو مەنتیقیەکان بەکار نەهێنێت، ئیبن تەیمیە نکووڵی لەوە دەکات حەد لە مەنتیقی ئەرستۆیی بتوانێت بگاتە کرۆك یان ماهیەتی مەسەلەکان، پیی وایە کارو ئەرکی حەد بریتیە لە جیاکردنەوەی نێوان مەحدوودو جگە لەخۆی، ئیتر حەد ناتوانێت وێنای حەد بکات.

ئیبن تەیمیە رەخنە دەگرێت لە پرسە ئەرستۆییەکان و پێی وایە ئەزموون‌و خوێندنەوەو پێوانی تەمسیل نارەوایە، بەڵکو قورئانە وێنەی بەڵگەخوازیمان پێ نیشان دەدات‌و تەرازوو و پێوانی بەڵگەییمان پێشکەش دەکات.

لایەنی نەگونجانی هزری ئیسلامی و هزری یۆنانی دەخاتەڕوو و دەڵێت گەورەترین هەڵە ئەوەیە بڵێیت پێکگەیشتنێ لەنێوان فەلسەفی یۆنانی بتپەرستی و هزری یەکخواپەرستی ئیسلامیدا هەیە با پێکگەیشتنێکی لاوەکیش بێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی رێژەیی دوورمەودا و جیاوازی لە بنەڕەتە گشتیەکاندا.

یەکەم: ئیسلام بڕوای وایە عەقڵی مرۆیی ناتوانێت بگاتە ماهیەت و کرۆکی شتەکان، قورئان هەڵوێستی ئێمەی سەبارەت بە مەسەلەکانی ئەودیو سروشت

دیاری کردووه، داوای لێکردوین تاو نەدەینە ئەودیو سروشت، بەڵکو گەڕان بەدوای کرۆکێکدا واز لێبهێنێن کە ناتوانین تەنها لە ڕێی عەقڵەوە بگەین بە حەقیقەتی، بەڵکو بگەڕێین بەدوای تایبەتمەندیەکاندا و بە هیچ جۆرێك نەچین بە دوای ماهیەتدا، ئەمەش لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خۆی دەنوێنێ کە دەفەرموێت (فکروا في خلق الله و لا تفکروا في ذات الله فتهلکوا)، (بیر بکەنەوە لە بەدیهێنراوەکانی خوا، بەڵام بیر مەکەنەوە لە زاتی خوا، ئەگەرنا بە هیلاکەتا دەچن).

دووەم: میتافیزیقیای یۆنانی بەرهەمێکی زاتیەو لەسەر تاکگەرایی و وێنای تایبەتی دژ بە ڕۆحی ئیسلام وەستاوە، فەلسەفەی یۆنانی کردارێکی زاتی بوو کە لەگەڵ بواری کۆمەڵایەتیدا ناگونجێ.

سێیەم: جیاوازی قووڵو ڕوونی نێوان پەیامی قورئان بۆ تەنهاییو کارایی خوا و نێوان پەیمی فەلسەفەی یۆنانی، لە ئیسلامدا خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو هەر خۆی هەموو شتێکی لە نەبوونەوە بەدیهێناوەو سەرەتا و کۆتایی سەردەمیشی دیاری کردووە، ئەمەش تێکشکاندنی چەمكو واتای فەلسەفەی یۆنانیە کە دەڵێت مادده دێرینو پێشینەو لەناوچوونی نیە.

وێڕای ئەمەش قورئان بە هیچ جۆرێك چەمكو واتاکانی جێنەهێشتووە. بەڵکو بنەمای تەواوەتی بۆ داناوە، ئەوەی قورئان بڕیاری لەسەر داوە زیاتر لەلایەن عەقڵەوە قبووڵ کراوەو لە فیترەتیشەوە نزیکترە.

خوای گەورە زەوی و ئاو و شاخو داخی بەدیهێناوەو ئەمەی کردووەتە سەکۆیەکی شانۆیی بۆ مرۆڤێ کە لە خۆڵ دروستی کردووەو رۆحی بەبەردا کردووەو هەموو ناوەکانی فێر کردووەو هانیداوە تا لەم کەونەدا دۆزینەوە بکات، بەرپرسیارێتی تاکە کەسی و پابەندی ئەخلاقیو لێپێچینەوەو پاداشتی رۆژی دواییشی بۆ داناوە.

نۆیەم: قورئان بەڵگەی بوونی خوای پێشکەش کردووە، ئەمەشی لە چەند شێوەو بەرنامەی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەدا نواندووە:

أ: بەڵگەی کەونی کە لەسەر بنەمای روانین لەم جیهانە وەستاوە.

ب: بەڵگەی شیکاری عەقڵی (أم خلقوا من غیر شيء أم هم الخالقون).

ج: بەڵگەی هەڵێنجراوی زانایان کە لە قورئانەوە وەرگیراوە، لەو ئایەتانەی باسی پێغەمبەر ئیبراهیم دەکاتو پوختەکەی بریتیە لەوەی گۆڕانی ئەو شتانەی کە دەیانبینین بەڵگەن لەسەر روودان و نوێبوونیانو پێویستە بەیدیهێنەرێك بەدیهێنابن کە لەوان نەچێت.

دەیەم: هەریەك لە بیروباوەڕی ئیتیحاد و وەحدەتولوجود:

بیروباوەڕی ئیتیحاد لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێت، چۆن دەکرێت توانەوەی بەدیهێنەر لەناو بەدیهێنراو یان نغرۆبوونی بەدیهێنراو لەناو بەدیهێنەردا گونجاو بێت! هیچکام لەوانە ئاسایی نین، بۆیە ئیسلام رەخنە لەم بیرە مەسیحیەتە دەگرێت کە بیرۆکەی حلوولی هەیە، هەمان رەخنەش لە سۆفیگەرایی دەگرێت، ئیسلام لەگەڵ بیروباوەڕی وەحدەتولوجودیش ناگونجێت، چونکە ئەمە

جیابوونەوەیە لە بیروباوەڕی ڕەسەنی ئیسلامی (لا اله الا الله)، هەروەها لەگەڵ پەیامی تەصەوفی فەلسەفیش ناتەبایە (لە راستیدا هیچ بوونێ نیە جگە لە خوا) هەریەك لەوانە ئەنجامی تەواو پێچەوانە بەوی تری لەخۆگرتووە.

تەصەوفی فەلسەفی کاریگەر بووە بە توێژینەوە میتافیزیقیەکانی فیدای هیندی و ئیشراقی فارسی و فەیزی ئەفلۆتینی.

بەڵام تەصەوفی سوننی پێچەوانەی تەصەوفی فەلسەفی ڕێی گرتووەتەبەر و دیدو بیری خۆی لە قورئانو سوننەتەوە وەرگرتووە، هزری ئیسلامی بەهۆی تەصەوفی سوننیەوە پاسەوانی دیدەبان (زەمیر) ی بێدار راگرتووە، ئەورووپا بەم دواییانەو لەسەر دەستی بتلەری ئەخلاقی ئینگلیزی ئینجا بەمە گەیشت.

یانزەهەم: دەبێت ئاماژە بدەین بە رۆڵی پیاوانی رەسەنایەتی ئیسلامی لە سەردەمی نوێدا کە چۆن بەرنگاری مەترسی نوێکراوەی گەردەلوولی فەلسەفەی یۆنانی و رۆژئاوایی نەیار بە یەکخواپەرستی ئیسلامی بوونەوە، ئەم ئاراستەش لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە شێخ موستەفا عەبدوڕەزاق رایگەیاند فەلسەفەی ئیسلامی لە فیقهی ئیسلامیەوە دەست پیێ دەکات، قسەکە ئەوەیە کە کتێبی (علم أصول الفقه) ی شافیعی مونەتەلەقێکی ئەو ئاراستەیە بوو و شافیعی لە هزری ئیسلامیدا هاوتای ئەرستۆیە لە بیری یۆنانیدا، کیندی و فارابی و ئیبن سینا و ئیبن روشد و ئەوانی دیش نوێنەرایەتی رەسەنایەتی ئیسلامی ناکەن، بەڵکو درێژەپێدەری رێی مەشائیە یۆنانیەکان بوون، زۆر زیاد چووبن لە شرۆڤەکاری فەلسەفەی یۆنانی دەرناچن، نووسینەکانی زانستی ئصولی فیقە و

موتەکەلمین بریتیە لە فەلسەفەی ئیسلامیو ئەوەیان سەلماند کە مەنتیقی ئەرستۆتالیسی کە ڕێبازی ژیار و بیری یۆنانیە لە خوێندنگە عەقڵیە نوێکاندا قبووڵ نەکراون، بەڵکو ڕێبازی ئەزموونی کە ئەورووپا دوای سەدەیەك لە دەرکەوتنی ژیاری نوێی ئینجا پێی گەیشت، ئەمە ڕێبازی ئیسلامەو جیاوازە لە ڕۆحی ژیاری یۆنانی.

دوانزەهەم: بیری ئیسلامی بە سروشتی پێکهاتەو سەرچاوەو خودێتی تایبەتی خۆی کە لەسەر بنەمای یەکخواپەرستی و پێغەمبەرایەتی و پەیوەندی نێوان عەقڵو دڵ وەستاوە، لەبەردەم بیری مرۆییدا کراوەیە، هاوکات دەتوانێت بێ ئەوەی تێکەڵ بێت بەو بیرانە خۆی بپارێزێت، لێرەوە کە بیری ئیسلامی لەسەر بنەمای یەکخواپەرستی و ئەخلاقو بنیادی ڕێبازی فیکری دامەزراو لەسەر عەقڵ و سروشیش دامەزراوە، ناتوانێت لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیدا تێکەڵ بێت، چونکە فەلسەفەی یۆنانی لەسەر بنەمای بتپەرستی و کۆمەڵگەی کۆیلایەتی و بەرزراگرتنی عەقڵو پەرستشی جەستە دامەزراوە، وێڕای ئەوە ئەو فەلسەفەی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی هەمان فەلسەفەی یۆنانی نەبوو، بەڵکو دەستکاریەکی زۆری وەرگێڕانەکە کرابوو و دەقەکان شێوێنرابوون، ئەمەش لەپێناو خزمەتکردن بە ئامانجی موژدەبەری مەسیحیەت، لێرەوە هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە نارەزایی لەڕوودا نیشان درا، هەرچەندە دەستەیەك لە فەیلەسووفە موسڵمانەکان هەوڵیان دەدا فەلسەفەی یۆنانی بخەنە ناو بازنەی ئیسلامەوە، بەڵام هەوڵەکە بە تەواوەتی شکستی خوارد، ئەمە لە کاتێکدا

رەوتێکی دژ بە فەلسەفەی یۆنانی دەرکەوت و گەشەی سەند و هێندە بازنەی خۆی فراوان کرد تا بووە نوێنەری هەموو بیری ئیسلامی و بانگخوازانی وەرگێڕانو شرۆڤەی بیری یۆنانی کەنار خست.

ئەو نەیاری و بەرنگاربوونەوەی سەرەتای لێدانی تەواوی چەمكو واتا فەلسەفیە یۆنانیەکان بوو، ئەو چەمكو واتایەی لە مەسەلەی یەکخواپەرستی و رەوشتو بنیادی خودی کۆمەڵگەشدا لەگەڵ ئیسلامدا نەدەگونجا.

هەموو ئەمانە جەخت لەوە دەکەنەوە ئەوەی تەها حوسەین و لوتفی سەید و ئیبراهیم بیومی مەدکوور دەیڵێن گوایە مەنتیقی ئەرستۆ زاڵبووە بەسەر هەندێ بزانەی هزری ئیسلامیدا راست نیە، لە سەردەمی نوێشدا دکتۆر نەشار ئەو راستیەی لە کتێبەکەیدا (مناهج البحپ عند مفكرى الآسلام) خستووەتەڕوو و بە جوانی ئەوەی سەلماندووە بیریارانی ئیسلام مەنتیقی ئەرستۆتالیسییان قبووڵ نەکردووەو دژایەتییان کردووەو رەخنەیان لە هەموو بەشەکانی گرتووە. هەروەها دەرکەوت ئەو بیرۆکەی دەڵێت موسڵمانان مەنتیقی یۆنانییان وەرگرتووەو کردوویانە بە رێبازێ بۆ توێژینەوەکانیان بیرۆکەیەکی ناڕاستە، چ ئەم تێگەیشتنەی پاڵپشت بە بەڵگە لێنەویوە خەونی رۆژهەڵاتناسی و بزافی رۆژئاواگەری لەپێخستووە.

# بەشی چوارەم
# زیندووکردنەوەی بیری شعووبیەت و باتینی
## باسی یەکەم
## پیلانی باتینی

بیری شعووبیەت و باتینی بیرێکی مرۆییە کە دوای سەردەمی وەرگێڕان دزەی کردە نێو ئاسۆی ئیسلامەوە، ئەمەش کاتێك فەلسەفە فارسیو هیندیو یۆنانیەکان وەرگێڕدران و تێکەڵ بوونو هەوڵیاندا تەنگ هەڵچنن بە هزری ئیسلامی و زاڵ بن بەسەر بەها بنەڕەتیە ئیسلامیەکاندا، ئەو بیرە مرۆییە ماددیە بتپەرستیە هەر لە کۆنەوە خۆی ڕێکخستبوو و توانیبووی کار بکاتە سەر ئەو چەمكو واتایانەی کە ئایینی مووسا و ئایینی عیسا پێشکەشیان کردبوو، بەڵکو هەوڵیاندا ئەو ئایینانە ڕووەو تەئویل و بیانوو بۆ هێنانەوەو دەرچوون لە ڕێساکانی ئایینی حەق بەرن، ئەو هەوڵە بەرامبەر هزری ئیسلامیش گیرایەبەر و توانی لەلایەن بانگخوازانی لادەری بوارە جیاجیاکانی بیروباوەڕ و ئەدەبو سیاسەتەوە پاڵپشتیەك پەیدا بکاتو دواتر گۆڕا بە برێ پیلانی مەترسیدارو بانگەشەی وێرانکەر کە هەڕەشە بوون بۆ کیانی دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵام هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە ئەو بزاڤە تووشی بەرنگاربوونەوە بوو و بیریارانی موسڵمان بەرنگاری بوونەوەو کەوتنە لێدانیو ئاشکراکردنی ساختەکاریەکانی، ئەو بەرنگاربوونەوەیە ماوەی دوو سەدە بەردەوام بوو تا بە تەواوەتی پاکتاو

کرایەوەو رەسەنایەتی ئیسلامی پلەو پێگەی خۆی بۆ گەڕایەوە، ئەو پلەو پێگەی لە قورئانو سوننەتی صەحیحەوە وەریگرتبوو، ئیتر ئەو بزافە شعووبیەتە بوو بە چیرۆك و بەسەرهاتێکی مێژوویی، بەلام پیلانی رۆژئاواگەری و شالاوی رۆشنبیری هەر لە سەرەتای سەردەمی نوێوە هەوڵدیا ئەو بیرە زیندوو بکاتەوەو لە بواری هزری موعتەزلی و صۆفیگەری و فەلسەفیەوە کەوتە گوومان نانەوە، ئیتر نووسینەکانی رۆژهەلاتناسان و بانگخوازانی رۆژئاواگەری کەوتنە بەرگری کردن لە باتینیەت و قەرمەتیو زەنجەکانو ئەو بزافە گومڕایانەیان بە بانگەوازی چاکسازی ناوزەد دەکردو وەك شۆڕش بە ناوی ئیسلامەوە ناوزەدیان دەکرد، بەڵکو رۆژهەلاتناسی و رۆژئاواگەری زۆر لەوەش زیاتر چوون و ئەهلی سوننەو جەماعەیان تۆمەتبار دەکرد و لە رێز و گەورەیی ئەو موجاهیدە چاکەکارانەیان کەم دەکردەوە یان چاویان لە ئاستدا دادەخست، ئەو موجاهیدانەی بەرامبەر بەو پیلانە مەترسیدارە راوەستان، بڕێ کتێب دەرکەوتن کە ئەو بیرە باتینیە شعووبیەیان زیندوو دەکردەوەو سەرلەنوێ دەیانخستەوە روو و بەرگرییان لێدەکردو گەنجانی رۆشنبیریان پێ لەخشتەدەبرد، وەك بیرێکی سەربەخۆی جیاواز لە بارو دۆخ و پەرچەکردارەکانی دەیانخستەروو، دەکرێت سەرلەنوێ لە سەردەمی نوێدا وەك بیرێکی هاوچەرخی پێشکەوتنخوازی بخرێتەوەڕوو، ئەمەش ئەوپەڕی هەوڵی بانگخوازانی رۆژئاواگەری و شالاوی رۆشنبیریە بۆ شێواندنو ساختەکاری و بلاوکردنەوەی ژەهری نەیارانی ئیسلام، ئەمەش دوای ئەوەی پێشتر بەهۆی

بەرنگاربوونەوەی لەگەڵ فیترەت و زانست و ئایین‌و حەقیقەتداشکستی خواردبوو.

ڕۆژئاواگەراکان دابەش بون بەسەر بوارەکانی ئەدەب و مێژوودا، دەبینن ئەوانەی نووسینەوەیان لە ئەبوونەواس و بەشار بن برد و حەماد عەجرەد و موتیع بن ئیاسەوە دەست پێکردەوەو ئەوانەش کە کەوتنە خستنەوەڕووی بزافەکانی قەرمەتی و زەنج و راوەندی و موقنع خوراسانی و بابەکی خورەمی، ئەوانەیان وەك بانگخوازانی چاکسازی دەناساند.

کەسانێکیش هەبوون هەوڵیاندەدا مێژووی حەلاج و سەهرەوەردی زیندوو بکەوەو کتێبەکانی ئەوان‌و کتێبە پڕ لە ژەهرەکای ئیبن عەرەبی زیندوو بکەنەوە، هەروەها هزری ئیخوانوصەفا و پەیامەکانیان زیندوو بکەنەوە، ئیبن سینا و فارابی و رازی و کەسانی تر وەك ڕێبەرانی دیاری فەلسەفەو فیکر نیشان بدەن.

بێگومان زیندووکردنەوەی ئەو بیرە مەبەست لێی شێواندنی هزری ئیسلامیە بەو بتپەرستی و ماددەگەرایی و بێرەوشتیەی هەبووە تا ئیسلام نەتوانێت بە دروستی بیروباوەڕی ڕەسەنی خۆی بخاتەڕوو، زیندوو کردنەوەی ئەو هزرانە بانگەشەیەکیش بوون بۆ شیوعیەت و بانگەوازی صەهیۆنی و جوولەکەیی جیهانی کە ئاڵاهەڵگری ئیسرائیلیە کۆن و نوێکانن.

بێگومان ئەو ڕەوتانە ئارەزووبازیەکی مەترسیداریان پێیە بۆ ئەو دەروونە گومڕا و نەفسە ساکارانەی جوان لە ئایین‌و ئیمان تێنەگەیشتون، چونکە

نیازیانە ئەرك و پابەندی ئەخلاقی و ئەنجامدانی فەرزەکانی ئیسلام لەکار بخەن و تاوان کردن و رۆچوون لە ئارەزووەکان بکەنە پیشە، ئەم بیردۆزانە چاکەو خراقەو تەقوا و بێرەوشتی و بەرزی و پەستی لێك جیا ناکەنەوە، چونکە مەبەستیانە دوو بیروباوەڕی بهێننە ناو ئیسلامەوە کە ئیسلام قبووڵیان ناکات، ئەوانیش بریتین لە بیرۆکەی جەبر(تۆپزی) و زوهد(دنیانەویستی)، بۆ ئەمەش تەئویلی قورئان دەکەن بە جۆرێ لەگەڵ بنەما باڵاکانی قورئاندا نەگونجێت، لێرەوە بە پێویست زانرا بەرنگاری ئەو مەترسیە ببنەوەو ساختەکاریەکانی ئاشکرا بکرێن.

چەمكو واتای مەترسیداری باتینیەت و شعووبیەت کە دزەی کردبێتە ناو ئیسلامەوە هەمان وتەکانی عەبدوڵای کوڕی سەبەئی جوولەکە بوون کە بڵاوی کردنەوە، ئەو هاتە ناو ئیسلامەوەو پەیامی رەجعەو وەصیەی بڵاوکردەوە، دەیوت هەر پێغەمبەرێ وەسصیەکی هەیە، هەروەك بیرۆکەی حەقی خودایی بڵاوکردەوە کە بیردۆزەیەکی فارسی بوو و ئیسلام دانی پێدا نانێت، ئەمەش سەرەتای کردنەوەی دەرگای تەئویل بوو، دواتر پیلانەکە کوشتنی عومەری کوڕی خەتتابی خەلیفەی موسڵمانانی لێکەوەتەوە لەسەر دەستی یەکێك لە دوژمنانی ئیسلام (فارسو جوووڵەکە) ئەبوولوئلوئە کە فارسێك بە دیل گیراوی نەهاوەند بوو و بوو بە مەملووکی موغیرەی کوڕی شوعبە، هورمزان گەورەیەکی فارسە پیلان گێڕەکان بوو، کوژرانی عومەر پێشەکیەك بوو بۆ کوشتنی عوسمان، پەیامەکانی عەبدوڵای کوڕی سەبەئیش کاریگەری گەورەیان هەبوو لە

رێخۆشکەری بۆ ئەو کوشتنە، بەڵکو ئەو بیرانەی کە عەبدوڵای کوڕی سەبەئو سەبەئیەتیش دوای ئەو لە ئاسۆی ئیسلامدا بڵاویان کردەوە، شوێنەواری قووڵی هەبوو لە دەرکەوتنی هەردوو بزووتنەوەی شعووبیەت و باتینی، ئەوەبوو بیری مانەوی لەژێر ناوی جیاجیادا خرانەڕوو تا سەرلەنوێ لە ئاسۆی ئیسلامیدا بخرێنەروو، بەمەش ئەو باڵە پیلانگێڕیەی نەیارانی ئیسلام پێکهات کە پێشتر لەرووی سیاسیەوە نەیانتوانیبوو لە رووی سیاسیەوە دەوڵەتی ئیسلامی بڕووخێنن ئەمجار هەوڵیاندا لەرێی گوڕزی هزریو شێواندنی بیروباوەڕی ئیسلامیەوە دەوڵەتی ئیسلامی بڕووخێنن، ئەو بیروباوەڕانە فەلسەفە و ئاینەکانی پێشوویان لەخۆگرتو توانییان پەیامەکانی مەجووسی و مانەوی و زەردەشتی زیندوو بکەنەوە، بە هێنانی ئەو بیرانە بۆ نێو ئاسۆی ئیسلام گومانی گومانکەلێکی زۆریان نایەوە، هەموو ئەوانەش بانگەوازێ بوون بۆ وێرانکردنی کرۆکی ئیسلام کە یەکخواپەرستی پوخت بوو، هەوڵی لەناوبردنی شەریعەتی ئیسلامی بوو، ئەو شەریعەتەی خاوەنی سنوور و رێسا و ئەخلاقیات و بڕوابوون بە بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پاداشتی رۆژی دواییە.

دواجار ناوی زندیق و باتینی و شعووبیەت نرا لەو بزووتنەوانە، ئەم ناوەش لە پەیامەکەیانەوە وەرگیرا، بەلام لە راشتیدا پیلانی ئەوان دژ بە ئیسلام زۆر گەورە بوو و بواری زۆری لەخۆدەگرت.

ئەو بزووتنەوەیە برێ ژەهر و گومانو بیری رووخێنەری دوورماوەی پێشکەش کرد بە هزرو کۆمەڵگەی ئیسلامی تا گومان بنێتەوەو دەروونەکان بشێوێنێت:

یەکەم: برێ فەرموودەی ناراستی هەڵبەست بە دەم پێغەمبەری خواوە کە تیایدا حەرامەکان حەڵاڵ و حەڵاڵەکان حەرام دەکران تا ئەوەی یەکێك لە سەرکردەکانیان کە عەبدولکەریم بن ئەبیلعەوجاء بوو و پێش مردنی نا بە تاوانەکەیدا وتی چوار هەزار فەرموودەم هەڵبەستووە، تیایدا حەرامم حەڵاڵ کردووەو حەڵاڵم حەرام کردووە.

دووەم: برێ چەمكو واتای بیروباوەڕ پێشکەش کرنا پێچەوانەی پەیامی یەکخواپەرستی ئیسلامی، ئیتر پەیامیدوانەخوایی مەجووسیەت بێت یان پەیامی مانەوی بێت کە بڕوای هەیە بە خوای رووناکی و خوای تاریکی.

سێیەم: بیرۆکەی شیوعیەتی رەهای لە ژنو سامان و بێروشتی نێو خەڵکی بڵاوکردەوە.

چوارەم: بنەمای پیرۆز راگرتنی فەرمانڕەوای خستەڕوو، ئەمەش زادەی بیردۆزەی حەقی خواییە کە هەڵگرانی پێیان وایە فەرمانڕەوا حوکمو دەسەڵاتی خۆی لە خواوە وەرگرتووەو سێبەری خوایە لەسەر زەوی.

پێنجەن: بانگەشەی دەکرد بۆ نەهێشتنی فەرزە ئایینیەکانی وەك نوێژ و زەکاتو رۆژوو و حەج و مەی خواردنەوەو ئارەزووبازیو هاوسەرگیری لە گەڵ خوشك و کچیشی رەوا دەکرد.

شەشەم: بانگەشەی ئەوەی دەكرد هەموو شتێ رووكار و ناوەڕۆكی هەیەو هەموو پەیامێكی دابەزیویش تەئویلێكی هەیە، لەپاڵ تەئویلیشدا دەرچوون لە سنوورەكان هەیە.

حەوتەم: بانگەشەی ڕرەوایی قسەكردن لە شیعرەكانی بەشار و ئەبی نەواس و حەماد عەجرەد و دەعبەل خوزاعی و صالح بن عەبدولقودوسیان دەكرد و دیوانێكی شیعرییا دانا بۆ مەی.

هەشتەم: نكوولّی كردن لەوەی سروش دابەزیبێت بۆ سەر پێغەمبەران و پێیان وابوو عەقلّی مرۆیی ئەلّقەی پەیوەندی نێوان تاك و خوایە، ئیبن راوەندی پێشڕەوی ئەوانە بوو كە عەقلّیان پیرۆز رادەگرت و بە درۆ بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كە عەقلّ سروشی خواییەو هەر شتێ مرۆڤ نەیبینێ بڕوا پێهێنانی دروست نیە.

باتینیەت چەندین شێواز و دەربڕینی بیانییان خستە نێو زمانی عەرەبیەوەو بۆ ئەوەش پشتیان بەستبوو بە هەریەك لە سەرچاوە هیلینی و ئەفلاتوونیەكان، هەروەك چەندین بۆنەو رێوڕەسمی ئایینی صابیئەو ئەفلاتوونی نوێیان وەرگرت.

ئەوان بۆ هەر شتێ دژەكەیان دەكردە هێما، پێیان وابوو جەستە بوونێكی حەقیقی نیەو مەجازە، لەرێی ئیخوانوصەفاوە بیردۆزەی ئیمام و بیردۆزەی دە عەقلّەكەو تەناسوخ و رووناكی بالاّ و ئیشراق و بیردۆزەی دلّەكان و عەقلّی

تەواوەتی و فەیزیان بڵاوکردەوە، هەموو ئەمانەش داروپەردووی کۆن بوون و ئەمان زیندوویان دەکردنەوە.

ئینجا وشەی زندیق بەرامبەر بەو بیرۆکانە بەکارهێنرا، واتەکەشی واتە لەپێخستن‌و ملهوڕی واتە نکوولّی کردن لە بوونی خوایەك کە کارساز و بەڕێوەبەری کەون بێت، مێژوونووسان دەڵێن زندیقەکان دەستەیەك بوون کە بە رووکەش دەیانوت موسڵمانین، بەڵام لە ناخەوە بیروباوەڕی فارس و ئایینەکانی فارسیان هەڵگرتبوو و هەوڵیاندەدا بیروباوەڕە کۆن‌و نەیارەکان بە دین زیندوو بکەنەوە، بانگەشەیان دەکرد بۆ گەڕانەوە بۆ یاساکانی سروشت.

دیارترین کەس دوای ئیبن سەبەء بوویە ئاڵاهەڵگری ئەو بیرو هزرانە ئیبنولموقەفەع و بەشار و حەماد عەجرەد و موتیع بوون، ئامانجیان بوو بانگەوازی بێڕەوشتی و لەپێخستنی ئەرکەك و بەرپرسیارێتی و گاڵتەکردن بە بنەماکانی ئایین‌و رەوشت و سیستمە کۆمەڵایەتیەکان‌و نانەوەی مشتومڕ و گومان لەسەر مەی و حەرامەکانی تر بڵاو بکەنەوە، بەشار بوویە ئاڵاهەڵگری بڵاوکردنەوەی بیری خراپەی رەوشتی‌و بەزاندنی سنوور بە ئافرەتان، حەماد عەجرەد زمان پیسی و سنووربەزێنی گرتەبەر، هێرشی دەکردە سەر ئەهلی وەرع و تەقوا، بەتایبەت ئەوانەی زۆر سەرقاڵی پەرستش بوون‌و کەناریان گرتبوو لە تاودانە دنیا، ئیتر ناشیرینترین قسەی دەوت پێیان و درۆی دەکرد بە دەمیانەوە، ئەبوونەواس بایەخی بە مەی دەدا و بازاڕگەرمی بۆ دەکرد، ئەم شەپۆلەش لە دەروونی کەسانی دەروون لاوازدا گەیشتە لووتکە، بەڵام

بەرنگاربوونەوەیەکی بەهێز بەری پێ گرت و ساختەو ناراستیەکانی ئاشکرا کرد و دڵنیایی گەڕانەوە رووەو پەیامی حەقی ئیسلامی بەخشیەوە بە دەروونەکان.

توێژەران ئاماژە بەوە دەدەن وشەی باتینیەت چەند دەستەیەك دەگرێتەوە، گرنگترینیان بریتین لە خورەمی و قەرمەتی و ئیسماعیلی، هەروەك بۆ مەزدەکیش کە یەکێك لە هەوادارانی مانەوی بە ناوی مەزدەك دایمەزراند چەمکی باتینیەت بۆ ئەمیش بەکار دێت، لە سەردەمی قوبادی کوڕی فەیرووزی پاشای ساسانیدا مەزدەك ئەو رێبازە نوێیەی داهێنا، ئەو رێبازەش پێگەیەکی گرنگی سیاسی هەبوو و رێی ئایینی و تەئویل لە رووکەشی ئایینی کرد بە رێیەکی پێشڕەوی، ئیتر بێڕەوشتی رەها و نەمانی بالآپۆشی و رەواکردنی ناڕەواکان و نکووڵی کردن لە شەریعەتەکان زاڵبوو بەسەریاندا.

دوو مەترسیدارترین بنەمای فەلسەفەی باتینی بریتین لە:

یەکەم: راڤەی باتینی بۆ قورئان و سوننەت کە مەبەست پێی لارێکردنی دەستووری موسڵمانانو پێدانی واتای دوور لە واتاکانی ئیسلامە.

دووەم: بیرۆکەی پێشەوای مەعصووم کە ئەو پێشەوایەش بکرێتە میحوەرێکی چەسپاو تا بانگخوازان تەواو گوێڕایەڵی بن و کوێرانە ملکەچی بن تا بتوانن ئاسان پیلانی خۆیان بەسەر خەڵکەکەدا جێبەجێ بکەن.

مامۆستا ئەبولحەسەنی نەدەوی دەڵێت فیتنەی باتینیەت بەرهەمێکی فەلسەفە یۆنانیەکانەو زۆربەی سەرکردەکانی کەسان و گەلو تاقمگەلی بون کە بەهۆی رەوتی فتووحاتی ئیسلامیەوە دەسترۆییان لەدەستداوە، هیوایان بەوە

ئەما بە جەنگ ئەو دەسەڵاتە بگێڕشنەوە، کەسانێکیش بوون ئارەزووباز بوون و بڕوایان بە بێڕەوشتی و دەروون پەرستی هەبوو، ئیسلام سنووری داناوە بۆ ئارەزووەکانیان، یان کەسانێکی خاوەن دەسەڵاتی رەها بوون، هەموو ئەمانە لەژێر ئاڵای پەیوەندی باتینیەتدا کۆبوونەوەو هەستیان بەوە کرد ئیسلام لە مەیدانی جەنگدا ناڕووخێت و موسڵمانان بانگهێشت ناکرێن بۆ ملهوڕی چونکە ئەگەر بانگهێشت بکرێن ئەوە گوڕو تینی ئایینیان تین دەسێنێ، بۆیە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیان رێیەکیان هەڵبژارد کە موسڵمانان نەورووژێنێت، ئەویش جیاکردنەوەی رووکەش و ناوەڕۆك بوو، جەختیان دەکردەوە لە پەیوەندی نێوان وشەو چەمکە ئایینیەکان و واتاکانیان، لەرێی ئەو چەمکانەوە پەیوەندی نێوان موسڵمانان و رابردوو و سەرچاوە پوختەکانیان دامەزراوە، جا ئەگەر بێتو ئەو پەیوەندیەکی نێوان وشەو واتاکان بپچڕێت، ئیتر وشەکان واتایەکی تایبەت نەبەخشن و گومان دزە بکاتە ناوەوە، ئیتر ئوممەت دەبێتە نێچیری هەر بانگەوازو فەلسەفەیەك و هەرکەسەو دەتوانێت بەدڵی خۆی چی دەوێت بیڵێت.

بنەڕەتی ئایینی ئیسلام و بیروباوەڕ و حوکمو مەسەلەکانی لە چوارچێوەی برێ وشەو دەستەواژەدا خراوەتەڕوو کە دەربڕی ئەو بیروباوەڕو حوکمانەن. موسڵمانان ئاسایی لەو چەمکانە تێگەیشتون، ئێتر وشەکانی پێغەمبەرایەتی و پەیام و فریشتەو زیندووبوونەوەو بەهەشت و دۆزەخ و شەریعەت و فەرز و واجب و رۆژوو و زەکات و حەج، هەموو ئەمانە واتایەکی تایبەت دەگەیەنن و

پەیامێکی تایبەتیان لێ وەردەگیرێتو هیچ موسڵمانێك گومانی لێی نیە، هەروەك ئەو راستیانەی ئەو وشانە نیشانی دەدەن لەناو ئوممەتدا پارێزراونو ئەوە دوای ئەوەی هاودەم بە تێپەڕبوونی کات لە یەکدییان وەرگرتووە.

لێرەوە پیلانی ئەوان جیاکردنەوەی وشەو واتاکانی بوو، ئیبنولجەوزی لە کتێبەکەیدا (تلبیس ابلیس) دەڵێت ئەوانە پێیان وایە رووکەشی قورئان و فەرموودە ناوەڕۆکێکیان هەیە وەك کاکڵەو توێکل وان، نەزانەکان سەرسامی رووکەشی دەبن، بەلام لای ژیرەکان ئەوانە تەنها برێ هێما و ئاماژەن بۆ برێ راستی شاراوە.

باتینیەکان لەو هەوڵەیاندا دەیانویست ئامانجی خۆیان بهێننەدی کە جیاکردنەوەی رووکار و ناوەڕۆك و پێشخستنی ناوەڕۆك و بە کەم گرتنی رووکار و بە گاڵتەگرتنی بوو، بەڵکو تەنها وەك توێکڵێ تەماشایان دەکرد، ناوەڕۆکیش وەك کاکڵە، رووکاریان بە ناتەواو تەقلیدێکی تەواوەتی و بێ بەگەڵ و بێ ژیان تەماشا دەکردو دەیانوت ئامانج لە شەریعەت تەئویلە کە لە جەستەدا وەك رۆح وایەو تەنزیلیش تەنها جەستەیەکە، ئایەتەکانی قورئان و سوننەتی پێغەمبەریان تەئویل دەکرد و دەیانوت هەرکەس بگاتە جیهانی ناوەڕۆك ئیتر ئەرکی لەسەر نامێنێت، هەرچیەك بەندەکان وەك پەرستش دەیگرنەبەرو لە رووکاری قورئان و سوننەتدا هەیە تەنها نموونەیەکن و لە پشتەوە واتای تریان لەخۆ گرتووە، بێگومان ئەم بانگەشە پڕوپووچەو لەسەر بنەمای پەیامی فەلسەفەی لاهووتی یۆنانی دامەزراوە، باتینیەتیش لە مەترسیدارترین دەستە کاریگەرەکانی ناو

خەڵکە کە حەزی ئارەزووبازی پێش دەخات، بەگشتی پیلانێکە بۆ لەناوبردنی کرۆکی ئیسلام و مەبەستیەتی سێ شتی مەترسیدار پەخش بکات کە ئیسلام نکوولیان لێ دەکات:

یەکەم: دانانی نێوەندێ لەنێوان خوا و مرۆڤدا.

دووەم: بە مەعصووم دانانی مرۆڤ لە مەسەلەکانی عەقیدەو شەریعەتدا.

سێیەم: بانگەشەی نەمانی ئەرك و بەرپرسیارێتی.

ئەوەش دەرکەوتووە زۆربەی ئەو دەستەو تاقمانە ئامانجی سیاسییان هەبووە، بەڵام ئەو بەرگە بریقەدارەیان پۆشیوە بۆ لەخشتەبردن‌و گومڕایی خەڵك لە لایەك و لەلایەکی تریشەوە تا بتوانن بەها بنەڕەتیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لەناوبەرن، لە پشت ئەو بانگەوازانەوە پیلانی قەرمەتی و باتینی و عەبدوڵای کوڕی مەیموونی قەداح و حەسەن صەباحی بانگەشەکەر بۆ رێنماییەکانی ئیبن مەیموون و قەرمەتی و دارولحیکمە پاڵپشتیان بوون.

ئەگەر بزووتنەوەی باتینی کۆن لەخۆگرتنی هەردوو بزووتنەوەی شعووبیەت و زندیقیەکانی بەو ئامانجە بووبێت تا سیستمی ئیسلامی قوڵپ بکاتەوە و کۆمەڵێك مەجووسی و دوانە خوایی و مولهوڕ و فەیلەسووف و کەسی کینە لەدڵی دژ بە ئیسلام و عەرەبیان لە پشت بووبێت کە پێیان دەوترێت رافیزەو شعووبین، ئەوا لەمڕۆدا نموونەی هەمان ئەو کۆمەڵانە دەبینین کە لەژێر ناوی داگیرکاری و شیوعیەت و صەهیۆنیەتدا کۆبوونەتەوەو هەوڵ دەدەن لەژێر بڕێ ناوی نوێدا ئەو بیرە بتپەرستیە بڵاوبکەنەوە، بڕێ نووسینی بریقەداریان داناوە

بۆ خزمەتی پیلانو پرۆتۆکۆلەکانی صەهیۆن کە پەیوەندی قووڵ و پتەوی نێوان صەهیۆنیەت و شیوعیەت و داگیرکەر نیشان دەدەن، هەمنا ناوی کۆنی رافیزەو شعووبیەت نراوە لەو دەستەو کۆمەڵانە، ئەوانەی دوژمنی هەموو ئایین و میللەتێکن و کار دەکەن بۆ لەخۆگرتنی گەنجان و رۆشنبیرانی موسڵمان لە هەر ناوچەیەکی جیهانی ئیسلامی.

ئەگەر شعووبیەتی بایتین لە قۆناغێکدا سەرکەوتوو بووبێت لە خەڵك راکێشان بۆ نێو ریزەکانی –وەك چۆن لەمڕۆشدا بەدی دەکرێت– ئەوا زۆری نەخایاندووە پیلانە فێردەوسیە مارکسیە بەڵێن دراوەکەیان ئاشکرا بووە، دەرکەوتووە ئایدۆلۆژیا دیموکراتی و ئیشتیراکی و نەتەوەییە رۆژئاواییەکان کە لە ئاسۆی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا خراونەتەڕوو چەندە خراپ و نالەبارن.

هەروەك نالەباری بانگەوازی باتینی و پەیوەندی بە بەرژەوەندیە بیانیەکان ئاشکرا بووە، ئیتر تەواو روون بووەتەوە کە ئەو ئایدۆلۆژیایانەی ئاڵاهەڵگری رۆژئاواگەری و رۆژهەڵاتناسین تەنها مەبەستیانە تەنگهەڵچنن بە ئوممەتی ئیسلامی، ئەمەش لە لە بازنەی تێکەڵکردنی ئوممەتی ئیسلامی بە چەمکی جیهانیبوون.

ئەو هزرانە نەیانتوانیوە ئەو کاریگەریەیان هەبێت کە لە چاوەڕوانی بانگخوازانیاندا بووە، ئەویش بریتیە لەناوبردنی بیرۆکەی تەوصیەی ئیسلامی وەك سەرەتایەك بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵکو پەیامی ئیسلام رەسەنایەتی ترەو زیاتر لە فیترەتو زانستو عەقڵەوە نزیکترە، بۆیە

توانیویەتی بەهێزانە بەر بەو پیلانە بگرێت، زانایانی موسڵمان بەریان گرتووە بەو بانگەوازانەو پیلانە سیاسیەکانی پشت ئەو بانگەوازانەیان ئاشکرا کردووە، چەندین کەس بەرنگاری ئەو گومانانە بوونەتەوە، ئەو بەرنگاربوونەوەش لە چەندین بواردا خۆی نواندووە:

یەکەم: ئەو خوێندنگانەی کە نیزامولمولك بۆ رزگارکردنی ئەهلی سوننەو جەماعە دایمەزراند و چی بانگەشەی باتینی بوو هەمووی داڕووخاند، ئەو خوێندنگانە لە بەرنگاربوونەوەدا رۆڵێکی گەورەو گرنگیان هەبوو، چەندین زانای گەورە لەو هەڵمەتەدا بەشدار بوون، وەك غەزالی و باقەلانی و شەهرستانی و چەندینی تر، زۆرێك لە مێژوونووسان باتینیەت و مەجووسیەت پێکەوە دەبەستنەوەو بۆ ئەوەش پشت دەبەستن بەو دەقانەی خۆیان کە بۆ خوا دەستەواژەی عەقڵی یەکەم بەکاردێنن (تعالی الله عما یقولون علوا کبیرا).

دووەم: دەستەی خۆبەخشی دژ بە دەرچوان دەرکەوت، خالید دریووس کە بانگەوازی دەکرد بۆ فەرمان بە چاکەو رێگری لە خراپە، سەهلی کوڕی سەلامەی ئەنصاری کە بانگەوازی دەکرد بۆ کارکردن بە قورئان، تەبەری دەڵێت خەڵکێکی زۆر بوونە شوێنکەوتەیان و توانییان بەربگرن بە فاسقەکان‌و نەریتەکانیان ئاشکرا بکەن، دوای ئەوە دەستەی حەنبەلیەکان دەرکەوتن کە رۆڵێکی دیاری مێژووییان بینی، هەروەها وەك پەرچەکردارێك بۆ بزووتنەوەی ئارەزووبازی و لارێی زندیقەکان بزووتنەوەی زوهد و تاونەدانە دنیا پەیدا بوو.

سێیەم: خەلیفەکان دانووستانیان ڕێکدەخست بۆ مشتومڕ لەسەر ڕوبۆچوونەکانی باتینیەت و شعووبیەت، بیروڕاکانی بەشار بن برد و صالح بن عەبدولقودوس دەرکەوتن کە وەڵامی زۆر گومانی هەڵگرانی بیروباوەڕی مەجووسییان دایەوە، مەهدی کەوتە وێزەی زندیقەکان و خووی دایە کوشتنی ملهوڕان و نەیارانی دین و فەرمانی کرد بە وەڵامدانەوەی نووسینەکانی تایبەت بە مانی و ئیبن دیصان و مرقیۆن و ئەو کتێبانەی لە فارسی و فەهلەویەوە وەرگێردرابوونە سەر زمانی عەرەبی و نووسینەکانی ئیبن ئەبیلعەوجا و حەماد عەجرەد و یەحیا بن زیاد و موتیع بن ئیاس کە پاڵپشتی ڕێبازە مانەوی و دەیصانیەکانیان دەکرد.

چوارەم: ئاڵاهەڵگرانێکی زۆری بەرگری لە کرۆکی ئیسلام دەکردەوتن، لەوانە حەسەن بن عوسمان خەیات کە کتێبی (الانتصار و الرد علی ابن الراوندی) نووسی و ساختەی درۆکانی دژ بە موسڵمانان و تانەدان لە موسڵمانانی خستەڕوو، هەروەها ئیبنولجەوزی کە کتێبێکی نووسی لە وەڵامدانەوەی زندیق و باتینیەکاندا (تلبیس ابلیس) تیایدا گومانەکانی ئەوانی دەخستە ڕوو و وەڵامی دەدانەوەو تێکی دەشکاندن، هەروەها ئیبن حەزم وەڵامی ئیبن نغریلەی جوولەکەی دایەوە کە کتێبێکی دژ بە فەرمایشتی خوا نووسیبوو، جاحز کە لە وەڵامدانەوەی شعووبیەت و باتینیەتدا نووسینی زۆری هەبوو بەتایبەت کتێبی (الحیوان و البیان و التبیین)، هەروەها غەزالی لە چەند کتێبی نووسی (المستظهري) و (حجة الحق) و (مفصل الخلاف) و (الدرج المرقوم

بالجداول ) و (القسطاط المستقيم) و (فضائح الباطنية)، هەروەها رەخنەی گرت لە بیردۆزەی ئیمامەتی مەعصووم و باسی لەوە کرد تەنها یەك مەعصووم هەیە کە ئەویش موحەممەدی پێغەمبەری خوایە، هەروەك شەهرستانیو ئیبن حەزم و ئیبن تەیمیە و ئیبنولقەییم بە توندی وەڵامی زندیقەکانیان داوەتەوە، دەستەیەك لە زانایانی دادپەروەر بەرامبەر بەو هەرەشانە وەستانەوە کە نموونەی ئیمان و وەرع و لەخواترسی بوون وەك عەبدوڵای کوڕی موبارەك و سوفیانی کوڕی عوتبەو سوفیانی سەوری و فەزلی کوڕی عیاز، ئەوانە وازیان هێنا لە پۆستی دادوەری و سیاسەت و بە کارو کاسی خۆیان دەژیان و بانگەوازیان دەکرد بۆ رێی خوا و رازیش نەبوون بەشە مووچەی خۆیشیان وەربگرن.

لە سەردەمی نوێیشدا دەبینین پەیامی باتینیەت نوێ دەکرێتەوە، ئەویش بە چاپکردنەوەی نووسینەکانی ئیبن عەرەبی و حەلاج و ئیبنولفارز، توێژینەوە لە بیروبۆچوون و رێبازیان دەکرێت، پەیامەکانی ئیخوانوصەفا دەوترێنەوە، پیاوانی ئەدەبیی هاوچەرخ بەرپرسیارێتی ئەو کارە مەترسیدارەیان لە ئەستۆیە کە بە ناوی زەوقی ئەدەبیی یان هونەریەوە بەو کارە هەڵدەستن، هەروەها نووسەرانی سەردەم کە بێ ئەوەی لە پاشخانی مەترسیداری ئەو بانگەوازانە ورد ببنەوە زانیارییان لێ وەردەگرن، ئەوانە ژەهریان پێیە بۆ رۆشنبیرانی سەردەمن برێ گومانیان پێیە کە لەگەڵ رەسەنایەتی و بەها بنیادنەرە پێشکەوتن خوازیەکانی ئیسلامدا ناتەبان.

ڕێبازی باتینیەت لە بنەڕەتدا ئامانجی ئەوەیە بیروباوەڕی ئیسلامی لە بنەڕەتەوە لێکهەڵوەشێنێت، نوێکردنەوەی ئەو ڕەوتانە لەژێر ناوی هونەر یان ئەدەب یان فەلسەفە یان هەر ناوێکی تردا هەوڵێکی نوێیە بۆ خستنەوەڕووی ئەو پەیامە پووچە ژەهراویە تا لە ئاسۆی هزری ئیسلامیدا بخرێتەوە ڕوو، هەوڵێکە بۆ شێواندنو لەکەدارکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی، ئەوەی باتینیەکان نووسیویانە پیلانێکی زۆر مەترسیدارە کە مەبەستیان پێی لەناوبردنی ڕەسەنایەتی ئیسلامە، ئەویش بە نانەوەی گومان و تەئویلات و گومانی پەیوەست بە تەئویلات و لەپێخستن و بانگەواز بۆ نەمانی ئەرك و بەرپرسیارێتیەکان، فەلسەفەی باتینی لە نێو خۆیدا دامەزراوەیەکی فەلسەفەی لاهوتی یۆنانیەو بیروباوەڕ و چەمكو واتاکانی فەلسەفەی یۆنانی لەخۆگرتووە، ئەوان دەڵێن شەریعەت پڕ بووە لە نەزانی و تێکەڵ کراوە بە گومڕایی و تاکە ڕێی شۆردن و پاککردنەوەی بە فەلسەفە دەبێت، بێگومان فەلسەفەش لەگەڵ پێغەمبەرایەتیدا ناگونجێ و هەر لە خاڵی یەکەمەوە تا کۆتا بەیەك ناگەن، هەرکات فەلسەفە زاڵ بێ، ئیتر خەڵکی گاڵتە دەکەن بە ئایین و حەز دەکەن لە دەست ئایینو ئەرکی بیورباوەڕی دەرباز بن.

ئەو کتێبانەی فەلسەفەی یۆنانی هیلینیش کە وەرگێردراون نووسینەکانی تایبەت بە ئیلاهیات و میتافیزیقیان، ئەمەش لای یۆنانیەکان بە زانستی بتەکان ناسراوەو بتپەرستی نەتەوەیی ئەوانە، مەترسی باتینیەت گەیشتووەتە ئاستێك کە نووسەری کتێبی (الفرق بین الفرق) دەڵێت زیانی باتینیەت لەسەر دەستەی

موسڵمانان زۆر گەورەترە لە زیانی جوولەکەو مەسیح و مەجووسیەکان بۆ سەر موسڵمانان، بەڵکو زۆر گەورەترە لە زیانی دەهریەو هەموو تاقمەکانی تر.

بێگومان عەبدوڵای کوڕی سەبەء دامەزرێنەری ئەو مەزهەبە باتینیەیە کە لە مەجووسیەتەوە وەریگرتووە تا ئیسلامی پێ بشێوێنێت و دەسەڵاتی ئیسلامی نەهێڵێت، ئیتر لەم ڕێبازەوە بڕێ دەستەی دەرچووی ڕووخێنەری وەك قادیانی و بەهائی و چەندینی تر دەرکەوتن کە بەردەوام کاریان لێدانی ئیسلام بوو. ئەمەش بانگەوازی ڕۆژهەڵاتناسی و ڕۆژئاواگەری بوو بۆ چەسپاندنی ئەو ڕێبازە ناڕەوایە.

عەبدوڵای کوڕی سەبەئی جوولەکە ڕێنماییەکانی ئەو تاقمەی دانا و ئەو کۆمەڵە نهێنیەی پێکهێنا و بە بەشەکانی دەوڵەتی ئیسلامیدا بڵاوی کردەوە. ئەو یەکەم کەس بوو ئەو چەمکو واتایانەی لە ئاسۆی هزری ئیسلامید خستەڕوو و کۆمەڵەی مەترسیداری سەبەئی دامەزراند، دواتر عەبدوڵا ئیبنولموقەفەع ڕێبەری گرتەدەست، دواتر ئەو کۆمەڵە مەترسیدارانە هاتن کە بوونە ئاڵاهەڵگری پیلانگێری دژ بە ئیسلام وەك ئیخوانوصەفا و قەرمەتی و زەنجەکان.

جا هەر لەو ڕوانگەی هەوادارییە بۆ جوولەکە، هەندێ لە مێژوونووسان ئاماژە دەدەن بەو چەمكو واتایانەی کە کەعبولئەحبار بە ئامانجی شێواندنی پایەی جیهاد بڵاوی دەکردنەوە تا ڕۆحیەتی جیهادی لە ناخی موسڵماند لەناوبەرێت، ئەمەش بە گومان نانەوە لەسەر بەرنگاربوونەوەی دوژمنانی

ئیسلام یان بەرنگاربوونەوەی ئارەزووبازیەکانی دەروون، هەمان ئەو قسانە ئەمرۆدا لەلایەن قادیانیەکانەوە دەوترێنەوە، هەندێ لە توێژەران باس لەوەش دەکەن هەندێ جوولەکە وایان نیشاندەدا کە موسڵمان بون، کەچی مەبەستیان ئەوە بوو لەنێو موسڵماناندا ئاشووب بنێنەوە، هەر لەمەوە ئەو هەموو ئیسرائیلیاتە لەناو فەرموودەدا دانران، یان ئەو فەرموودانە درانەوە پاڵ عەبدوڵای کوڕی سەلام یان کەعبولئەحبار، زۆر توێژینەوە ئاماژە بەوە دەدەن کەسانێ هاتنە ناو ئیسلام کە تەنها بە رووکەش موسڵمان بوون و لە ناخدا موسڵمان نەبوون، بەڵکو بۆ تێکدانی باری ئایینی موسڵمانان و بڵاوکردنەوەی بیری لاڕێ لەنێویاندا خۆیان بە موسڵمان نیشان دابوو.

جوولەکایەتی پەیامی رەجعەو بانگەواز بۆ پیرۆز راگرتنی پێشەوا عەلییان هێنایە نێو هزری ئیسلامیەوە، جا جوولەکە چۆن کاری کردە سەر موعتەزیلە، هەر ئاواش کاری کردە سەر بیری باتینی.

هەروەها بانگەوازی جەبریەتیش بانگەوازێکە بە بنەڕەت جوولەکەییە، چی چیرۆکی ئیسرائیلیش خراونەتە نێو کتێبەکانی تەفسیرەوە زیندووکەرەوەی خورافەو ئەفسانەی دەستاوەدەست کراوی نێو ئایینەکانی پێشوون، ئەمەش دوای ئەوەی تووشی لارێکردن کران.

جێدەستێکی تری جوولەکایەتی مەسەلەی تەئویل و موتەشابیهە لە قورئاندا و هەرچیەکی تر پەیوەندی هەیە بە پێوەری مەنتیقیو تەعلیلی فەلسەفی کە دەکرانە پێناوێ بۆ سەلماندنی بیروباوەڕەکان، ئەمەش ئامانج لێی

کەنارخستنی ڕێبازی قورئانیە لە بیروباوەڕدا، لەوانەش وێنای ماددی لە وەسفی عەرش و فریشتەو ژیانی ناوگۆڕدا.

لەوانەیە ڕاسترین دەربڕینی ڕۆڵی جوولەکە لە باتینیەتدا وتەکەی شەعبی بێت کە بە مالیکی کوڕی موعاویەی وت: ئاگادارت دەکەمەوە وریای ئارەزووە سەرشێوێنیەکان بە، خراپترینیان ڕافیزەن، چونکە ئەوانە جوولەکەی ئەم ئوممەتەن و چۆن جوولەکە ڕقیانە لە مەسیحیەت ئەمانیش ئاوا ڕقیانە لە ئیسلام و نە بە حەز و نە لە ترسی خوا نەهاتوونەتە نێو ئیسلامەوە بەڵکو وەك داخێ بەرامبەر بە ئیسلام ئەو هەنگاوەیان نا، ڕافیزە دەڵێن جیهادی ڕێی خو بوونی نیە تا مەهدی نەیەت، جوولەکەش دەڵێن جیهاد نیە تا مەهدی دێت.

هەر لەو شەپۆلە جوولەکەییەوە بەهائیەت و قادیانیەت و ڕۆحگەرایی نوێ هاتە ئاراوە، کۆمەڵی دەونەمەش کە ئاڵاهەڵگری پیلانی دژ بە ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی بوون هەر سەربە ڕەوتی جوولەکەیی بوون، چەمکی دەونەمە بەو جوولەکانە دەوترا کە تورکی ئەزمیر و سالۆنیك بوون، ئەوانە لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون‌و بە ڕووکەش موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، کەچی لە ناخەوە جوولەکە بوون، لەوەشدا شوێنکەوتەی ڕێبەر یان پێغەمبەرەکەیان (شبتای) بوون کە لە ساڵی 1648 ی زاینیدا وای ڕاگەیاند ئەو مەسیحەیە کە جوولەکە چاوەڕێیان دەکرد تا هەوڵی ڕزگارکردنیان بدات و دەسەلاتێکی فراوانیان بۆ دابمەزرێنێت، پاشان موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند تا لەدەست لەسێدارەدان ڕزگاری بێت، لە ساڵی 1666 ی زاینیدا لە قوستەنتینیە

بەند کرا و حوکمی لەسێدارەدانی لەسەر درا، ئەویش موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، کە سوڵتان موحەممەدی چوارەمی فەرمانڕەوانی تورکیا ئەمەی بینی ساکار ساکارێ بڕوای پێ کرد و وایزان موسڵمان بووە و سزاکەی لەسەر لابرد، شوێنکەوتەکانی شبتای وێنەی ئەو موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، جا ئیتر ئەوانە پێیان دەوترا دەونەمە، ئینسکلۆپیدیای جوولەکە ئاماژە بەوە دەکات ئەو تاقمە بانگەشەی موسڵمانبوونیان دەکرد بەڵام لە ژێرەوە دروشمە جوولەکەییەکانیان پەیڕەو دەکرد، کاتێك بزووتنەوەی صەهیۆنیەت لە کۆتاییەکانی سەدەی پێشوودا نەیانتوانی خەلیفە عەبدولحەمیدی دووەمی عوسمانی ناچار بکەن بە ڕازی بوون بە کۆچکردنی جوولەکە بۆ فەلەستین کە ئەوکات سەر بە تورکیا بوو، جوولەکە و بەتایبەت دەونەمەکان کەوتنە هەوڵی لەناوبردنی خیلافەت عوسمانی لە تورکیا.

ئەوەی کە بڕیاری لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی عوسمانی بە دەستی نوێنەری جوولەکە قەرصوو نوێنەری سلانیك برا بۆ سوڵتان، ئەمە شتێکی بێ بەرنامە نەبوو، بەڵکو ئەو نوێنەرە خۆی پێشتر لەلایەن جوولەکەی صەهیۆنیەوە نێردرا بۆ بینینی سوڵتان عەبدولحەمید و هەوڵی هەڵخەڵەتاندنی تا ڕازی بێت بە کۆچی جوولەکە لە فەلەستین بەرامبەر پێدانی پەنجا ملیۆن جونەیهی زێر بۆ خەزێنەی دەوڵەت و پێنج ملیۆن بۆ خەزێنەی تایبەتی سوڵتان، بەڵام سوڵتان ڕازی نەبوو بەوە، بەڵکو جوولەکە بەتایبەت دەونەمەکانی سلانیك و چەندینی تر دامەزرێنەری کۆڕبەندە ماسۆنیەکان و بانگخوازی بانگەوازی

تۆرانیەت بوون لە تورکیا، ئەمشە لەپێناو رزگاربوون لەدەست ئیسلام و زمانی عەرەبی و نەهێشتنی پەیوەندی نێوان تورك و عەرەب، ئەمەش لە دەسەلاَتداری موستەفا کەمال ئەتاتورکدا کاریگەری خۆی هەبوو.[1]

[1] - مصطفى صبرى: موقف العقل و العلم والعالم من رب العالمين.

## باسی دووەم
## بانگەوازی شعووبیەت

بانگەوازی شعووبیەت یەکێکە لە هەنگاوەکانی نەخشەی پیلانی دژ بە ئیسلامو هەڵمەتەکانی لەم بوارانەدایە:

یەکەم: هێرش بردنە سەر ئاڵاهەڵگرانی ئیسلام و رێبەرانی دەوڵەتی ئیسلامی لە مێژوویان و شێوازی ژیانو لێدانی زاتو قەوارەیانو هێرش بردنە سەر ئابرووی ئیسلامی و تانەدان لە دیدی پیاوەتییان، هێرش بردنە سەر بەهاو فەزیلەتە ئیسلامیەکان کە خۆیان لە رێزو ئابروومەندیدا دەبیننەوە.

دووەم: هێرش بردنە سە مێژووی ئیسلامی و زمانی عەرەبی.

سێیەم: لێدانی ریشەی بنەڕەتەکای بەها ئیسلامیەکان.

چوارەم: دابەزاندن و سووککردنی بەها رەوشتیە ئیسلامیەکان.

شعووبیەت بە ئامانج هێرش دەکاتە سەر رۆشنبیری عەرەبی تا رێ خۆش بکات بۆ زیندووکردنەوەی رۆشنبیری فارسی کۆن و کەمکردنەوەی شانو شکۆی رۆشنبیری عەرەبیو وا نیشانی بدات بۆ سەردەم نابێت، شعووبیەت زۆر هێرش دەکاتە سەر زمانی عەرەبی، ئەمەش دوای ئەوەی زمانی عەرەبی زاڵ بوو بەسەر زمانە کۆنەکاندا و لەناو جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بوویەوەو بوویە زمانی رۆشنبیری و سیاسەتیش، بۆیە هانی خاوەن زمانەکانی تریان دەدا تا بگەڕێنەوە بۆ زمانی خۆیان و نووسین بە زمانی خۆیان.

هەروەها شعووبیەت هەوڵی دەدا مەینۆشی و ئارەزووبازی و لادانی جنسی بڵاو بکاتەوەو ئەوەشی بە جۆرێك لە ئازادی دادەنا.

ئێمە لەمڕۆدا هەمان ڕێوشوێن دەبینین چۆن دووبارە دەکرێتەوەو شعووبیەتی سەردەم دەرکەوتووەتەوەو کەتۆتە وێزەی عەرەب و بیروباوەڕیان و ئاڵای بێڕەوشتی و ملهوڕیان هەڵگرتووەو گاڵتە دەکەن بە بەها ڕەوشتیەکانی نێو خێزان و کۆمەڵگە، دەبینیت چۆن بانگەواز دەکەن بۆ بێڕەوشتی و ڕۆچوون لە ئارەزووی جنسی و مەینۆشی لەژێچر ناوی ئازادی و هاوچەرخیبووندا

هەڵمەتی بانگەوازی شعووبیە تزۆر جەخت لە مێژوو دەکاتەوەو هەوڵ دەدات دەستکاری مێژوو بکات، کتێبی زۆریان بڵاو کردوەتەوە کە وێنەی شێواو و نارەوایان بەرامبەر بە عەرەب گرتووەتەبەر بە ئامانجی سووککردنی مێژووی عەرەب و بەهاکانیان و هاندانی نەوەی نوێ بۆ دابڕان لە رابردوویان و بە کەم دانانی ئوممەتەکەیان.

هەروەها شعووبیەت هەوڵ دەدات ئەفسانە کۆنەکان و فەرهەنگی بتپەرستی زیندوو بکاتەوە تا کۆمەڵگەی ئیسلامی لە مێژووە ڕەسەنەکەی دابڕێت.

ئەم کارە لە سەردەمی نوێدا لە ڕێی نووسینەکانی ڕۆژهەڵاتناسان و موژدەبەرانو شوێنکەوتە ڕۆژئاواگەراکانیانەوە دووبارە بووەتەوە، دکتۆر تەها حوسەین هەموو تەمەنی خۆی لەوەدا خەرج کرد کە وێنەی ناشیرینی و کەمنرخ کردنی مێژووی موسڵمانان کۆبکاتەوەو بڵاوی بکاتەوە، ژمارەیەك لە ڕۆژئاواگەراکانیش شوێن پێی ئەویان هەڵگرت وەك لویس عوەز و لۆرنیس و

یووسفلخال و حوسەین فەوزی و زەکی نەجیب مەحموود و سەلامە مووسا و مەحموود عەزمی.

هەریەك لە سەعالبی و جاخز لە سەردەمی یەکەمدا بەرنگاری ئەو شالاوە شعووبیانە بوونەوەو بەرگرییان کرد لە زمانی عەرەبی و تایبەتمەندی و زیندوێتی زمانی عەرەبییان خستەڕوو، نووسەر و بیریارانی عەرەب چالاکی خۆیان نیشاندندا بۆ پەیوەست کردنی فەرهەنگی عەرەبی پێش ئیسلام لەگەڵ ئەدەبی عەرەبی پاش ئیسلامدا، وەك بەلازەری لە کتێبەکەیدا (فتوح البلدان) هەستا بە نیشاندانی رۆڵی عەرەب لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئیسلام و پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامیدا.

لەمڕۆشدا دەیان نووسەری بزاڤی بێداریخوازی دەبینین کە بەرنگاری شالاوی شعووبیەت دەبنەوە کە دژ بە زمانی عەرەبی و بەها ئیسلامیەکان هەڵمەتیان هێناوە، نموونەی ئەو بەرگریکارانەش موستەفا صادق رافعی و غەمراوی و موحبەدین خەتیب و حەسەن بەننا، بەردەوام نەوە دوای نەوەش ئاڵای بەرگریکارییان لەدەست ناوە.

ئیبن قوتەیبە ئەوە روون دەکاتەوە کە شعووبیەت هەوادارانی هان دەدات تتا زۆر بلێن و زۆر سەرکۆنە بکەن، لە کاتێکدا هێرشیان بۆ سەرە عەرەب چڕ کردووەتەوە مەبەستیان لە بنەرەتدا لەناوبردنی خودی ئیسلامە، بۆیە بزاڤی بەرگریکاری ئیسلامی رۆڵی ئەو عەرەبانە دەخاتەوەڕوو کە ئاڵای ئیسلامیان گەیاند بە گەلانی تر و یەکەم چالاکی جوگرافییان لەرێی فتووحاتەوە پێشکەش

به ئیسلام کرد و بەدوای ئەوەدا ئیسلام بڵاو بوویەوەو زمانی عەرەبیش بڵاو بوویەوە لەبەرئەوەی قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیوە و فەرموودەش هەر بە زمانی عەرەبیە، هەروەها ڕێبازە فیقهیەکانیش هەر بە زمانی عەرەبی دانراون، دیوانو کارگێڕی لە سەدەی یەکەمی ئیسلامیدا کرا بە عەرەبی، هەر ئەوانە بە گوڕو تینەوە بایەخیان دا بە زانستە ئیسلامی و عەرەبیەکان تا ئەوەی ڕۆڵی گەلانی تر هاتە مەیدان و بەشدارییان کرد لەو ڕۆشنبیریەدا.

هەروەها هەڵمەتی شعووبیەت زۆر جەختی دەەکردەوە لەسەر بنەڕەت و ریشەی هەموو مەسەلەکان، پێش ئەوەی هێرش بباتە سەر ئیسلام هێرشی دەبردە سەر عەرەب و لە هەموو شتێکدا تۆمەتباری دەکردن، لە شێوەی ژیان و ڕەوانبێژی و وتار و ڕەچەڵەك و پەیوەندی کۆمەلایەتی و پێوەری ڕەوشتیاندا، ڕەسەنایەتی عەرەبی ئیسلامیش بەرنگاری ئەو هەموو شالاوە بوویەوەو نارەوایی ئەو شالاوانەی خستەڕوو و کەوتە بەرگری کردن لە ڕەچەڵەك و قەوارەی ڕۆشنبیری عەرەب.

یەکێك لە مەترسیدارترین هەوڵەکانی شعووبیەت لە کۆندا کە لەمڕۆدا سەرلەنوێ دووبارە دەبێتەوە بریتیە لە بانگەواز کردن بۆ گەڕانەوە بۆ زمانە ناوچەییەکان، قەڵەمڕەوی داگیرکاری و موژدەبەری لەمەدا هاوکار بوون تا زۆر ناوچەی ئیسلام لەبری زمانی عەرەبی کە زمانی بنەڕەتییان بوو زمانی ناوچەیی بگرنەبەر یان زمانی بیانی بسەپێنن کاتێك زمانی فەرەنسی یان زمانی

ئینگلیزییان سەپاند بەسەریاندا، ئینجا هانیان دەدان تا بە پیتە لاتینیەکان بنووسن.

هەریەك لە جاحز و سەعالبی بەرگرییان کرد لە زمانی عەرەبی لەبەرئەوەی زمانی قورئان و زمانی رۆشنبیری گشتیە، لە سەردەمی نوێیشدا زۆر کەس لە رێبەرانی بزووتنەوەی بێداریخوازی بەرگرییان کردووە لە زمانی عەرەبی و ساختەی دوژمنانی ئەو زمانەیان خستووەتەڕوو.

# باسی سێیەم

## ئیخوانوصەفا

ئیخوانوصەفا یەکەم بەرهەمی بزووتنەوەی باتینەت بوو، ئەمانە بزووتنەوەیەکی نهێنی بوون کە فەلسەفەی یۆنانی و بیروباوەڕی باتینیان تێکەڵ کردبوو تا ڕێبازێکی نوێ بە خەڵك ببەخشن، ئیلاهیاتی یۆنان و بیردۆزەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ئەفلۆتین و فیساگۆرس و چەندین بیروباوەڕی تریان تێکەڵ دەکرد بە بیروباوەڕی ئیسلامی، ئەویش تێکەڵکردنێکی ناڕەواو هەڵە.

ئەو دە دانە پەیامەکانی ئیخوانوصەفایان بەرهەم هێنا و پاش ئەوەی ناوەکانی خۆیان شاردەوەو لەپشت هێما شاراوەکانەوە کە لەملاو لەولا لە نێو نووسینەکانیاندا دایاننابوون خۆیان حەشاردا، ئامانجیان لەوە دانانی بەرنامەیەك بوو بۆ کاری نهێنی لەپێناو لەناوبردنی ئیسلامو دەوڵەتی ئیسلامی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێ لەسەر داروپەردووی دەوڵەتی ئیسلامی کە هەڵگری بیروباوەڕی بتپەرستی و مەجووسی و بێرەوشتی بێت، ئەمەشیان لە کۆکراوەیەکی بیری ساختەی مرۆیی وەرگیراو لە فارس و هیند و یۆنانەوە وەرگرتبوو و تێکەڵەیەکی بیری هیلینی ئیغریقی و غەنووصیەتی ڕۆژهەڵاتی بوو.

ئەبووحەییانی تەوحیدی لە کتێبەکەیدا (الإمتاع و المؤانسة) دا بە (عصابە) ناویان دەبات کە ڕێبازێکی نوێیان دامەزراند و بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ڕێی گەیشتن بە ڕەزامەندی خوای پێ نزیك دەکەنەوەو دەیانوت شەریعەت پڕ بووە لە نەزانی و گومڕایی تێکەڵ کراوەو ڕێیەك نەماوە بۆ شۆردن و پاککردنەوەی

تەنها بە فەلسەفە نەبێت، چونکە حیکمەتی بیروباوەڕی و بەرژەوەندی ئیجتیهادی لەخۆگرتووە، دەیانوت هەرکات فەلسەفەی یۆنانی و شەریعەتی ئیسلامی تێکەڵ بکرێن ئیتر کەمال دێتەبوون، بۆیە پەنجا پەیامیان داهێنا لە هەموو بوارەکانی فەلسەفەدا چ لە رووی زانستی و چ لە رووی کرداریەوە، پێرستێکیشان بۆ دانا و ناویان نا پەیامەکانی ئیخوانوصەفا و تیایدا ناوی خۆیان شاردەوەو لەناو بازاڕی وەراقیندا بڵاویان کردەوەو دەیانبەخشی بە خەڵکی، ئەو پەیامانە وشەی ئایینی و نموونەی شەرعی و پیتی دوو واتا و رێی ناروونیان لەخۆگرتبوو.

ئەو پەیامانە هەریەك لە بابەتەکانی سروشتی و بیریکاری و ئیلاهیات و عەقڵییان لەخۆدەگرت و قووڵبوونەوەو نیزامیان تێدابوو، رۆچوون لە خەیاڵ و پشت بەستن بە بیروبۆچوونی یۆنانی بێ پشکنین و رەخنە لێگرتنیان خستبووەروو، بێ تێربوون و قەناعەت پێکردن لە هەموو زانستێکدا شتیان نووسیبوو، بەڵکو هیچ کۆت و سنوورێکیان بۆ نەبوو، تیایدا نکووڵییان دەکرد لە زیندووبوونەوەی جەستەو پێچەوانەی ئەوەی لای موسڵمانان باو بوو و لە دەقە ئاینیە یەکلاییەکانەوە وەردەگیرا راڤەی رۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخیان دەکرد، نکووڵیان لە بوونی شەیتانەکان دەکرد بەو شێوەی کە زۆربەی موسڵمانان لێی تێدەگەیشتن و دەیانوت ئەوانە دەروونی خراپەکارن، کوفر و سزایان بە راڤەیەکی باتینی فەلسەفی دەخستەڕوو، چەندین رای خەیاڵییان هەبوو کە هەندێکیان لە یۆنانەوە وەرگیرابوون و هەندێکیشان زادەی ئەندێشەی

خۆیان بوون، هەندێکیشیان بەرهەمی کاهینەکان بوون وەك نهێنی بورجەکان و فالّو شتی لە وچەشنە و جادوو وبڕوابوون بە هاتنی بورجەکان و کاریگەرییان و مۆشیقای گەردوون، هەروەها بیروباوەڕی سروش و پێشەوای شاراوەو توقیەو و ئامادەسازی دەروون و عەقلّ بۆ دەولّەتێکی نوێ کە لەسەر بنەمای دەسەلاّتی ئەهلوبەیت دابمەزرێ و هەوالّ دان بە کۆتایی هاتنی دەولّەتی عەبباسی، بە کورتی ئەو پەیامانە کۆمەلّێکی نامۆی بڕیار و ئایینداری و بابەتی کاهینی و سیاسەت بوون لەسەر بنەمای فەلسەفەی سروشتی و ئیلاهی یۆنانیو گرنگیەیکی وایان نەبوو، ئەگەر بارشێواوی هزری باوی جیهان لە سەدەی چوارەم و پێنجەم و بەرزراگرتنی کردەی فەلسەفی نەبوایە ئەو هەمووە گرنگیەیان پیّ نەدەدرا.

بەوجۆرە روونو ئاشکرا دەبینین ئەو پەیامانە سەرەتا و پێشەکیەك بوون بۆ گۆڕینی بانگەوازی باتینی بۆ پیلانێکی تایبەت لەپێناو لەناوبردنی دەولّەتی ئیسلامی و هزری ئیسلامیش، یان وەك یەکێك لە توێژەران دەلّێت مشتومڕێ بوو بۆ دانانی سیستمێکی نوێی رەوشتی ئیلاهی زانستی تا شوێنی شەریعەتی ئیسلامی بگرێتەوە چونکە ئیخوانوصەفا بڕوای وابوو ئیتر شەریعەتی ئیسلامی توانای نەماوە، بەلاّم ئەو مشتومڕە هیچ سیستمێکی زانستی بەرهەم نەهێنا و کۆمەلّگەی ئیسلامیشی نەهێنایەدی و لە ماوەیەکی کەمدا بوو بە رووداوێکی بەسەرچووی مێژووی بیّ کاریگەر لە ژیان و بیّ پێگەو پێناسەو تەنها لە مۆزەخانەو کتێبخانەکاندا باسو خواسی ما.

دکتۆر عەبدوللەتیف موحەممەدلعید پێی وایە ئیخوانوصەفا ژەهریان دەکردە ناو هەنگوینەوە تا خزمەت بە ئامانجەکانیان بکەن، ئەو پەیامانەش تۆماری کۆبوونەوە نهێنیەکانیان بوون و بە نهێنی نوێنەرایەی ڕێبازی باتینی ئیسماعیلییان دەکرد، چونکە تەئویلاتی باتینیان دەکرد، ڕێبازی ئەفلاتۆنی نوێیش کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەو پەیامانەدا، ئەوان ڕاشکاوانە پەیامی ئەفلۆتینیان دەوتەوە کە پێی وابوو جیهان یەکەیەکی زیندووی تەواوکارە و ڕۆحێکی هەیە لە هەموو بەشەکانیدا (ئەمەش ڕێبازی وەحدەتولوجودە کە ئیسلام بە سەختی نکووڵی لێدەکات و بەرنگاری دەبێتەوە).

هەروەها سەبارەت بە مرۆڤ دەڵێن هەم ڕاستگۆ و هەم فەیلەسووف و هەم پێغەمبەرو نێردراوەو ڕێنماییە باتینیەکانیان جێبەجێ دەکرد و ژەهری خۆیان دەڕشت.

ئەوان سەبارەت بە پێشەوا و ئیمام پێچەوانەی پەیامی ڕاستی ئیسلام بوون و پێیان وابوو ئیمام زاتێکی خوایی هەیەو مەعصوومە، لە کاتێکدا ئیسلام عیصمەتی تەنها بۆ پێغەمبەری خوا داناوە، بەوەش ئەو پەیامانە مەبەستیاز بوو چەمك‌و واتا بنەڕەتیەکانی ئیسلام و پێغەمبەرایەتی لەناوبەرن و جەنگی د بە ئیسلام‌و لێدانی هاوەڵانیان گرتبوویەبەر.

باتینیەت بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەیان تەشەیوعیان قۆستبوویەو وەك چۆن تەصەوف فەلسەفیشیان قۆستبوویەوە، ئیتر لە پشت ئەهلوبەیت صۆفیگەراییەوە خۆیان حەشار دابوو.

بانگەوازی ئەوان بۆ یەکبوونی ئایینەکان نەهێشتنی دەمارگیری ئایینی، ئاماژەیەکە بە لاڕێبوون و دەرچوونیان لە پەیامی ڕەسەنی ئیسلام، ڕایەکی زۆر خراپیان ئەوەیە کە دەڵێن دەستەی تایبەت هیچ پێویستیەکیان نیە بە شەریعەت، هەروەها دەڵێن پێویست بە جێبەجێ کردنی فەرزەکان ناکات، دەڵێن شەریعەت بۆ خەڵکی گشتیە، ئەوەی پێی دەڵێن زانستی باتین واتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتگەلێکی لە خەڵك شاردووەتەوەو پێی نەوتون (پێغەمبەری خواش (ﷺ) زۆر دوورە لەوەی هیچی شاردبێتەوە).

ماوەیەکی زۆر خەڵکی نەیاندەزانی نووسەرانی پەیامەکانی ئیخوانوصەفا کێن، دەستەیەك لە خەڵکی پێیان وایە یەکێك لە کەسە موعتەزیلیەکان یان ئیمام جەعفەری صادق نووسیویەتی (ئەمە لە مینهاجو سوننەی ئیبن تەیمیەدا هاتووە)، ئیبن حەجەر لە فەتواکانیدا دەڵێت مجریتی نووسەری ئەو پەیامانە بووە، لەوەشدا نووسەری کتێبی (کشف الظنون) پاڵپشتی دەکات، هەندێ پێیان وایە دەستەیەك نووسیویانە نەك تەنها کەسێك، ئەوان لە بەصرە لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچیدا ئەو پەیامانەیان نووسیوە، ئەبووحەییانی تەوحیدی ئاماژە بەوە دەدات وەزیر صیمصامودەولەی کوڕی عەزدودەولە هەواڵی پێداوە لە ساڵی 373 ی کۆچیدا پێی وتووە کە ئەبووسەلمان موحەممەدی کوڕی میعشەری بستی ناسراو بە قودسی و ئەبولحەسەن عەلی کوڕی هاروونی زنجانی و ئەبوموحەممەدی میهرەجانی و عووقی و زبر بن رفاعە لە دەستەی ئیخوانوصەفا بوون.

هی واش هەیە دەڵێت پەیامەکانی ئیخوانوصەفا هی یەکێك لە پێشەوا عەلەویەکانە، چونکە پەیامەکان پڕن لە ڕێنماییە ئیسماعیلیەکان، ئەو توێژەرەی کە ئەم زانیاریەمان لێ وەرگرتووە پێی وایە ئەو پەیامانە پوختەی پەیام و ڕێنماییە باتینیەکانن و ڕێبەرانی بانگەوازی ئیسماعیلی جیا لە خەڵکی تر دەیانخوێندنەوە، پۆل کازنۆڤا ئەو پەیامەی بۆ جیهانی ڕۆژئاوایی ئاشکرا کرد، ئەمەش لە ساڵی 1899 دا.

بێگومان گرنگیدانی ڕۆژهەڵاتناسی و ڕۆژئاواگەری بەو پەیامانە زۆر زۆر بوو، بۆیە دەستەیەك لەوانە (نیکلسۆن، جۆلد سیهەر، ئۆلیری) وێڕای کازنۆڤا چەندین توێژینەوەیان نووسی سەبارەت بەو پەیامانە، ئەگەرچی نووسینەکانی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە نەیانتوانی ڕێگر بن لە گومانی باتینی بوونی پەیامەکان، کازنۆڤا دەڵێت من تەواو متمانەم بەوەیە کە بیروراکانی ئیخوانوصەفا بیروراکانی ئیسماعیلیەکانن، میحوەری ئەو بیرورایانەش بڕوابوونە بە گەڕانەوەی ئیمام، قەرمەتیو حەشاشیەکان لەلایەن دوژمنانیانەوە تۆمەتبار دەکرێن بە کوفر، بەلام ئەو تۆمەتە هیچ ڕاستیەکی نیە.

ئۆلیری دەڵێت: کەسی وا هەیە بەو گومانە هەڵدەخەڵەتێت کە دەڵێت بزووتنەوەی ئیخوانوصەفا بزووتنەوەیەکی چاکسازی هەندێ لەو ئیسماعیلیانە بوو کە دەیانویست بگەڕێنەوە بۆ ڕێنماییە کۆنەکانی ئیسماعیلی.

جۆلد سیهەر دەڵێت بڕوام وایە پەیامەکانی ئیخوانوصەفا ئەو بنەڕەتە بوون کە بیروباوەڕی ئیسماعیلییان لەسەر دامەزرا.

جێی سەرسوڕمانیش نیە ڕۆژهەڵاتناسان ببنە بەرگریکار و پشتیوانی پەیامەکانی ئیخوانوصەفا.

ماکدۆنالد دەڵێت ئەوەی پەیوەندی نێوان ئیخوانوصەفا لەگەڵ ئیسماعیلیەکان دەسەلمێنێ ئەوەیە بەشێك لە پەیامەکانیان لە نێو کتێبە پیرۆزەکانی حەشاشیەکاندا هەبوون.

هەندێ لە توێژەران تیشکیان خستووەتەسەر هەڵوێستی ئیخوانوصەفا کە ئاماژە بەوە دەدەن نموونەی باڵای پەیامەکانیان نموونەیەکی باڵای ئیسلامی نیە، بەڵکو نموونەیەکی عیبرانیە و لە بەرنامەشدا مەسیحی و لە زانستیشدا یۆنانیە، مەترسیەکەش لەوەدا بوو کە ئەوان لە ئاست بیروباوەڕێکدا نەدەوەستان، بەڵکو لە هەر ئایین‌و زانست‌و فەلسەفە و ڕێبازێ شتێکیان وەردەگرت بێ ئەوەی چوارچێوەیەکی چەسپاویان هەبێت، ئەمەش بەڵگەی پیلانیانە دژ بە ئیسلام، ئەوەش کە ناوەکانی خۆیان ئاشکرا نەدەکرد بەڵگەیەك بوو بۆ ئەوەی بانگخواز بوون نەك زانا.

هەموو ئەوانە نیشاندەری ئەوەن ئەوانە ئامانجێکی سیاسی شاراوەیان هەبووە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات یان لەناوبردنی دەوڵەتی ئەوکات، بۆیە زۆر ئاماژەیان دەدا بە هێماگەلێکی دیاریکراو و ڕاڤەی تایبەتیان دەکرد، ئەم دیاردەش لە نووسینەکانی ئیبن سینادا بە ڕوونی دیارە کە بڕێ هێمای بەکاردەهێنا.

بێگومان تێگەیشتنی ئەوانە بۆ ئاین تێکەڵ بە فەلسەفە بوو، ئەمەش خۆی بۆ خۆی دەرچوون بوو لە پەیامی دروستی ئیسلام.

موحیبەدین خەتیب دەڵێت نووسەری ئیخوانوصەفا یەکێك بوو لە پێشەواکانی ئیسماعیلیەکان کە ئەویش ئەحمەدی کوڕی عەبدولڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادق بوو.

دکتۆر حوسەین هەمەدانی کە یەکێکە لە بانگخوازانی لێهاتووی ئیسماعیلی دەڵێت ئیسماعیلیەکان پێیان وایە قورئان کتێبێکە بۆ خەڵکی گشتی و پەیامەکانی ئیخوانوصەفایش کتێبی تایبەت بە چینی تایبەتین.

یەکێك لە دیارترین کارەکانی ڕۆژئاواگەری و شاڵاوی ڕۆشنبیری کە خۆیان لە ڕۆژهەڵاتناسی و موژدەبەریدا دەنواند، چاپکردنەوەو زیندووکردنەوەی پەیامەکانی ئیخوانوصەفا بوو، ئەمە لەکاتێکدا نزیك بە هەزار ساڵ بوو ئەو پەیامانە مردبوون و ساختەیان ئاشکرا کرابوو، چاپخانەی کاسۆلیکی لە بەیرووت ئەو پەیامانەی چاپکردەوە، دواتر دکتۆر تەها حوسەین لە ئەورووپا لە ساڵی 1929 دا ئەو پەیامانەی ئیخوانوصەفای چاپکردەوەو پێشەکی بۆ نووسی، ئەمەش عەیبە نەبوو بۆی ئەگەر بنەڕەتی توێژینەوەی زانستی بگرتایەتە بەر و ئەو پەیامانەی لە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیاندا دابنایە، چونکە کۆمەڵی ئیخوانوصەفا لە سەدەی چوارەمی کۆچی لە بەصرە لە شێوەی کۆمەڵەیەکی نهێنی باتینیەت و مەجووسی و زندیقی داخ لەدڵی دژ بە ئیسلام دەرکەوت، ئامانجیان لەو پەیامانە پیلانێکیان دانا بۆ لەناوبردنی کۆمەڵگەی

ئیسلامی، ئەگەر دکتۆر تەها ئەو ئامانجەی بخستایەتەڕوو ئەوە لە ئامۆژگاری کردنی نەتەوەکەیدا راستگۆ دەبوو، بەڵام دکتۆر تەها جوسەین درۆی بەرامبەر بە خەڵك کرد و بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئیخوانوصەفا دەستەیەکی نوێگەرو چاکساز بوون کە فەلسەفەی هیندی و فارسی و یۆنانییان پێشکەش بە کۆمەڵگەی ئیسلامی کرد تا رۆشنبیریەکی نوێ دابمەزرێنن کە پێویستە هەر کەسێکی رووناکبیر بیگرێتەبەر.

بەو جۆرە تەها حوسەین لەکاتێکدا لە ناخی خۆیەوە دەیزانی بە زیندووکردنەوەی ئەو پەیامانە وەك بەشێك لە پیلانی رۆژئاواگەری و شاڵاوی رۆشنبیری کار دەکات بۆ لەناوبردنی بەها ئیسلامیەکان، کەچی فێڵی کرد لە نەتەوەکەی خۆی.

زەکی موبارەکی هاوڕێیش چوویە ریزەوەو دەویت کێ بڕوای دەکرد پەیامەکانی ئیخوانوصەفا ببنە گەورەترین کۆگای ئەدەبی و فەلسەفی، رۆژهەڵاتناسان وا فێریان کردن، چاپخانەی کاسۆلیکیش دەیوت گەورەیی ئەو پەیامانە ئەوەیە کە تەها حوسەین و فەرووخ و جبوور و دەسووقی و صەلیب و عەواو ماسینیۆن لەسەریان نووسیوە، بەڵام هەموو ئەوانە لە سەرسامییان بە پەیامەکانی ئیخوانوصەفا لە یەك ئاستدا نەبوون، هەیانە پەیوەندی ئیخوانوصەفای بە پیلانی باتینیەوە خستووەتەڕوو.

دەبوو هەموو ئەونە راستی پەیامەکانی ئیخوانوصەفایان لە ئاست پەیامی رەسەنی ئیسلامی بخستایەتەڕوو، چونکە ئەو پەیامانەلە چەند بنەڕەتێکی سەرەکیدا لەگەڵ چەمکو واتای رەسەنی ئیسلامیدا نەدەگونجان:

یەکەم: نکوولّی کردن لە زیندووبوونەوەی جەستەکان.

دووەم: پێچەوانەی ئەوەی موسڵمانان وەریانگرتبووراڤەی بەهەشت و دۆزەخ و رۆژی دواییان دەکرد.

سێیەم: راڤەیەکی باتینی مەعنەوییان دەکرد کوفر و سزادان.

چوارەم: خراپی دیدیان سەبارەت بە پێغەمبەرایەتی کە پێیان وابوو دەکرێت لە رێی هەوڵ وپاکڕاگرتنی دڵەوە پێغەمبەرایەتی بەدەست بهێنیت.

پێنجەم: پێیان وابوو هەرکەس زانستی باتین وەربگرێت، ئیتر ئەرکو بەرپرسیارێتی لەسەر نامێنێت.

هەروەها کارێکی زۆر خراپیان ئەوەبوو دەیانویست لە وێنەیەکی نارەوادا هەموو ئایینو بیروباوەڕەکان تێکەڵ بە یەك بکەن، دەیانوت کەسی تەواو ئەوەیە رەچەڵەکی فارسی و ئایینی عەرەبی و ئەدەبی عێراقی و هەواڵی عیبرانی و رێبازی مەسیحی و پەیڕەوی شامی و زانستی یۆنانی و بەرچاوڕوونی هیندی و ژیانی صۆفیگەری و رەوشتی مەلەکی بێت.

ئەمە واتە یەکبوونی ئایینەکان، ئەمەش بانگەشەیەکی جوولەکەیی تلموودیە کە بە درێژایی سەردەمەکان هەوڵیداوە بەو پیلانە لە ئیسلام بدات، لە سەردەمی نوێشدا ئەم بانگەشەیە دووبارە بووەتەوەو دەبینین بانگخوازانی

ڕۆژئاواگەری دەڵێن با بەیەککەیشتنی ئاین و ڕۆشنبیریەکان لە یەکەیەکی ڕۆشنبیری جیهانیدا بێتە دی، بنەڕەتی ئەمەش لە بیری تلموودیدایە کە زاڵ بێت بیری ڕۆژئاوایی و ژیاری جیهانی لەخۆگرتووە.

ئەمەش نزیکە لە پەیامەکانی ئیخوانوصەفاوە کە دەڵێن پێویستە براکانمان هیچ زانستێ واز لێ نەهێنن یان واز لە هیچ کتێبێك نەهێنن و دەمارگیرییان نەبێت بۆ هیچ ڕێبازێ، چونکە ڕاو مەزهەبی ئێمە هەموو ڕێبازەکان لەخۆدەگرێت و هەموو زانستەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە.

بەڵام پەیامی ئیسلامیی ئێمە تایبەتمەندی و ڕەسەنایەتی تایبەتی خۆی هەیە کە تایبەتمەندیەکانی خۆی لە مۆرك و بەهاکانی خۆیەوە وەرگرتووەو هەرگیز تێکەڵ ناکرێت بە بیری مرۆیی یان ئومەمیەت و جیهانیبوونێ کە لەسەر بنەمای بتپەرستی و ماددیگەری دامەزراوە.

ئەبوحەییانی تەوحیدی وا وەسفی پەیامەکانی ئیخوانوصەفا دەکات کە لە هیچ هونەرێکدا تێر و لێهاتوو نین، بەڵکو خورافەو و دەستکاری و فرتو فێڵیان تێدایە، ئەو نووسینانەم برد بۆ لای مامۆستامان ئەبووسولەیمانی مەنتقی سجستانی موحەممەدی کوڕی بەهرام، ئەویش چەند ڕۆژێك سەیری کرد وو تیایدا ڕۆچوو و دواتر گێڕایەوە بۆم و پێی وتم: ماندوو بوون و بێسوودیش بووە، هەنگاویان ناوەو بێسوود، ئاوازی ناتەبا و چینین نارەوایان گرتووەتەبەر، گومانێکی نەگونجاو و لەتوانا بەدەرو نەکراویان بردووە، وا گومانیان بردووە دەتوانن بنەونە ئەو فەلسەفەیە کە زانستی ئەستێرەو گەردوون و مەقادیر و

شوێنەواری سروشتە، مۆسیقا کە زانینی ئاواو ئیقاع و تەوەرەو کێشە، مەنتیق کە لەبەرچاوگرتنی زیادەو و چەندێتی و چۆنێتی وتەکانە لەشەریعەتدا و شەریعەت بخەنە پاڵ فەلسەفەوە، ئەوانە خەڵکانێکی زۆر مەترسیدار و بەهێز و وردەکارن، بەڵام ئەوەی دەیانویست پێی نەگەیشتن و هیوایان نەهاتەجدی، بەڵکو بێتامی و ئەوپەڕی گەمژەیی و نازناوی ناشیرین و سەرەنجامی رسواکەر و تاوانی زۆریان دەست کەوت.

دوا ئەوە ئەبووسولەیمانی مەنتیقی دەڵێت وەك چۆن نەماندیوە لەم ئوممەتەدا بۆ شتێ لە ئاینەکەی پەنای بردبێت بۆ دەستەی فەلسەفەگەراکان، هەروەها بۆ ئوممەتی عیسا کە مەسیحیەکانن و مەجووسیش، ئەوەی زیاتر مەسەلەکت بۆ روون دەکاتەوەو سەرسامت دەکات ئەوەیە کە ئوممەت لە راو بۆچوونو مەزهەبیاندا راجیا بوون و بوونە چەند دەستەیەك وەك مورجیئەو موعتەزیلەو خەوارجی، بەڵام هیچکام لەو دەستانە پەنایان نەبرد بۆ فەلسەفەو بە بەڵگەی فەلسەفە پەیامی خۆیان نەگەیاند و هیچیان بەکارنەدەهێنا کە لە کتێبی پەروەردگاریان و فەرموودەی پێغەمبەریاندا نەبوایە، فیقهناسەکانیش کە لە حوکمەکانی حەڵاڵ و حەرامدا راجیا بوون، هەر لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ نەمانبینیوە پشت ببەستن بە فەیلەسووفان و هیوای سەرکەوتن لەوانەوە بخوازن، پێیان نەوتون بەو زانیاریەی لاتانە هاوکاریمان بکەن یان بە زانیاری پێشینتان بەڵگەمان بۆ بهێننەوە یان بەڵگەمان لە دژ پێبدەن.

بەوجۆرە دەبینین زانایانی موسڵمان چاك ئامانجی ئەو کارەیان زانیوەو ئەو ساختەکاریەی رۆشنبیرانی سەردەم نەیاندیوە ئەوان دیویانە، تا ئەوەی بانگخوازانی رۆژئاواگەری هاتن و ئەو پەیامانەیان لە سەردەمی نوێدا زیندوو کردەوەو وەك زانست و تێگەیشتن و رۆشنبیری نیشانیان دان، لەکاتێکدا تەنها ژەهر بوون و دەستەی رەسەنایەتی ئیسلامیش بەو ژەهرەیان زانیوەو خراپی ئەو بیرە گومڕایەیان روونکردوەتەوە، پێویستە خەڵکی ئەمڕۆمان چاك ئەوە بزانن و بێ دوودڵی هۆشیار بن بەرامبەر بە مەترسی روانین و بەدواداچوونی ئەو کارو پەیام و نووسینە گومڕایی و گومڕابەخشیانە.

# باسی چوارەم
# بانگخوازانی باتینیەت

بانگخوازانی باتینیەت کە ژەهرێکی زۆریان رشت، لەلایەن پیاوانی رۆژئاواگەری و شالاوی رۆشنبیریەوە رێزێکی گەورەیان لێنراو لە بزاڤی رۆژهەلاتناسی و موژدەبەری مەسیحیدا پلەو پایەیەکی بەرزیان هەبوو، چەندین توێژینەوەی دووروودرێژ لەسەر عەبدوڵای کوری سەبەئو ئیبنولموقەفەع و ئیبن سیان و فارابی و ئیبن راوەندی و رازی و مەئموون نووسران و هەموویان بەرز و بەرێز راگیران، لە چەندین بواری جیاجیای ئەدەب و مێژوو و فەلسەفەدا قسەیان لەسەر کرا و ئاهەنگیان بۆ گێردرا، دکتۆر تەها حوسەین کتێبێکی گەورەی نووسی بە ناوی (فیتنەی گەورە)[1] تا تیایدا ئیبن سەبەئی جوولەکە پاك راگرێت لەو پیلانەی پێی هەستا و ئەو تاقمەی بە ناوی سەبەئیەتەوە پێکهات و دەیانوت عەلی کوری ئەبووتالیب خوایە، لەکاتێکدا هەموو سەرچاوە مێژووییە ئیسلامیەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو کابرا جوولەکە بووەو لە یەمەنەوە هاتووەو ناسراوە بە ئیبنوسەوداء و خۆی بە موسڵمان نیشان دا و کۆچی کرد بۆ حیجاز و لەوێوە بۆ بەصرەو لەوێشەوە بۆ کووفەو دواتر لە سەردەمی عوسمانی کوری عەففاندا چووە دیمەشق، خەڵکەکەی لەوێ

[1] - ئەم کتێبە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی و زۆرجار خوێنەری کورد بێ ئەوەی شارەزای وردی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەبێت ئەو کتێبە دەخوێنێتەوەو کاریگەر دەبێت بە زمانە کاراو ساختەکاریە وردەکەی لە گەمە کردن بە دەق و زانیاریە مێژووییەکان. (وەرگێر).

# باسی چوارەم
# بانگخوازانی باتینیەت

بانگخوازانی باتینیەت کە ژەهرێکی زۆریان ڕشت، لەلایەن پیاوانی ڕۆژئاواگەری و شالاوی ڕۆشنبیریەوە ڕێزێکی گەورەیان لێنراو لە بزاڤی ڕۆژهەڵاتناسی و موژدەبەری مەسیحیدا پلەو پایەیەکی بەرزیان هەبوو، چەندین توێژینەوەی دوورودرێژ لەسەر عەبدوڵای کوڕی سەبەئو ئیبنولموقەفەع و ئیبن سیان و فارابی و ئیبن راوەندی و رازی و مەئموون نووسران و هەموویان بەرز و بەڕێز ڕاگیران، لە چەندین بواری جیاجیای ئەدەب و مێژوو و فەلسەفەدا قسەیان لەسەر کرا و ئاهەنگیان بۆ گێردرا، دکتۆر تەها حوسەین کتێبێکی گەورەی نووسی بە ناوی (فیتنەی گەورە)[1] تا تیایدا ئیبن سەبەئی جوولەکە پاك ڕاگرێت لەو پیلانەی پێی هەستا و ئەو تاقمەی بە ناوی سەبەئیەتەوە پێکهات و دەیانوت عەلی کوڕی ئەبووتالیب خوایە، لەکاتێکدا هەموو سەرچاوە مێژووییە ئیسلامیەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو کابرا جوولەکە بووەو لە یەمەنەوە هاتووەو ناسراوە بە ئیبنوسەوداء و خۆی بە موسڵمان نیشان دا و کۆچی کرد بۆ حیجاز و لەوێوە بۆ بەصرەو لەوێشەوە بۆ کووفەو دواتر لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا چووە دیمەشق، خەڵکەکەی لەوێ

---

[1] - ئەم کتێبە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی و زۆرجار خوێنەری کورد بێ ئەوەی شارەزای وردی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەبێت ئەو کتێبە دەخوێنێتەوەو کاریگەر دەبێت بە زمانە کاراو ساختەکاریە وردەکەی لە گەمە کردن بە دەق و زانیاریە مێژووییەکان. (وەرگێڕ).

دەریانکرد و ئەویش رووەو میصر چوو، دەچوویە هەر شوێنێ خەڵکی دژ بە عوسمان گەرم دەکرد و بانگەوازی دەکرد بۆ لابردنی عوسمان.

عەبدولاّی کوڕی سەبەء یەکەم کەس بوو چەمکی وەصیە و رەجعەو تەناسوخی هێنایە نێو ئاسۆس هزری ئیسلامیەوە، دەیوت پێغەمبەری خوا دەگەڕێتەوەو عەلیش خوایە، ئیبن عەساکیر هێناویەتی کاتێك بەیعەت درا بە عەلی، ئیبن سەبەء هەستایە سەر پێ و پێی وت: تۆ زەویت بەدیهێناوەو رۆزی دەبەخشیت، عەلیش دووری خستەوە بۆ مەدائین، ئەویّ پێگەی دواتری قەرمەتیەکان و لادەرە شیعەکان بوو، دەوترێت دەیوت موحەممەد کۆتای پێغەمبەرانەو عەلیش کۆتای وەصیەکانە، ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەڵێت ئیبن سەبەء گەورەی زندیقەکانە.

ئیبن سەبەء بانگخوازانی خۆی لە ناوچەکاندا بلاّو کردەوەو پێی دەوتن وا نیشان بدەن فەرمان بە چاکە دەکەن و رێگری لە خراپە دەکەن، بنەونە تانەدان لە سەرکردەکان، ئەوانیش خەڵکیان دژ بە سەرکردەکانیان هاندەدا تا پیلانی سەرکردەکەیان پەیڕەو بکەن، سەبارەت بە کەموکورتی سەرکردەکان نامەیان دەنووسی و دەیانارد بۆ ناوچەکانی تر، لە ئەنجامی ئەمەوە بە هاندانی سەبەئیەکان دەستەیەك لە موسڵمانان رووەو مەدینە چوون و ماڵی ئەمیری باوەڕداران عوسمانیان گەمارۆ دا و کوشتیان.

کتێبەکانی مێژووی ئیسلامی رۆڵی عەبدوڵای کوڕی سەبەئیان خستۆتەڕوو کە چۆن بە روونی ئاژاوەی ناوەتەوەو پەیوەندی نێوان یاخیبوانی لە هەموو ناوچەکاندا رێکخستووە.

تەبەریو چەندین سەرچاوەی تری ئیسلامی باسیان لەوە کردووە ئیبنوسەودائی جوولەکە هاتە شام و گەیشت بە ئەبووزەر و پێی وت ئەی ئەبووزەر سەرت لە موعاویە ناسوڕمێ کە دەڵێت سامان سامانی خوایە هەموو شتێ هەر هی خوایە، وەك بڵێیت سامانی موسڵمانان بۆ خۆی بێت و ناوی موسڵمانانی لەسەر لابەرێت، ئەبووزەریش چوو بۆ لای موعاویەو وتی بۆچی سامانی موسڵمانان بە سامانی خوا ناو دەبەیت، موعاویە وتی رەحمەتی خوات لێ بێت ئەی ئەبووزەر، مەگەر ئێمە بەندەی خوا نین، دەی سامانیش سامانی خوایەو بوون هەمووی هی خوایەو هەموو شتێ بە دەستی خوایە، ئینجا ئیبن سەودا چوو بۆ لای هاوەڵی گەورەی فیقهناس ئەبوودەرداء و چی بە ئەبوزەر وتبوو بەویشی وت، ئەبوو دەردائیش پێی وت تۆ کێیت، بەخوا گومان دەبەم تۆ جوولەکە بیت، ئیبنجا ئیبن سەودا چوو بۆ لای موجاهید عوبادەی کوڕی صامت، ئەویش چوو بۆ لای موعاویەو وتی بەخوا ئەمە بووە ئەبووزەری ناردتە کۆڵت.

سەبەیەکان هەڵوێستێکی تری مەترسیداریان هەبوو، هەرکە بینییان موسڵمانان بەیعەتیان دا بە عەلی و تەلحەو زوبەیر چوون بۆ بەصرە بۆ جەنگی جەمەل، سەبەئیەکان بینییان خەریکە سەرکردەکانی سوپا لە بارەکە

تێدەگەن‌و تۆڵەی خوێنی عوسمان وەردەگرنەوە، بۆیە شەو کۆبوونەوەو بڕیاریان دا دزە بکەنە نێو هەردوو لا و جەنگ لەنێوان دوو سوپاکەدا بنێنەوە، توانیشیان ئەو بڕیارە جێبەجێ بکەن، پێش ئەوەی دوو سوپاکە پێکبگەن ئەمان کەوتنە تیرهاویشتن لە هەردوولاوە، هەردوو سوپا ترسان و سەرکردەکانی هەردوولا گومانی ناپاکییان برد.

ڕەشید ڕەزا دەڵێت هەرکەس بگەڕێتەوە سەر بەرسەرهاتی ڕووداوەکانی جەنگی جەمەل لە کتێبە مێژووییەکەی ئیبن ئەسیرەوە بۆی دەردەکەوێت کە ڕۆڵی خراپی سەبەئیەکان لەو نێوەندەدا چەند بووە تا نەهێڵن ڕێککەوتن ڕوویدات.

ئیبن سەبەئیش بە موژدەبەرێکی گەڕۆك ناو دەبات کە موسڵمانانی لە خشتە دەبرد و بەرەو هەڵەی دەبردن و هەوڵیدەدا باوەڕ بە ڕەجعەت لەناو موسڵماناندا بڵاو بکاتەوە.

مامۆستا موحەممەد سعەیدی ئەفغانی دەڵێت ئەو کۆمەڵەی عەبدوڵای کوڕی سەبەء دایمەزراند، لە بەرژەوەندی دەوڵەتێکی بیانی کاری دەکرد کە دەوڵەتی ڕۆم بوو، چەند ساڵێ بوو دەوڵەتی ئیسلامی دوو ناوچەی فراوان و دەوڵەمەندی لەو دەوڵەتە سەندبوو کە ئەویش میصر و شام بوو، جا یەکێك لە پاڵەوانانی کۆمەڵە نهێنیەکە ئامانجی لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلام و کۆتایی هێنان بە ئیسلام بوو، ئەو پیلانە زۆر ڕێکخراو و بە بەرنامە دانرابوو و چەندین کەسی شارەزا شەونخوونییان بۆ کێشابوو و بە هەموو ناوچەکانی دەوڵەتی

ئیسلامیدا بڵاویان کردەوە تا بەرهەمی خۆی دا، زۆبەی مێژوونووسان بەشێوەی پێویست ئەو پیلانەیان روون نەکردووەتەوە، عەبدوڵای کوڕی سەبەء ویستی ریشەی بیروباوەڕی ئیسلامی هەڵکێشێ، بۆیە دوو بیروباوەڕی نامۆی هێنایە کایە کە ئەوانیش بریتی بوون لە رەجعەت و ویصایە، دەیوت (شتێکی نامۆیە کەسێك بڕوای هەبێت عیسا دەگەڕێتەوە کەچی بڕوای بەوە نەبێت موحەممەد دەگەڕێتەوە لە کاتێکدا خوا دەفەرموێت (إن الذي فرض عليك القرآن لرادك إلى معاد) موحەممەد لە عیسا شیاوترە بە گەڕانەوە، جا ئەم وتەی لێ وەرگیراو بەو چەشنە بنەمای رەجعەتی داناو لەنێو کۆمەڵگەدا بڵاوبوویەوە، دواتر دەویت ئەگەر هەزار پێغەمبەر هەبووبن و هەر پێغەمبەرێ وەصیەکی هەبووبێت ئەوە عەلیش وەصی موحەممەدەو موحەممەدیش کۆتای پێغەمبەرانە کەوابوو عەلی کۆتای وەصیەکانە، ئیتر بە پەیامەکانی هەم مەیدانی ئایینی و هەم مەیدانی سیاسیش دەشێواند، دەیوت (ستەم لەوە گەورەتر چیە کەسێك رێ نەدات بە وەصیەی پێغەمبەری خوا تا وەصی پێغەمبەری خوا کە عەلیە کاروباری ئوممەت بگرێتە ئەستۆ)، دواتر دەیوت عوسمان بە ناحەق دەسەڵاتی بردووەو ئەوە وەصی پێغەمبەری خوا ماوە، دەی راپەڕن و فەرمان بکەن بە چاکەو رێگری بکەن لە خراپەو تا خەڵکی بەرەو لای خۆتان راکێش بکەن و بانگیان بکەن بۆ ئەم پەیامە، دواتر بەنێو ناوچەکاندا دەگەڕا و سەرەتا لە حیجازەوە دەستی پێکرد و گومڕایی خۆی بلاو دەکردەوە تا چوو بۆ شام، لەوێ موعاویە هەستی کرد بە مەترسی کارەکەی، بۆیە دووری خستەوە، تەبەری دەڵێت

ئیبنوسەودا لە شام کەسی دەست نەکەوت بۆیە خەڵکەکەی دەریانکرد و ئەویش چوو بۆ میصر، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە کە ئەو هەوڵی خی دژ بە موعاویە گرتەبەر و هاوەڵێك گەورەی دژ بە موعاویە جووڵاندا تا سەرنجی خەڵکی شام بۆ راکانی راکێشێت تا موعاویەی ژی ولەسەرخۆ ناچار بوو داوا لە خەلیفە عوسمان بکات ئەو هاوەڵە لە شام دەربکات، ئەویش ئەبووزەری غیفاری بوو و بەسەرهاتەکەشی ناسراوە.[1]

ماوەیەك لە میصر مایەوەو لەوێ کۆمەڵەکە کاری خۆیان دەکرد و برێ نامەی ساختەیان دەنارد بۆ ناوچەکان تا سکاڵاو هاوارەکان رووەو خەڵکی میصر نیشان بدەن و هانیان بدەن بۆ شۆڕش دژ عوسمان و لابردنی، ئەو نامانەیان لەسەر زمانی تەلحەو عائیشەو زوبەیر ساختە دەکرد، ئیتر نەگبەتی وڵاتی گرتەوەو خەڵکێکی زۆر راپەرین و رووەو مەدینە چوون و خەلیفە عوسمانیان کوشت، دوای ئەوەی عوسمان شەهید کرا و خەڵکی بەنجی رووداوەکە بەریدان، ئینجا ئەڵقەیەکی تر دەستی پێکرد کە ئەویش دانانی پیلانێکی گەورەتر بوو تا جەماوەر رووەو کارەساتێکی گەورەتر بەرن و وایان لێبکات کارەساتی عوسمانیان بیر بچێتەوە، ئەوەبوو، کاتێك خاتوو عائیشە بۆ داخوازی خوێنی عوسمان لە حیجاز دەرچوو، ئیبن سەبە ء خۆی و شوێنکەوتەکانی لە دەوری عەلی کۆبوونەوە، بە هەوادارانی خۆی وت کە

---

[1] - خوێنەری ئازیز بۆ بەرچاورونی زیاتر سەبارەت بە رۆڵی ئەبووزەری غیفاری لە سەردەمی فیتنەدا لە کۆتایی ئەم بەشەدا پاشکۆیەك دادەنێین بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر. (وەرگێڕ).

خەڵکەکە بەیەککەیشتن ئێوە جەنگەکە هەڵگیرسێنن و رێیان مەدەن لە هیچ وردبنەوە، ئیتر موزەری و رەبیعی و یەمانیەکانیان چوونە نێو ریزەکانی هەردوولاوەو چەکیان خستەکار، خەڵکی بەصرە راپەڕین و هەردوولا کەوتنە جەنگ نانەوەو هەموان سەرسام نەیاندەزانی چی روودەدات، تەلحەو زوبەیر هاتنە دەرەوەو دەیانپرسی ئەوە چیە؟ ئەوانیش وتیان خەڵکی کووفە بە شەو دەورەیان داوین، ئەوانیش وتیان دەمانزانی عەل وازناهێنێت تا خوێن نەڕژێت‌و دەستمان لێ ناگرێتەوە، خەڵکی بەصرە توانییان بەر بگرن بەو شاڵاوەو بیانگێڕنەوە، عەلیش لەولاوە هەر وا سەری سوڕمابوو و دەیوت دەمزانی تەلحەو زوبەیر وازناهێنن تا خوێن نەڕژێ، ئیتر خەڵکە تێك پرژان و جەنگەکە دەستی پێکرد و دواجار پانزە هەزار کوژراو و ژمارەیەکی زۆر برینداری لێکەوتەوە،[1] ژمارەیەك لە هاوەڵە دیارەکانی نێو کۆچەران و پشتیوانان و رێبەرانی ناو خەڵك و ژمارەیەکی زۆری قورئان لەبەر و زاناو موجاهید لەو نێوەندەدا کوژران.

گرنگترین هەنگاوەکانی ئیبن سەوداء و شوێنکەوتوانی لە ناوچەکانی جیهانی ئیسلامیدا بریتی بوو لە:

یەکەم: دزەکردن‌و دەست خستنە نێو دین.

---

[1] - ئەم ژمارەیە ناراستی تێدایەو ئەمەش کردەی دەستی ناحەزانێکە بۆ گەورەتر نیشاندانی کارەساتەکە ئەو ژمارەیان تۆمار کردووەو بە توێژینەوەی ورد لە سەرچاوە مێژوویەکان و وردەکاری لە سەنەد و دەق و بەراوردکاری رووداوەکانەوە دەردەکەوێت کە ژمارەی کوژراوانی جەنگەکە زۆر زۆر کەم بووە. (وەرگێڕ)

دووەم: نەهێشتنی یەکدەنگی.

سێیەم: سووکایەتی کردن بە مێژوو.

چوارەم: بە کەمگرتنی نەریت و بنەماکان.

پێنجەم: کەمکردنەوەی پێگەی زمان.

شەشەم: شێواندنی رەوشت.

حەوتەم: سووکایەتی بە دروستی سیستەمو نیزامەکان.

هەستەم: شانازی کردن و پیاهەڵدانی هەر رێبازێکی بیانی.

موحەممەد سەعید ئەفغانی دەڵێت ئەو پیلانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەرکات گەورەو بچووکی کارەکانمان کەوتە دەست هەوادارانی داگیرکار و جاسووسانی بێگانە و بەکرێگیراوانی هەر بانگەوازێکی رووخێنەر تووشی ئەوە دەبین.

لە راستیدا دەکرێت بڵێین هەموو بیردۆزەکانی رۆژئاواگەری و شاڵاوی بیانی دەگەڕێنەوە بۆ بیروراکانی عەبدوڵای کوڕی سەبەء.

لەگەڵ هەموو ئەم کارانەی ئیبن سەبەئدا، کەچی تەها حوسەین وێنەی رای تلموودی نکووڵی دەکات لە بوونی شتی لەو چەشنەو دەڵێت ئیبن سەبەء کەسێتیەکی خەیاڵی بووەو ئەو کەسە جوولەکەیەهیچ دەستێکی لەو کارەدا نەبووەو جوولەکە لە هەڵگیرساندنی ئەو ئاگرەدا هیچ دەستێکیان نەبووە.

هەروەها دەڵێت بەسەرهاتێك هەیە کە زۆربەی گێرەرەوەکانی (دواتر) گەورەیی دەکەن و زێدەڕۆیی تێدا دەکەن تا ئەوەی زۆربەی نووسەرە کۆن و

نوێكانیش دەیكەنە سەرچاوەی ئەو ناكۆكیەی دژ بە عوسمان ئەنجام دراو ئەو ناكۆكیەی دواتر لەنێوان موسڵمانانندا روویدا و تا ئێستاش شوێنەواری ماوەتەوە، ئەویش چیرۆكی عەبدوڵای كوڕی سەبەئە، هەروەها دەڵێت نازانم لە سەردەمی عوسماندا ئیبن سەبەء مەترسی هەبووە یان نا، بەڵام لەوە دڵنیام ئەگەریش مەترسی هەبووبێت مەترسیەكەی هێندە گەورەو گرنگ نەبووە، ناكرێت موسڵمانان لە سەردەمی عوسماندا عەقڵو بۆچوونو دەسەڵاتی خۆیان بدەنە دەست كەسێكی موسڵمانبوونی ناو ئەهلی كیتاب كە لە سەردەمی عوسماندا موسڵمان بووە.

مامۆستا مەحموود موحەممەد شاكیر بانگەشەكەی دكتۆر تەها حوسەین تێكدەشكێنێت و دەڵێت سەبارەت بەوەی دكتۆر دەڵێت گێرەرەوەكانی دواتر ئەمە ناروونیەكی زۆری تێدایەو بە ئەنقەستیش وای وتووە، چونكە تەبەری لە گێرەرەوەكانی دواتر نیە، سەیفی كوڕی عومەر كە تەبەری ئەو بەسەرهاتەی لێوە گێڕاوەتەوە لە گەورە مێژووناسە كۆنەكانەو مامۆستای تەبەری و بەلازەریش بووە، لە ئاستی مامۆستاكانی ئیبن سەعدایە، ئیتر نە بۆ ئەو و نە بۆ تەبەریش رەوا نیە بوترێت گێرەرەوەی دوایین بون بەو جۆرەی دكتۆر تەها دەیەوێت ئەو ناراستیە لای خوێنەر بچەسپێنێت، ئەوەش كە دەڵێت (سەرچاوە گرنگەكان) ئەمەش ناروونی و ناراستیەكی زۆری تێدایە، ئەگەر تەبەری لە سەرچاوە گرنگەكانی بەردەستمان نەبێت، ئەگەر بەڵگەی دكتۆر تەها حوسەین بۆ نەبوونی عەبدوڵای كوڕی سەبەء ئەوە بێت كە بەلازەری باسی نەكردووەو

پێی وایە ئەو سەرچاوەی ئەویش گرنگترین سەرچاوەی مێژووییە، دواتر دێتەوەو نکوولّی دەکات لەو نووسینەی کە باسی فەرمانی کوشتنی وەفدی میصری تێدایە، لەگەلّ ئەوەشدا بەلازەری ئەمەیانی بە دووورودرێژی باس کردووە و وا باسی کردووە کە لە هیچ کتێبێکی تردا بەو وردەکاریە نەهاتووە، ئیتر نازانین چۆن بۆ هەوالّێ کە باسی نەکردووە دەیکاتە بەلّگەو بۆ هەوالّێکی تر کە باسی کردووە نکوولّی لێ دەکات.

پاشان موحەممەد مەحموود شاکر ئاماژە بەوە دەدات تەها حوسەین لە نکوولّی کردن لە بوونی عەبدولّای کوڕی سەبەئدا پشتی بەو بەشەی بەلازەری بەستووە کە لە ئیسرائیل چاپ کراوەو کەسێکی صەهیۆنی چاپی کردووەو دەلّێت با دکتۆر مۆلّەتمان بدات تەواو گومانمان هەبێت لە زیممەی ئەو کابرا جوولەکە صەهیۆنیەی ئەو کتێبەی لە چاپخانە جوولەکەییەکان لە ئۆرشەلیم چاپ کردووە، گومان بکەین و لەسەری رابوەستین، چونکە رێوشوێنی نووسینی کۆن بەتایبەت لەو جۆرە نووسینەی بەلازەری وای خواستووە نووسەری لە شوێنێ شتێکی بیر چووبێت و دواتر لە شوێنێکی تردا باسی کردبێت، باشتر وابو لە شوێنی خۆیدا باسی بکات، بۆ نموونە لە باسی ژیانی عەمماری کوڕی یاسر یان موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکر یان موحەممەدی کوڕی حوزەیفە یان یەکێکی تری بەشداربووی فیتنەدا ئەوەی کردووە، لەکاتێکدا دەزانێت چی نووسینی بەلازەری هەیە بەشێکی تەواو کەمی چاپکراوە، ئەویش لە ئەلّمانیا و لە سالّی 1883 دا، دواتر کەسێکی جوولەکەی صەهیۆنی بەشێکی تری لە

ساڵی 1936 دا چاپ کرد کە بەشی ژیاننامەی عوسمانە، دواتر بەشێکی تری لە ساڵی 1938 دا چاپ کرا، ئەوەی چاپو پەخشی کردووە لە پێشەکیە عەرەبیەکەیدا دەڵێت چەند رووداو هەن لە سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویەدا روویانداوە وەك رووداوی کەربەلا و مەرگی حوسەین، مەگەر ناکرێت بەلازەری لە شوێنێکی تردا مەسەلەی عەبدوڵای کوڕی سەبەئی باس کردبێت وەك ئەو نموونەی پێشوو، هەموو ئەمانە گونجاون، بەڵام دکتۆر کاتێك دەیەوێت نکوولّی لە شتێك بکات باکی لەوە نیە چاوپۆشی لە هەموو ئەمانە بکات تا ئەو رایە بخاتەڕوو کە خۆی حەزی پێ دەکات و پێی کاریگەرە، دواتر چۆن دکتۆر ئەوەی لەبیر چوو کە ئەوەی هەواڵێ دەگێڕێتەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی ئەو بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە، بەتایبەت کە هەردوو کەسەکە لە یەك چین بن وەك بەلازەری و تەبەری، بەڵکو لەوانەیە تەبەری بەهێزتر و زاناتر بێت و لە بەلازەری شارەزاتر بێت بە مێژوو و لێکۆڵینەوەی مێژوویی، دکتۆر رێیەکی گرتووەتەبەر شیاو بەو نیە، ئەمەش کاتێك نکوولّی دەکات لە بەسەرهاتی عەبدوڵای کوڕی سەبەء و بەسەرهاتی ساختەکردنی کوشتنی میصریەکان، لەکاتێکدا دەبینیت لەو نووسینەیدا چ نارەواییەکی لە توێژینەوەی زانستیدا گرتووەتەبەر.

دکتۆر تەها حوسەین رێرەوی زانست و زانایانی بەرداوە کاتێك بێ بەڵگە دەنەوێتە نکوولّی کردن، بێ ئەوەی بەڵگەیەی وای بەدەستەوە بێت بەلازەری پێش تەبەری دەخات، هەروەها بێ ئەوەی بچێتەوە سەر چاپەکانی تری کتێبەکە، بێ توێژینەوە لە هەمان ئەو کتێبەی زانیاریەکەی لێوە وەرگرتووە.

مەبەستەکەی ئەوەیە نکوڵی لەوە بکات جوولەکە لە دژایەتی عوسمان و کوشتنی پێشەوای موسڵمانانەدا پشکیان هەبووبێت، ئیتر ڕێی پێچەوانەی زانایانی گرتووەتەبەر لە جەرحی بەسەرهاتەکان و بە درۆدانانی گێڕەرەوان، بێ ئەوەی بەڵگەیەکی هەبێت، کەچی هەمدی بێ بەڵگە لە مەسەلەیەکی تردا بە ڕاستگۆیان دادەنێت.

بەوجۆرە دەبینین بانگەوازی شعووبیەت و باتینیەتی نوێ ڕێی زیندووکردنەوەی کەرەستەی بانگەوازی باتینی کۆنیان گرتووەتەبەر تا بیروباوەڕی ئیسلام بلەرزێنن و چەمك و واتاکان بشێوێنن، ئەمەش لەژێر ناوی زیندووکردنەوەی فەرهەنگ یان نەقدی ئەدەبیدا.

عەبدوڵا ئیبنولموقەفەع بازنەی دووەمی ئەو پیلانەیە کە عەبدوڵای کوڕی سەبەء دایڕشت، ئەم ناوە لە سەردەمی نوێدا زەق کراوەتەوەو توێژەرانی ئەدەبی عەرەبی زۆر گرنگی پێ دەدەن، بەرزیان ڕاگرتووەو هەوڵیان داوە بیکەنە ڕێبەری ڕەوانبێژی عەرەبی و بێئاگان لەو ڕۆڵە ڕاستەقینەی کە ڕەوانبێژانی ناو هاوەڵان پێش ئەم کەسێتیە پێی هەستاون، تەنها لەبەر ڕەوانبێژیەکەی ئەو گرنگیەی پێ نەدراوە، بەڵکو لەبەرئەوەی کە چەندین بەرهەمی ئەدەبی فارسی وەرگێڕاوە بۆ نێو ئەدەبی عەرەبی، بێگومان ئیبنولموقەفەع زۆر زۆرزان بووەو بە هەنگاوی ورد لێنەویوەو پیلانی گەورەی شعووبیەتی گرتووەتەبەر، ئەگەرچی دواتر دەستەکەی ئاشکرا بوو و سزاکەی وەرگرت، بەڵام بانگخوازانی ڕۆژئاواگەری لە سەردەمی نوێدا توانییان لە ڕێی

جیاکردنەوەی بەشەکانی ئەدەب لە جەستەی هزرو بەها ئیسلامیەکان چەندین کاری مەترسیداری شعووبیەت بڵاو بکەنەوە، توێژەران مەترسی و پیلانی ئەو کەسەیان هەست پێکرد و زانییان لەنێو پیلانی شعووبیەتدا چ پێگەیەکی هەیە تا ئەوەی بە گەورەترین دوژمنی ئیسلام ناوی دەبەن، زۆرترین ماوەی ژیانی لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەویدا بەسەر برد، ئەو ئایینی زەردەشتی گرتبوویە بەر چونکە قسەیەك هەیە دەڵێت بە گشتی رێورەسمەکانی مەجووسی ئەنجام دەدا، لە رایەکی تردا دەڵێت بەڵکو مەناوی یان مەزدەکی بوو، ئەو کتێبی ناسراوی مەزدەکی بە ناوی دیستاو وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی تا بیروباوەڕی مەزدەکی بڵاو بکاتەوە، خێرا لە سەردەمی یەکەمی عەبباسیدا چەندین دەستەی مەزدەکی دامەزران، هەروەك ئەو کتێبی (الدرة اليتيمة) ی دژ بە قورئان نووسی، کتێبی کلیلەو دمنەی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، تیایدا بابی بەرزەویە هەیە کە تەواو پێچەوانەی ئایینەکانەو تیایدا گومانی ئەوە دروست دەکات کە هیچ رێیەك نیە بۆ گەیشتن بە یەقین و دڵنیایی، تەنها عەقڵ بە گەورەترین و چاکترین پێناوی مەعریفە دادەنێت، تا ئێستاش کتێبی کلیلە و دمنە لەبەردەستی گەنجانماندایەو لەو کاتەوەی کتۆر تەها حوسەین داینا تا خوێندکارانی ناوەندی بیخوێنن بەردەوام گومان دەورووژێنێت، ئێستا لە ژێر ناوی رەوانبێژی عەرەبیدا لەبەر دەستی گەنجانماندایە، لەکاتێکدا ژەهری زۆری تێدایە، ئیبنولموقەفەع پێی وابوو دەبێت ملهوڕی بڵاو بکرێتەوەو خودی ئیسلام نەهێڵرێت، مەبەستی بەمەش گومان نانەوە بوو بۆ کەسانێ کە بیروباوەڕیان

لاواز بوو و بانگهێشتی دەکردن بۆ ئاینی مانەوە، عەللامە بیروونی لە کتێبەکەیدا (تحقیق ما للهند من مقولة) ئاماژە دەکات بە مانەوی بوونی ئیبنولموقەفەع و وتەی خەلیفە مەهدی سەبارەت بە ئیبنولموقەفەع دەخاتەڕوو کە دەڵێت چی کتێبێکی هەر زندیقێکم دیبێت بنەڕەتەکەی گەڕاوەتەوە بۆ ئیبنولموقەفەع.

بیروونی دەڵێت خۆزگە بمتوانیایە نووسینی سەرەکی کتێبەکەی رینج قنترم هەبوایە کە ئێستا ناسراوە بە کتێبی کلیلەو دمنە، چونکە ئەمە لە هیندیەوە وەرگێڕدراوەتە سەر فارسیو دواتریش لە فارسیەوە لەسەر زمانی کەسانێ وەرگێردراوە کە متمانە نیە بە دەربڕینیان وەك عەبدولڵا ئیبنولموقەفەع، چونکە بەشێکی بۆ زیاد کراوە بەناوی بەرزەویە کە تیایدا مەبەستیەتی گومان بۆ ئیمان لاوازان بنێتەوەو بیانشکێنێت تا بانگهێشتیان بکات بۆ رێبازی مانەوی.

دیارە بزووتنەوەی وەرگێڕان کە لە سەرەتای ئیسلامەوە دەرکەوت مەبەست پێی وەرگێڕانی لایەنە چاکەکانی هونەری زانستە یۆنانیە کۆنەکان بوو، بەلام مەجووسیەکان کە ئەو کارەیان گرتە ئەستۆ و پێشڕەوی ئەوانەش کە ئیبنولموقەفەع بوو ئەو ئاراستەیان گۆڕی رووەو فەلسەفەی ئیلاهیات، فەلسەفەیەك کە لای یۆنانەکان زانستی بتەکان بوو، جا ئیبنولموقەفەع لە دیدی مێژوونووساندا یەکەم کەسە کە ئیلاهیاتی یۆنان و فەلسەفەی یۆنانی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، دوار دوای ئەو مەسیحیە نەستووری و یەعقووبیەکان بزووتنەوەی وەرگێڕانیان گرتەئەستۆ، هەروەك ئیبنولموقەفەع لە زمانی

فارسیشەوە کتێبەکانی ئایینە کۆنەکانی فارسی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی و هێندەی نەبرد وەرگێڕان رووەو بتپەرستی و بێرەوشتی نێو فەلسەفە کۆنەکان رێی گرتەبەر، دیارترین کەسانێ لەو بوارەدا کاریان کرد بریتی بوون لە عەبدولا ئیبنولموقەفەع و ئال نەوبەخت و مووسا بن خالید و حەسەن بن سەهل و بەلازەری و زادەوەیە بن هاشەوەیە کە هەموویان مەجووسی بوون، ئەوان کتێب و ئەفسانەکانی مەجووسیەتیان وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی.

دکتۆر عەلی سامی نەججار لە کتێبەکەیدا (مقدمة مناهج البحث عند مفكري الإسلام) دەڵێت روزبەی کۆن و عەبدولا ئیبنولموقەفەع گەورترین کینەلەدڵ بوو بەرامبەر بە ئیسلام لە کۆندا، یەکەم هەنگاوی خۆی بۆ لەناوبردنی سیستمی کۆمەلایەتی ئیسلام خستەڕوو کە کتێبی مەزردەك بوو، دواتریش کتێبی بەرزدیە تا نەگونجاوی ئایینەکان بەتایبەت ئیسلام بسەلمێنێتو ئەوە بخاتەڕوو کە دڵنیایی لە ئیسلام بوونی نیە و نەگونجانی زۆری تێدایە و لەبەرامبەردا فەلسەفە دڵنیایی تێدایە و دەتگەیەنێت بە حەقی رەها، دواتر موحەممەدی کوڕی یەکەم وەرگێڕانی خۆی بۆ زانستی گومان پێشەکەش کرد و تیایدا ئەو وێنە گەورەی نیشاندا کە دڵنیایی یاسایەکی هەیە لە روانگەی ئەوەوە لە سەروو هەڵەوە رێنموونی دەنوێنێت، جا هەرکات موسڵمانان رایانگەیاند کتێبی پیرۆزیان هیچ هەڵەیەکی تێدا نیە ئەو کات ئەو ئاماژە بە (باب برزدیه) دەکات کە بڕیاری هەڵەیی قوئان دەدات و دەڵێت نەگونجانی تێدایە، بەڵکو رێی فەلسەفە رێی تەواوکاری دڵنیایە، دواتر بۆ پاڵپشتی ئەمانە پشت دەبەستێت بە وێنەی

مەنتیقی ئەرستۆتالیسی کە بە بڕوای ئەو بنیادی تەواوی دڵنیایی پێیە، بەوە رووزبەهـ مەجووسەیتی فارسی چاند و دواتر بەهەمی خۆی دا کاتێك چەند کۆڕبەندێکی مەترسیداری غەنووصیەت دەرکەوتن، هەروەك برێ فەلسەفەگەرا کە خۆیان بە موسڵمان نیشان دەدا نەوینە مەنتیق و بەرز و گرنگیان راگرت و لەسەروو هەموو دڵنیاییەکەوە دایاننا و هەوڵیان دەدا تێکەڵی بکەن بە هەموو زانستێکی ئیسلامی، کۆمەڵی ئیسلامیش بێئاگا نەبوو لەم هەموو کارەو خێرا مەنتیقی ئەرستۆییان خستە بەر توێژینەوەو شەنوکەویان کرد، ئینجا هەر لەسەر بنەمای قورئان و سوننەت و گەڕانەوە بۆ بنەما و بڕیارەکانی قورئانو سوننەت رێباز و بەرنامەی خۆیان دانا.

دکتۆر عەلی سامی نەشار دەڵێت جێگرەوەکانی زۆربە لەم سەردەمەدا زۆر و فرەچەشنو فرە وێنەن، بەڵام هەموویان لەبەرگیراوەی شێوێنراوی ئیبنولموقەفەعن، پێشتر ئیبنولموقەفەع شکستی هێنا و لەمڕۆشدا ئەوانیش شکست دێنن.

چەندین کەس بەرامبەر بە ئیبنولموقەفەع وەستانو ساختەی کارەکانی ئەویان ئاشکرا کرد، وێڕای ئەوەی بیروونی و ئیبن خەلەکان هێناویانە، قاسم بن ئیبراهیمی زەیدی کە لە ساڵی 246 ی کۆچیدا وەفاتی کرد، کتێبێکی نووسیوە بە ناو (الرد علی الزندیق اللعین ابن المقفع) تیایدا قاسم ئاماژەی بەوە داوە کە ئیبنولموقەفەع کەسێکی مانەوی بووە.

بانگخوازانی ڕۆژئاواگەری ئیبنولموقەفەع بەوە دەناسێنن کە هەڵکەوتەیەکی ناو بیری ئازاد و چاکسازێکی کۆمەڵایەتی بووە، بەڵام ئەمە ساختەکارییەکی ئەوانە تا وێنەی پاڵەوانی ببەخشنە ئەو شعووبیە مەترسیدارە، ئەو کەسەی کە هەموو سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن تا سەردەمی دەوڵەتی عەبباسی دەستی گرتووە بە بیروباوەڕی مەجووسی خۆیەوەو ئەوکات لەسەر دەستی عیسای کوڕی عەلی مامی مەنصوور موسڵمان بوو، بە عیسای وت دڵم ئیسلامی گرتووەو حەز دەکەم لەسەر دەستی تۆ موسڵمان بم، عیسا پێی وت با بە ئامادەبوونی سەرکردەکان و لەبەرچاوی خەڵکی بێت، بۆ بەیانی ئامادە بوو و دواتر خوانی ئێوارە هێنرا، ئەویش کەوتە نانخواردنو لەسەر نەریتی مەجووس نانی دەخوارد، عیسا پێی وت تۆ موسڵمانیت و هێشتا بەزمی مەجووست واز لێنەهێناوە؟! ئەویش وتی حەز ناکەم بەبێ ئایینی شەو بکەمەوە، هەندێ دەگێڕنەوە دوای موسڵمانبوونی دای بە لای ئاتەشگایەکدا و شیعرەکەی ئەحوەصی دەوتەوە:

يا دار عاتـكة التـي أتغـزل ... حذر العدا و بك الفؤاد موكـل

إني لأمنحك الصدود و إنني ... قسما إليك مع الصدود لأميل

بەو جۆرە دەبینین چۆن لە موسڵمانبوونیدا فێڵی کردووە، جاحز دەڵێت ئەو لەگەڵ موتیع بن ئیاسو ئیبنولحوباب و بشارد بن برد ئەبانی لاحقیدا مەی دەخواردەوەو بە شیعر هێرشیان دەکردە سەر یەکدی، هەریەك لەوانە تۆمەت لەسەر ئاییندارییان هەبوو، دەوترێت بەڵکو ڕەخنەی دەگرت لە قورئان.

له کۆتاییەکان ژیانیدا تۆمەتبار کرا به زەندەقەو سوفیانی کوڕی موعاویه که والی بەصره بوو کوشتی، مامۆستا جوەیدی ئیتالی له کتێبەکەی ئیبراهیم قاسمدا که بڵاوی کردووەتەوەو بریتیه له کتێبی (الرد علی اللعین عبد الله بن المقفع)، تیایدا چەند دێڕێکی نووسینەکانی ئیبنولموقەفەعی هێناوه که دژ به قورئان نووسیویەتیو تیایدا نووسیویەتی (باسم النور الرحمن الرحیم) تیایدا وەسفی ڕووناکی دەکات و به سەرچاوەی چاکەی دادەنێت و پێی وایه ڕووناکی دابەزیوه بۆ سەر موحەممەد، هەروەها وەرگێڕانی کتێبەکانی مانی و ئیبن لایصان و مرفیون له فارسیەوه لەلایەن ئیبنولموقەفەعەوه دەخاتەڕوو.

چەندین بانگخوازی ڕۆژئاواگەری وەك تەها حوسەین و ئەحمەد ئەمین و بوتروسی بوستانی له سەردەمی نوێدا هەوڵیان داوه بەرگری بکەن له ئیبنولموقەفەع، بەڵام له ئاست ئەو بەڵگەنامه بێگومانانەی که هەن ڕاکەیان وەرناگیرێت.

بێگومان نووسینەکانی ئەم کەسێتیه دیدی ئیبنولموقەفەع نیشان دەدەن. کتێبی خودای نامه یان ژیانی پاشایانی فارس و ئاسین نامه یان کتێبی المراسیه و التقالید و کتێبی التاج ی تایبەت به ژیانی ئەنوشیروان و کتێبی مەزدەك له ئەدەبدا و پەندە ئەخلاقیەکانی مەجووسیەتی وەرگێڕاوه، هەروەها کتێبی کلیلەو دمنه که بەشی بەرزەویەشی بۆ زیاد کردووەو مەبەستی لێی گومان نانەوەیه له دەروونی ئیمان لاوازاندا، وێڕای ئەوەی دەوترێت سێ کتێبه

مەنتیقیەکەی ئەرستۆ و کتێبی ئیساگۆجی فورفوریوسی صوری وەرگێڕاوە کە هەموو ئەمانە گومان لەسەر بیروباوەڕی ئیسلامی دروست دەکەن.

هلال الی ناجی ئاماژە بەوە دەکات عەبدولا ئیبنولموقەفەع کە کتێبی کلیلەو دمنەی وەرگێڕاوە، هەر ئەو کتێبی (ألف خرافه) ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی کە پوختەی کتێبی هەزار شەوەیە، بێگومان پێشەکیەکەی ئیبنولموقەفەع بۆ کتێبی هەزار شەوە تا ئەمڕۆش گومان دەخاتە دەروونەوە سەبارەت بە بتپەرستی مەجووسی و خراپی ئەو وێنەو هەموو چیرۆکە ژەهراوی و بێڕەوشتیانە دەخاتەڕوو کە تیایدان.

هەندێ هەوڵیان داوە ئیبنولموقەفەع وەك پاڵەوانێ نیشان بدەن لە رەخنەگرتن لە سیستمی دەسەڵاتداو دەڵێن ئەو بوو دەقی ئەو پەنایەی نووسی کە خەلیفەی دای بە عەبدوڵای کوڕی عەلی مامی کە راپەڕیبوو، ئیبنولموقەفەع لە پەناکەدا ئەم مەرجە فورسەی دانابوو (ئەگەر ئەمیری باوەڕداران پابەند نەبوو بەرامبەر بەوەی کە کردوویەتی ئەوە بەرییە لە خواو پێغەمبەرەکەی و ئوممەت مافیان هەیە لە دەسەڵات لایبەرن).

ئەوەی بڕوانێتە نووسینەکانی ئیبنولموقەفەع لە بواری سیستمی دەسەڵاتدا وەك لە (الدرة البهية) و (الادب الكبير) و (الأدب الصغير) دا هێناویەتی، بە روونی دەبینێت چ ئامانجێکی روونی هەبووە لە پیلانگێڕی دژ بە سیستمی دەسەڵاتی ئیسلامی بەو هیوایەی تێکی بشکێنێت و لە بەرژەوەندی پیلانی باتینی و قەرمەتی لاوازی بکات.

مقریزی دەڵێت ئیبنولموقەفەع پەنایەکی نووسی کە سنووری پەنای خەلیفەکانی بەزاند، هەموو ئەم ڕووداوانەم هێناوە تا لە لاپەڕەی تۆمەتەکانیدا هەبن:

یەکەم: ئیبن خەلەکان دەگێڕێتەوە خەلیفە مەهدی وتی هەر نووسینێکی زەندەقەم دیبێت بنەڕەتەکەی گەڕاوەتەوە بۆ ئیبنولموقەفەع.

دووەم: بەشی بەرزەویەی زیاد کرد بۆ کتێبی کلیلەو دمنە تا لەوێوە گومان لە دەروونی ئیمان لاوازندا درووست بکات.

سێیەم: کاتێك دوای موسڵمانبوونی شەوێك دای بە لای ئاتەشگایەکدا چی وت کە سۆز نواندنێ بوو بۆ ئایینە کۆنەکەی.

چوارەم: ئەو دەقانەی قاسم بن ئیبراهیم لە کتێبەکەیدا (الرد علی الزندیق اللعین) هێناویەتی کە ئیبنولموقەفەع دژ بە قورئان وتوویەتی و چ بە کەمی ڕێزی قورئانی گرتووە.

پێنجەم: مەسعوودی لە کتێبی (مروج الذهب) دا هێناویەتی ئیبنولموقەفەع و چەند ملهوڕێکی تر نووسینەکانی مانی و ئیبن دیصان و مرقینیان وەرگێڕا. هەروەك ئیبنولموقەفەع کتێبی مەزدەکی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی. صەفدی ئاماژە بەوە دەدا کتێبە قەدەغەکراوەکانی زندیقەکان زۆرێك لە ڕاو بۆچوونەکانی ئیبنولموقەفەعیان لەخۆگرتووە.

شەشەم: چەندین گێڕانەوە ئاماژە بەوە دەدەن کە ئیبنولموقەفەع پەیوەندی هەبووە لەگەڵ سەرکردەکانی شعووبیەتو ئەوانەی تۆمەتبار بون بە

زەندەقە هەر لە ئیقبال بقلی کە نکوولّی دەکرد لە زیندووبوونەوەو رۆژی دوایی و عەممار بن جەمزەو ئەبان لاحقی و سەهل بن هاروون و حەمماد عەجرەد.

حەوتەم: لای مەسعوودیو ئیبن خەلەکان و بیروونی و صەفدی ناوی ئیبنولموقەفەع پەیوەندی هەیە بە تۆمەتی زندیق بوونیەوە، جوەیدی دەلّیت زۆر کەم ڕێزی دەنواند بۆ قورئان و هەولّی دەدا بەرنگاری بێتەوە.

جبریللی رۆژهەلاتناس کتێبێکی نووسیوە سەبارەت بە ئیبنولموقەفەع باسی ئەوەی کردووە کە ئەو دێڕانەی ڕەخنەگرتنن لە ئایین لە بەشی بەرزەوەیهدا دانراوی ئیبنولموقەفەعن و بێ ئەوەی بە روونی بیروباوەڕی ملهوڕی خۆی روون بکاتەوە ئەوەی داناوە، هەروەها دەلّیت هەموو ئەو بەشە بەوپەڕی وێران لە بیرکردنەوەو و سنووربەزێنیدا هێشتا ناتوانێت بەناوی نووسەرەکەیەوە بنووسرێت و بلاوبکرێتەوە لە بازنەی کۆشکی فارسی ساسانیدا لەکاتێکدا ئایینە رەسمیەکەی مەزدەکی بوو، یان لەنێو کۆمەلّگەی ئیسلامی سەدەی هەشتەمی زاینیدا بلاو بکرێتەوە، بەلام ئەگەر زۆرە گومان زالّ بووبێت، وەك چۆن عەقلّی ئیبنولموقەفەع لەو پارچە نووسینەدا راوبۆچوونی خۆی خستووەتەڕوو، ئێمە بڕوامان نیە ئیبنولموقەفەع لەو تەمەنی پێگەیشتن و پیاوەتیەیدا پابەندی مەجووسیەت بووبێت و لە رووی عەقلّیەوە بڕوای پێ بووبێت، بەلام دەکرێت هەواداری هەبووبێت بۆ ئایینێکی کۆنی فارسی، ئەویش لە روانگەی سۆز و ژیاریەوە.

هەروەها جبریللی جەخت دەکاتەوە لە بیروباوەڕی مانەوی ئیبنولموقەفەع و راستی ئەوەی بەشی بەرزەوەیە لە کتێبی کلیلەو دمنەدا نووسینی ئیبنولموقەفەع بووە، هەروەها ئەو کتێبەش کە قاسم بن ئیبراهیم لە وەڵامی ئیبنولموقەفەعدا نووسیویەتی دەڵێت ئیبنولموقەفەع بە شێوازێکی مشتومڕی فەلسەفی و بەڵگەی عەقڵی وەڵامی قورئانی داوەتەوە، ئەمە وایکردووە لە ئیمامی قاسمی تا بە هەمان چەکی دەستی موعتەزیلەکان لەو ماوەدا بەرپەرشی نووسینەکەی ئیبنولموقەفەع بداتەوە.

کرۆسی رۆژهەڵاتناس دەڵێت نوسخەی ئەسڵی فەهلەوی هەمان دەق بری وتەی گومانبەخش سەبارەت بە ئایینەکان لەخۆدەگرێت کە ئیبنولموقەفەع کردوویەتی بە بنەمای ئەو زێدە نووسینەی کە دایناوە، وێڕای هەموو ئەمانە دەبینین هەموان لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە ئیبنولموقەفەع پەیوەندی هەبووە بە مانەویەوەو بەرگری لە نەیارانی دەوڵەت کردووەو رەخنەی گرتووە لە سیاسەتی خیلافەت و بانگەوازی بۆ ئەوە کردووە رێرەوی فارسی بۆ شارستانیەت بگیرێتەبەر.

هەروەها ئیبن سینا یەکێکە لەو ناوە دیارانەی کە بزووتنەوەی رۆژئاواگەری و شهووبیەت لە سەردەمی نویچدا هەوڵیانداوە ئاسۆی ناوبانگی زیاد بکەن و لەپێناو هەوڵی زیندووکردنەوەو نوێکردنەوەی فەلسەفەی کۆندا بەرگری ی بکەن، ئێمە لە بواری پزیشکیدا هیچ رەخنەیەکمان لە ئیبن سینا نیەو بە پێشەنگی ئەو بوارەی خۆی دەزانین، ئەگەر تەنها گرنگی بەو بوارە زانستیەی

بدایە هیچ گلەییەکی لەسەر نەدەبوو، بەڵام ڕۆژهەڵاتناسان و موژدەبەران فوو دەکەن بە راو دیدە فەلسەفیەکانی ئیبن سینادا و ئەو بوارەی بەرز رادەگرن و لەسەروو هەموو کەسێتیەکانەوە دایدەنێن و کەسانی دیاری نێو رەوتی رەسەنایەتی ئیسلامی وەك بیرونی و کەسانی دی وەلا دەنێن.

لەکاتێکدا بەڵگەنامەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ئیبن سینا سەر بە رێبازی ئیخوانوصەفا و باتینیەت بووەو نووسینەکانی ئەو هێما و نهێنیانەی لەخۆ گرتووە کە هەڵگرانی پیلانی نهێنی دژ بە ئیسلام دایاننابوو، ئیبن سینا زۆر عەقڵی بەرز رادەگرت و لەوەدا دەتوت موعتەزیلەکانەو لەوانیش زیاتر، بەڵکو بانگەوازی دەکرد بۆ سوڵتانی عەقڵ و پیرۆزراگرتنی عەقڵ، ئەمەش شوێنکەوتنی رێبازی هیلینی یۆنانی بوو و لە ئیسلامدا بنەڕەتێکی نەبوو، ئەمە کە رەخنەیەکە لە ئیبن سینا، لە هەمان کاتدا لای رۆژهەڵاناس و شعووبیەکان گەورەیی و رێزە بۆ ئیبن سینا، ئیبن سینا لەو هەنگاوەشیدا هەر لەخۆوە تێنەکەوتبوو، بەڵکو ورد دەیزانی چی دەکات چونکە ئەو لە بانگخواز و رێبەرانی باتینبەت بوو.

هەوڵی ئیبن سینا بۆ گونجاندی فەلسەفەی یۆنانی لەگەڵ ئیسلامدا کارێکی بە ئامانج بوو کە کەسی باوەڕدار شتی وا ناکات، چونکەە ئەوە واتە ملکەچ کردنی بیروباوەڕی یەکخواپەرستی بۆ فەلسەفەی بتپەرستی بێرەوشتی یۆنانی، هەر ئەمە لەناوبەری ئیبن سینا بوو، چونکە ئەو ئاراستەی ئیبن سینا و فارابی لەسەری رۆیشتن، هەمان رێ بوو کە باتینیەکان نەخشەیان بۆ کێشا و

بانگەوازیان بۆ دەکرد و ئیخوانوصەفا ئاماژەیان پێدابوو، پێشەوا غەزالی لە کتێبەکەیدا (تهافت الفلاسفة) ئیبن سینای بە کەسێکی بێباوەڕی لە ئیسلام دەرچوو ناوبردووە، ئەمەش لەبەرئەوەی بڕوای هەیە بە دێرینەبوونی ئیسلام و دەڵێت خوا تەنها شتە گشتیەکان دەزانێت و ئاگادار نیە بە وردەکاریەکان. هەروەها بڕوای نەبوو بە زیندووبوونەوەو رۆژی دوایی.

هەرچەندە ئیبن سینا هەوڵی داوە بەرگری لە خۆی بکات و نکوولی بکات لە بوونی پەیوەندی لەگەڵ پیلانی باتینیدا، بەڵام رووداوەکانی ژیانی ئەو هەواداریەی نیشان دەدەن، هەروەك سەرچاوە ئیسماعیلیەکان جەخت لەوە دەکەنەوە ئیبن سینا باتینی بووە، بەڵکو ئەو کاریگەر بوو بە فەلسەفەی موعتەزیلە.

مامۆستا ئیبراهیم خاڵ باس لە باتینی بوونی ئین سینا دەکات (مجلة الرسالة العراقية: أيلول 1972) و ئاماژە بەوە دەدات ئیبن سینا بیرۆکەی فەیزی ئەفلۆتینی هێنایە نێو فەلسەفەوە، ئەمەشی لە فارابی و ئیخوانوصەفاوە وەرگرتبوو، هەروەها دەڵێت ئیبن سینا بەری داریَ بوو کە دامەزرێنەرانی بانگەوازی ئیسماعیلی لە خاکی یۆنانیدا ناشتیان.

زیاتر لەو بارەوە دەوێت و دەڵێت ئەوەی لە ژیانی ئیبن سیناوە دەیبینیِ ئەوەیە پیاوی دنیا و سیاسەت بووە، فەیلەسووفی سەردەمیَ بووە کە سیاسەت و دین دوو دیدی ناو دەوڵەت و دەسەلات بون، بووە بە وەزیری هەندیَ لە سەرکردە بوەیهیەکان، ئەوانەش زەیدی بوون، هەروەها چەند جار لەبەر

هۆکاری سیاسی کەوتۆتە بەر مەترسی گرتن و کوشتن، پزیشکی عەلائودەولە بوو کە لەبەر وابەستەیی بەوەوەو تۆمەتی زندیقیشی درایەپاڵ.

خەڵکی لە ئەصبەهان وەك زندیقێك سەیری ئیبن سینایان دەکرد، ئەویش لەبەرئەوەی کە زۆر خەریکی رابواردن بوو، لە ژیانیدا دیدێکی ئەبیقۆری رۆچوو لە ئارەزوو بازی گرتبوویەبەر، ئیبن خەلەکان وا وەسفی دەکات لە کۆتا رۆژان تەمەنیدا تەواو لە خواردن و ئارەزووبازیدا رۆچووبوو، ئیبن سینا دوژمنێکی سەرسەختی سوڵتان مەحموودی غەزنەویش بوو، غەزنەویەکان دوژمنی بیری ئیعتیزال و باتینیەت و فەلسەفەی ئیلاهی بوون، ئەگەر سوڵتان دەستی پێی بگەیشتایە ئەوە بە دڵنیاییەوە دەیکوشت، پێش ئەوەی سوڵتان بگاتە رەی، ئیبن سینا رایکرد، جا ئەو هەمیشە لە دەست غەزنەویەکان لە شوێنێکەوە رایدەکرد بۆ شوێنێکی تر، غەزنەویەکان هەواداری دەوڵەتی عەبباسی بوون، ئیبن سیناش لە شیعەی دوانزە ئیمامی نەبوو، چونکە باوکی باتینیەکی ئیسماعیلی بوو، ئەو ماڵەش کە تیایدا گەورە بوو هەمیشە کراوە بوو بۆ بانگخوازانی ئیسماعیلی، واتە بۆ نێردراوانی فاتیمیە دەسەڵاتدارەکانی میصر کە چاویان لە دەسەڵاتی رۆژهەڵاتی ئیسلامیش بوو، هەواداری ئیبن سینا بۆ فاتیمی و ئیسماعیلیەکان بە نهێنی بوو، ئیبن سینا هەر لە هەرزەکاریەوە ئاراستەیەکی ئیسماعیلی وەرگرت، ئەمەش کاتێك باوکی ناردی تا زانستی بیرکاری و فەلسەفە بخوێنێت، بە پاڵنەرێکی بیروباوەڕی باوکی ئەو رێرەوەی

گرتەبەر، ئەمە بوویە بنەڕەتی سەرەکی بۆ بیروباوەڕی ئیسماعیلی، ئەمەش دیوی دووەمیەتی لە بەرامبەر دیوە ڕۆحانیەکەیدا.

باتینیەکان تەواو بروایان وابوو کە فەرهەنگی بیری یۆنانی فەرهەنگی تایبەتی ئەوانەو فەیلەسووفانی وەك سوقرات و ئەفلاتوون و فیساگۆرس و ئەرستۆ و ئەفلۆتین فەیلەسووفانێکی ئیسماعیلین، باتینیەت لە روانگەیەکی بیروباوەڕی ئەوانەوە فەلسەفە و خوێندنگەیەکی فەلسەفیە کە بیری یۆنانی تیایدا گەشەی کردووە، ئەوان سروشت و هەرچیەك پەیوەندی بە سروشتەوە هەیە هەر لە گەرما و شێ و وشکی و چوار وەرزی ساڵ و پێکهاتەی جەستەی مرۆڤ و هەسارەکان و دەریاو کانزا لەسەر بنەمای ژمارە تایبەتەکان تەماشا دەکەن وەك ژمارە (12/7/4) ئەمەش بەپێی ئەو بیردۆزانەی لە پەیامەکانی ئیخوانوصەفادا هاتون و لە فەلسەفەی بیرکاری و ژمێرەیی فیساگۆرسەوە وەرگیراوە.

ئەو سەرچاوە باتینیانە جەخت لەوە دەکەنەوە پەیامەکانی ئیخوانوصەفا لەلایەن چەند زانایەکی ئیسماعیلی بە فەرمانی پێشەوای ئیسماعیلی (ئەحمەدلوافی) دانراون کە لە رۆژانی دەسەڵاتی مەئموونداخۆی شاردبوویەوە. بەلام ئەوان ناوی نووسەرەکانی نازانن.

سەبارەت بە ئەودیو سروشت (ئیلاهیات) پشت دەبەستن بە بیردۆزەی فەیر کە ئیبن ئیسنا لە فارابی و ئیخوانوصەفاوە وەریگرتووە، ئەو بیردۆزەیە لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە سەر ئەفلۆتین و خوێندنگەی ئەسکەندەریەو پوختەکەی

لای ئیبن سینا ئەوەیە کە خوا تەنها عەقڵێکی پەتیەو لە خۆی تێدەگات و هەمیشە لێی رادەمێنێت، تەعەقولیش هۆکاری بوونە، بۆیە لەبەر پێویستی یەك بوون لە خواوە دەرچووە کە ئەویش عەقڵی یەکەمەوە، لەویشەوە عەقڵی دووەن دەرچووە، ئەویش بڕێ تایبەتی لێکەوتۆتەوە تا هاتووەتە سەر عەقڵی دەیەم کە ئەو عەقڵە کارایە کە ئەم جیهانەی ئێمیە لێکەوتۆتەوە کە تیایدا دەژین.

ئەم عەقڵانە جیاکارانەی ماددە لای فەیلەسووفە یۆنانیەکان زیاد لە پەنجا عەقڵن، بەڵام فارابی و دواتر ئیبن سینا فەیزیان لە عەقڵی دەیەمدا وەستاندووە تا لەگەڵ قۆناغەکانی بانگەواز و ئایینی فاتیمیەکاندا بگونجێت، ئەوان پێیان وایە:

عەقڵی یەکەم بریتیە لە پلەی تەنزیل،

دووەم بریتیە لە پلەی تەئویل (بنەڕەتی)،

سێیەم بریتیە لە پلەی فەرمان (پێشەوا)

چوارەم بریتیە لە پلەی جیاکردنەوەی گوتار (بەش)

پێنجەم بریتیە لە چلەی حیکمەت (بەڵگە)

نووسەری کتێبی (تأريخ الدعوة الإسلامية) نای بانگخوازەکانی هێناوە: ئیبن حەوشەب، کرمانی، ناصر خەسرەو، ئیبن سینا، فارابی، ئیخوانوصەفا، رازی، سجستانی، لەمەوە دەردەکەوێت ئیبن سینا باتینیەکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو

بەو پێیە بانگخوازێ بووە بۆیە یەکێك بووە لە قوتب و جەمسەرەکانی نێو بانگخوازانی باتینیەت.

ئیبن سینا کە فەلسەفەی گرتووەتەبەر، ئەوکات فەلسەفە ملکەچی بیروباوەڕی باتینی ئیسماعیلی دەکات، بۆیە ئەنجامی توێژینەوە فەلسەفیەکانی لەگەڵ پلەکانی ئەو بانگەوازەدا هاوتا دەکات کە هەر لە پێش سەردەمی فارابی ولە رۆژانی ئیخوانوصەفا لە سەردەمی مەئموونەوە هەبووە.

بیردۆزەی فەیزی ئەفلۆتینی یەکێکە لە مەترسیدارترین بیردۆزە میتافیزیقیەکان کە بیروباوەڕی باتینی وەریگرت، ئەویش لەبەرئەوەی پەیوەست بوو بە ئیمامی مەعصوومی باتینیەوە کە لای هەوادارانی ئەو بیروباوەڕی هەندێ جار دەگاتە ئاستی داهێنەری زات واتە عەقڵی تەواو و پلەی خوایەتی.

ئیسماعیل مەحفووز کتێبێکی هەیە بە ناونیشانی (کتاب المحصول)، تیاد دەڵێت پێشەوا زاتی خوایی هەیە و ژیانی هەمیشەییەو لە ئامانجەکاندا لە لووتکەیەو زاتی داهێنەرەو سیفەتەکان دادەهێنێت و داهێنەری داهێنانە.

هەروەها سەبارەت بەوەی دەڵێن ئەگەر پێشەوا لە شێوەی جەستەد دەرکەوێت لەبری ئەوەی ناوێ لە ناوەکانی خوا و سیفەتێ لە سیفەتەکانی خو بێت، هەروەها ئەگەر بالا قسەی کرد ئەوە لە حەقیقەتدا خوایە.

سەبارەت بە بیردۆزەی فەیز ئەوە پایەی نەزەریەی بیروباوەڕی باتینیە.

ئیبن سینا پێی وایە خوا ئاگاداری شتە گشتیەکانە بەڵام ئاگاداری وردەکاریەکان نیەو ئەگەر خوا ئاگاداری وردەکاریەکانیش بێت تەنها ئاگاداری واتاکانیەتی نەك ئاگاداری کەسەکانی بێت، ئەمەش بە تەواوەتی پێچەوانەی چەمكو واتای سوننەتە.

ئەم کابرایە کە بە پەروەردەیەکی باتینی گەورە بوو لە سەرەتای خوێندنیەوە دیدێکی باتینی گرتەبەر، کەسی دڵسۆزی بوەیهیەکان نەبوو و دوژمنی دەوڵەتی غەزنەوی و عەبباسیەکانیش بوو، چونکە فاتیمیەکان دوژمنایەتییان لەگەڵ عەبباسیەکاندا راگەیاندبوو، فەلسەفەی ئەم کابرایە لە هەردوو دیدی میتافیزیقی و رۆحانیدا تەواو لەگەڵ بیروباوەڕی باتینیدا دەگونجێت، ئەمە وێڕای ئەو سەرچاوە باتینیە باوەڕپێکراوانەی کە جەخت لەوە دەکەنەوە ئیبن سینا یەکێك بووە لە گەورە بانگخوازانی باتینیەت.

بێگومان ئەو بابەتەی کە مامۆستا ئیبراهیم خاڵ لە کتێبەکانی باتینیەوە وەریگرتووەو تیایدا پشتی بەستووە بە کتێبەکەی دکتۆر موحەممەد کامیل حوسەین بە ناونیشانی (تاریخ الدعوە الاسماعیلیە) تەنها ئەو زانیاریانە بەسن تا هەڵوێستی ئیبن سینا و دژمنایەتی بۆ هزری ئیسلامی قورئانی بخەنەڕوو، بەڵکو بڕوای بەوە هەبووە کە موسڵمانان بڕوایان پێ نەبووە، بێگومان ئەو فەلسەفانەش کە تایبەتن بە دە عەقڵەکەوە زادەی بیری شێواوی ئەفلۆتینین و هێشتا لە زانکۆ و خوێندنگەکانماندا وەك بیردۆزەی فەلسەفی دەخوێنرێن،

لەکاتێکدا ئەو فەلسەفانە ژەهری دژ بە پەیامی یەکخواپەرستی و ئیسلامی دروستیان لەخۆ گرتووە.

پێویستە کاتێك ئەو وانانە دەوترێنەوە، ئەو پاشخانەش بخرێتەڕوو کە هەیانەو بریتیە لە هەوڵی گەورەی پیلانی باتینی بۆ بەکارهێنانی ئەو فەلسەفانە لەپێناو شێواندنی عەقڵیەتی ئیسلامی و کارتێکردنی، ئەو بیرە بتپەرستیە لە سەردەمی نوێدا لەرێی رۆژهەڵاتناسیو موژدەبەریو بانگخوازانی رۆژئاواگەریەوە نویێ دەکرێنەوە بێ ئەوەی کەس ئاگادار بکرێتەوە لە مەترسی و گرفتەکانی ئەو بیرە بتپەرستیە.

فەلسەفەی تایبەتی ئیبن سینا جەخت لە سێ مەسەلە دەکاتەوە: مەسەلەی فەیز و دەروونی مرۆیی و بیردۆزەی مەعریفەی ئیشراقی و ئەو بیردۆزانەی لەخۆیان دەگرێت تایبەت بە پێغەمبەرایەتی و موعجیزەو تەصەوف.

یەکەم: بیردۆزەی فەیز: ئیبن سینا داهێنەری نەبوو، بەڵکو پێش ئەو ئەبوونەصری فارابی لێی نەوی، بەڵام ئیبن سینا کەوتە روونکردنەوەو پاڵپشتی کردنی، بەجۆرێ هەندێ جار وا باسی ئیبن سینا دەکرێت کە ئەو داهێنەری بووە، ئەمەش هەوڵێکە پشت دەبەستێت بە گونجاندنی بنەماکانی ئەفلاتۆنی و ئەرستۆتالیسی و ئیسلامی، هەریەك لە فارابی و ئیبن سینا ئەوەیان لە ئەرستۆوە وەرگرتووە کە خوا عەقڵێکی تەواوەو درك بە خۆی دەکات، ئەوەشیان لە ئەفلۆتین وەرگرتووە کە بوون قۆناغی هەیە، ئەوەشیان لە موتەکەلیمەکان وەرگرتووە کە واجب و مومکین لەیەك جیان، ئەوەشیان لە

صۆفیگەرایی وەرگرتووە کە پەیوەندی لەگەڵ عەقڵی هەمیشەیی و زاتی خوایی هەیە، غەزالی پێی وایە ئیبن سینا بیردۆزەی فەیزی وەرگرتووە تا دێرینەبوونی جیهان بسەلمێنێ، ئیبن روشد پێی وایە بیردۆزەی فەیز لای فارابی و دواتر لای ئیبن سینا براوەتە نێو فەلسەفەی حەقەوەو هەردووکیان بە درۆزنی تۆمەتبار دەکات، هەریەك لە فارابی و ئیبن سیناش بە داهێنەری ئەو ئەفسانانە دادەنێت و دەڵێت دواتر خەڵکی شوێن ئەوان کەوتن و هەموو ئەوانەش خورافەو ئەفسانەن‌و زۆر لاوازترن لە وتی وتی موتەکەلیمەکان.

دووەم: سەبارەت بە بابەتی دەروونی مرۆیی ئیبن سینا راکانی فارابی وەرگرتووە و دەستکاری و زێدەکاریەکی زۆری بۆ کردووەقەصیدەی نەفسی ئیبن سینا کاریگەری زۆری بە راکانی ئەفلاتوون نیشان دەدات.

سێیەم: سەبارەت بە فەلسەفەی ئیشراقی تایبەت بە پێغەمبەرایەتی و سروش و موعجیزەو دەقەکان، ئەوە بیردۆزەی فەیز دەبەستێتەوە بە بیردۆزەیەکی ماددیەوە کە ئەویش بیردۆزەی وەحدەتولوجوودەو پێی وایە خوا گەورە دەردەکەوێت و لەگەڵ هەموو بەدیهێنراوێکیدا یەکدەگرێت، پێی وایە کەراماتی عارفەکان وەك موعجیزەی پێغەمبەران وایەو کەسی عارف گەیشتە لووتکە ئیتر ئەرکی لەسەر نامێنێت چونکە ئەرك بۆ کەسێکە لە ئەرك تێبگات.

ئەمە قسەیەکی پووچ و بێ بنەمایەو لەگەڵ پەیامی رەسەنی ئیسلامدا ناگونجێ، چونکە ئیسلام دان نانێت بە نەمانی ئەرك لەسەر هیچ موسڵمان و هیچ پێغەمبەرێکیش.

ئیبن سینا لەمەدا نزیکە لە ئسلووبی باتینی با جۆرە بەرگێکی بریقەداری صۆفیگەرایی پۆشیبێت، مەترسیدارترین بۆچوونی بریتیە لە یەکسانکردنی موعجیزەو کەرامات و جادوو کە ئەزموونی کاهینە بتپەرستەکان دەکاتە بەڵگە، ئەو موعجیزەو جادوو و کەرامات دەباتەوە بۆ کاریگەری هێزە دەروونیەکان بە بەشە ئاسمانیەکان.

ئیبن سینا لە کۆتایی کتێبەکەیدا (الإشارات و التنبیهات) پێناسی شاراوەی خۆی ئاشکرا دەکات وەك بڵێی زانایەکی تایبەتمەند بێت، لەو وەسیەتەیدا کە بۆ شوێنکەوتەکانی جێهێشتووە رۆحیەتێکی روونی باتینی دەخاتەڕوو و رێبازێکی راشکاوانەی باتینی هاوشێوەی رێبازی ئیخوانوصەفا و فەلسەفەی ئیسماعیلی دەخاتەڕوو، ئامۆژگاری شوێنکەوتەکانی دەکات نهێنیەکانی حیکمەتی شەرقی تەنها بلۆ کەسێك بخەنەڕوو کە پاکو پوخت بڕوایان پێ هەیە، داوای لە دڵسۆزانی کرد لە بازنەیەکی داخراودا وانە بخوێنن و وانەی دەروونی بە کەسێك بڵێنەوە کە دەیانەوێت بۆ نێو مەزهەبەکەی خۆیان رایکێشن، هەروەها بەڵێن لە موریدەکان وەربگرن تا لەگەڵ ئەوانەی دواتر پێیان رادەسپێردرێت رێی ئەوان بگرنەبەر، ئەوانەی ئەرکی راکێشانی ئەو خەڵکەیان هەیە بۆ نێو ئەو رێبازە نهێنیە باتینیەیان، ئەم وەصیەتانە لە وەصیەتەکانی باتینیەکان دەچن.

دکتۆر موحەممەد قاسم باسی ئیبن سینا دەکات و پەردە لەسەر نهێنی ئەو کەسێتیە لادەباتو دەڵێت ئیبن سینا زۆر سوور بوو لەسەر تەئویلکردنی دەقە ئاینیەکان و تەئویلێکی باتینی بۆ دەکرد تا وای لێ بکات بگونجێت لەگەڵ

فەلسەفە تایبەتیەکەیدا کە بە پلەی یەکەم فەلسەفەی ئیشراقیە، ئەمە هەمان ئەو فەلسەفەیە کە گوازرایەوە بۆ ئەورووپا، هەروەها ئاماژە دەدات بە ژیانی تایبەتی ئیبن سینا و دەڵێت ئێوارانی تایبەت کردبوو بۆ خواردنەوەو گوێگرتن لە گۆرانی و چێژوەرگرتن، زۆر زێدەڕۆیی دەکرد و گوێی نەدەدا بەو نەخۆشیەی کە تووشی بووبوو و لە خواردن و خواردنەوەیدا دەستی نەدەگرتەوە، ئیتر نەخۆشیەکەی لێی توند کرد و لە تەمەنی چەنجاو حەوتساڵیدا مرد، بیردۆزەکەی سەبارەت بە فەیز لە دە عەقڵەکەی بەتلیمۆسەوە وەرگیراوە، هەروەك لە قەصیدەی نەفسدا کاریگەر بووە بە راکانی ئەفلاتوون.

هەمان تۆمەتیش ئاراستەی فارابی دەکات، چونکە ئەویش باتینیەکی تەواو بوو، بەڵگەش بۆ ئەوە راڤەکردنی شیعەگەرانەیە بۆ پێغەمبەرایەتی کە لەسەر بنەمای رێنماییەکانی شیعەی دوانزە ئیمامی راڤەی دەکات، فارابی بە یەکەم کەس دادەنرێت کە لە هزری ئیسلامیدا بیردۆزەیەکی صۆفیگەرای فەلسەفی دامەزراند، صۆفیگەرایی فارابی لەسەر گرتنەوەی دەروون یان دوور گرتن لە ئارەزووەکان نەوەستاوە، بەڵکو تەصەوفێکی نەزەریە کە پشت دەبەستێت بە توێژینەوەو رامان، لە دیدی ئەودا پاکڕاگرتنی دەروون لەرێی جەستەو کارە جەستەییەکانەوە نابێت، بەڵکو لە رێی عەقڵەوە دەبێت، لای ئەو بەختەوەری ئەوەی دەروونی مرۆڤ بچێتە کەمالی بوونەوە و ئیتر پێویستی بە مادده نەبێت، هەموو ئەو چەمکو پەیامانەش لە فەلسەفەی هیلینیەوە وەرگیراون نەك لە پەیامی ئیسلامەوە.

بانگەوازی باتینیەت نموونەی مەترسیداری بانگخوازانی بەرهەم هێنا، وەك ئیبن راوەندی کە بەرهەمی فەلسەفەی یۆنانی بوو، ئیبن راوەندی بانگەشەی ئەوەی دەکرد تەنها هزرێ قبوولّ دەکات کە ملکەچی مەنتیقی عەقلّی مرۆیی بێت، بە روانینی ئەو پەیامی پێغەمبەران پێویستی بە سروشی ئاسمانی نیە. چونکە ئەوەی پێغەمبەران وتوویانە لە توانای عەقلّدایەو دەکرێت مرۆڤ بێ بانگەوازی پێغەمبەران ئەو شتانە بزانێت، چونکە ئەو پەرستش و رێورەسمانەی پێغەمبەران داوایان لە خەلّك کردووە پەیڕەویان بکەن عەقلّ دەتوانێت بیانلّێت. موعجیزەکانی پێغەمبەرانیش لەگەلّ عەقلّدا ناگونجێن و دەکرێت گێڕەرەوەکانی درۆیان کردبێت، ئایەتەکانی قورئان لە توانا بەدەر نین و دەکرێت تاکێك بە توانای ئەدەبیەوە بتوانێت سەروو رەوانبێژانی زمانی عەرەبی لەو چەشنە پەیامە دابڕێژێت.

ئەم ژەهر و گومڕاییانەی ئیبن راوەندی وایکردووە بانگخوازانی رۆژئاواگەری لەم سەردەمەدا گرنگی پێ بدەن و بیرەکەی نوێ بکەنەوەو سەرلەنوێ قسەی لەسەر بکەن تا ئەو گومانانە بخەنە پێش چاوی گەنجی موسلّمان و بیکەنە قسەی سەر زارو باسوخواسیان، پێیان وایە دەتوانن بەو کارەیان بزاڤی بێداریخوازی ئەمڕۆی ئوممەتی ئیسلام بشێوێنن، لێرەوە زۆر لە توێژەران گرنگییان دا بە ئیبن راوەندی، پێشڕەوی ئەوانەش عەبدوڕەحمانی بەدەویە کە ئەو بیروڕایانەی بلّاو کردووەتەوەو بە باشی داناون، لەراستیدا ئەو بیروڕایانە برێ گومانی پڕوپووچن کە هەر کەسێکی کینەلەدلّ و بە ئامانج دەتوانێت

بڵاویان بکاتەوە، بەڵام کەس لەخشتە نابەن بەتایبەت هەرکەس ژیانی ئیبن راوەندی بخوێنێتەوەو ئەوە بزانێت ئەو کەسێکی بە رەچەڵەك فارس و لە بنەڕەتێکی جوولەکە بووەو باوکی جوولەکە بووەو داتر موسڵمان بووەو بەردەوام پەیوەندی بە مەجووسیەتی فارسیەوە ماوەتەوە و پەیوەندی هەبووە بە پیلانی باتینیەوە، هەروەها ئیبن راوەندی بە دووروویی ناسراوەو پێنووسی خۆی بە هەموو رەوت و مەزهەب و ئایینەکان فرۆشتووە، بۆیە بۆ هەریەك لە جوولەکەو رافیزە کتێبی نووسیوەو دیارترین کتێبی (الزمردە) یە کە هەوڵیداوە تیایدا نارەوایی پەیامی پێغەمبەران باس بکات، ئەبولحەسەن خەیات لە وەڵامی ئەو کتێبەدا کتێبێکی نووسیوەو ساختەو ناراستیەکانی خستووەتەڕوو و ملهوڕی ئیبن راوەندی سەلماندووە، ئیبن راوەندی پەیوەندیەکیشی هەبوو بە موعتەزیلەوەو لەوانەوە فێری مشتومڕی مەنتیقی سەرشێوێن بوو، فێر بوو چۆن گومان لەسەر ئیسلام بخاتەڕوو.

زانای فەرموودەناس ئیبنولجەوزی دەڵێت زندیقەکانی ئیسلام سیانن: ئیبن راوەندی و ئەبووحەییان و ئەبولعەلاء، دەگێڕێتەوە یەکێك لە جوولەکەکان سەبارەت بە ئیبن راوەندی بە یەکێك لە موسڵمانانی دەوت ئەمە کتێبەکەتان لێ دەشێوێنێت وەك چۆن باوکی تەوراتی لە ئێمە شێواند، باوکی لەبەر هۆکارێ لە دەستەکەی خۆی جیابوویەوەو کەوتە هێرش بردنە سەریان و مشتومڕ و ئاژاوە نانەوە بۆیان، کوڕەکەشی دواتر هەر ئەوەی کرد، ئەگەر ئەوەی دەیەوێت بۆی نەهاتەدی لە داخی هاودینیە جوولەکەکانی دەبێتە مەسیحی.

بەلخی دەڵێت ئیبن راوەندی سەرەتا کەسێکی باش بووەو ڕێبازی دروستی گرتبوویەبەر، دواتر لە دین دەرچوو و ملهوڕی نیشاندا و بوو بە زندیق و لەبەر ئەوەی کتێبی زۆری دژ بە ئیسلام نووسی، بۆیە موعتەزیلەکان دەریان کرد.

ئیبن راوەندی لە گەرمەی گەنجیدا ملهوڕ بوو، بەڵام زۆر لە موسڵمانان شارەزاتر بوو بە ئیعجازی قورئان، بۆیە کتێبێکی نووسی بۆ جوولەکەو تیایدا بەرپەرچی موسڵمانانی دەدایەوە، دواتر خۆی هەڵیوەشاندەوەو دواتر کتێبی (الامامە) ی نووسی بۆ رافیزەکان، ئەمەش بەرامبەر وەرگرتنی سی دینار، لە بواری یەکخواپەرستی و بنەرەتەکانی یەکخواپەرستیشدا کتێبی تری نووسی. تیایدا رەخنەی دەگرت لە نەزمی قورئان، نووسینی بۆ رافیزەکان دەنووسی دژی سوننەت و بە پێچەوانەوە، ئەبولعەبباس لە بارەیەوە دەڵێت ئیبن راوەندی لەسەر مەزهەبێ سەقامگیر نەدەبوو و لەسەر بارێ جێگیر نەبوو تا ئەوەی کتێبی (البصیرە) ی نووسی بۆ جوولەکە لە بەرامبەر چوار سەد درهەم. ئەمەشم لە جوولەکەیەك بیست، کە پارەکەی وەرگرت کەوتە هەڵوەشاندنەوە تا ناچاری کردن سەد درهەمی تری بدەنێ، ئینجا وازی هێنا.

دەوترێت رێرەوی ئیبن راوەندی لە ژیانی مەزهەبیدا گەمەکردن بووە بە دەستەو تاقمەکان و جەماوەرەکەیان، هەر رۆژەو دەیدا بە شانو باڵی مەزهەبێکدا و ئەوی تری رسوا دەکرد، هەروەها کتێبێکی نووسی سەبارەت بە رەخنەگرتن لە نەزمی قورئان، بەلام خەبیاتی زانا و ئەبو عەلی جبائی و سەهل بن نەوبەخت وەلامیان دایەوە، دواتریش خۆی بەرپەرچی نووسینەکەی خۆی

دایەوە، ئیبن راوەندی هاورێی ئیبن عیسای وەراق و ئەبوو حەفصی حەدداد و چەند کەسێکی تری ناوداری ناو ملهوڕانی ئەو سەردەمە بوو، یەکێك لە کتێبەکانی بریتی بوو لە کتێبی (التاج) کە تیایدا باس لەوە دەکات جیهان دێرین بووە، هەروەها کتێبی (الفرند) کە تانەی دەدا لە پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها کتێبی (اللؤلؤة) کە رێگری لە برافەکان دەکرد و لە ماوەیەکی نزیکیشدا کتێبی (الإنتصار و الرد علی ابن الراوندی الملحد مما قصد به الکذب علی المسلمین و الطعن علیهم) چاپکرایەوە کە حوسەین بن خەییات نووسیویەتی و دکتۆر یەنبورگ لە زانکۆی ئەبسالە لە سوید قسەی لەسەر کردووە، ئەمەش لە ساڵی 1925 دا دەرچووە.

ئیبن راوەندی لووتکەی شەپۆلی ملهوڕی گرتووەتەبەر، ئەو ملهوڕیەی کە بانگەوازی باتینی لە هەوڵی نکووڵی کردن لە هەموو ئایینەکان گرتیەبەر و مەبەستیشی لێی لێدانی ئیسلام بوو.

چەندین کەس لەبارەیەوە نووسینیان هەیە، لەوانە سەلیم خیاتە، ئێمەش هەندێ دەقمان لێوە وەرگرتووە، ئەو نووسەرە مەسیحیە ئاماژەی داوە بەو دیاردەی کە ئیسلام زانیویەتی و ئایین و ئوممەتەکانی تر نەیانزانیوە، ئەویش ئازادی رادەربڕین و رێدانە بە هەموو خاوەن ئایینێ تا بێ دەست بەسەردا گرتن باسی ئایینی خۆی بکات، هەروەها دەبێت بیرۆکەی پووچ هەرچەندە جەماوەری هەبێت بشکێنرێت، ئەو کۆبوونەوەی برافی رۆژئاواگەری دەیگرێتەبەر بۆ راوبۆچوونەکانی ئیبن راوەندی هەمان سەرەنجامی دەبێت (ینفقون أموالهم

ليصدوا عن سبيل الله فسينفقونها ثم تكون عليهم حسرة ثم يغلبون))، سەلیم دەڵێت نامانەوێت کۆتایی بەو روانینە خێرایە بهێنین بێ ئەوەی سەرسامی خۆمان نیشان بدەین بەرامبەر بەو شارستانیەتە کراوە ئیسلامیەی کە رێی دەد بە کەسانی وەك گەورەمان ئیبن راوەندی تا وا باسی بیروباوەڕی خۆی بکات و ئاوا هێرش بکات و تانە بدات لە بیرکردنەوەو ئایینی کەچی ئەو شارستانیەتە بێدەنگ و لەسەرخۆ وەڵامی بۆ دەنووسی و بیروراکانی تێکدەشکاند، مێژووی شارستانیەتە کۆنەکان شتێکی وای تێدا نیە کە کەسێك هێندە سنووری بەزاندبێ بەو جۆرەی ئەم هاوەڵەی ئێمە (ئیبن راوەندی) ئەنجامی داوە.

موحەممەدی کوڕی زەکەریای رازی وەك یەکێك لە شوێنکەوتوانی ئەو رەوتە دێت، ئەو زانا کیمیاناسە پزیشکە بەدوای ئیبن راوەندیدا هەنگاوی نا و هەمان ئەو رەخنانەی ئەو دەیگرتن ئەمیش ئاراستەی ئایینەکانی کرد، نکوڵی دەکرد لە پێغەمبەرایەتی و دەیوت خەڵکی لە بەهرەو توانادا یەکسانن و هیچ رەوا نیە بۆ کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات جیایە لە خەڵکی تر و تایبەتمەندیەکی عەقڵی یان تایبەتی رۆحی وەك پێغەمبەرایەتی هەیە، بەڵکو موعجیزەکانیش ئەفسانەی ناردوستو مەبەست پێیان لەخشتەبردنی خەڵکەو رێنماییەکانی کتێبە پیرۆزەکانیش لەنێو خۆدا نەگونجاون، ئەگەر خەڵکی پشت ببەستن بە عەقڵی مرۆیی لە زانینی کاروباریاندا ئەوە دوو کەس لە ژیاند نەدەبوون لە کاروباری ژیانیاندا کێشەیان هەبێت، ئەگەر لەرێی فەلسەفەو

زانستەوە هەنگاو بنێن ئەوە پێویستییان بە بیروباوەڕی ئایین‌و ڕێنماییەکانی پێغەمبەران نەدەبوو.

بەوجۆرە رازی خووی نەدایە زانستە تایبەتیەکانی خۆی کە کیمیا و پزیشکی بوون، کە هەر لەو زانستەدا بڕێ شت هەن لەگەڵ سادەترین بنەماکانی عەقڵدا ناگونجێن، فەلسەفەی یۆنانی ریخۆشکەر بوو رەووەو عەقڵ و پێوەرە مەنتیقیەکانی کردە بنەمای گەیشتن راستیەکان، هەموو ئەمنە پێشەکیەك بوون بۆ دەرکەوتنی بیروراکانی ئیبن راوەندی و رازی، ئیتر ئیبن راوەندی بانگەشەی ئەوەی دەکرد تەنها بیرێ قبووڵ دەکات کە ملکەچی مەنتیقی عەقڵی مرۆیی بێت.

ئەو وتە نارەوایە هەندێ کەسی سادەی لەخشتەبرد، کەسانێك کە کەوتنە شوێن ئەو قسە بریقەدارەو نەیاندەزانی سروشی ئاسمانی و پەیامی پێغەمبەران ملکەچی ئەو پێوەرە دوابڕاوانە نابیچت و عەقڵ بە تەنها ناتوانێت لە هەموو مەسەلەکان تێبگات، بەڵکو بواری تایبەتی کارکردنی خۆی هەیەو ناتوانێت ئەو سنوورە ببڕێت.

رازی زانستی کەلام و فەلسەفەی تێکەڵ کردووە، هەروەك لە چەند بواری توێژینەوەی مەنتیق و جەدەل و ئەدەب و رەوانبێژی و نەحو و فیقە و ئوصول و تەفسیر و مێژوو و سروشت و پزیشکی و جادوودا قسەی کردووە، چەندین کتێبی خۆی و کتێبی جێگومانی هەیە.

توێژەران لە نووسینەکانیەوە هەستیان بە مەسەلەیەکی مەترسیدار کرد کە ئەویش ئەوەیە زۆربەی وتەکانی لە کتێبێکیەوە بۆ کتێبێکی تر پێچەوانەی یەکدین، هەندێکیان لەمبەرو ئەوانی دی لەوبەر، بەڵکو هەر لە یەك کتێبدا دوو رای پێچەوانە بە یەکی هێناوە.

زۆرێك ئاماژە بەوە دەکەن رازی کەسێکی جێ گومان بووەو جێی متمانەی زانستی نەبووەو نوێنەرایەتی رۆشنبیری ئیغریقی و فەیلەسووفانی ئغریقی کردووە، بەڵام لە کاتی مردنیدا دەستبەرداری و دووری خۆی لەو بیروڕایە راگەیاندووە.

شاعیرانێکی وەك بەشار بن برد و صالح بن عەبدولقودوس و ئەبوونەواس و چەندێکی تر لە گومانسازە ئیباحیەکان پەیوەستی ئەم رێبازەن، واصلی کوڕی عەتا وەڵامی بەشار بن بردی داوەتەوەو پەیامێکی نووسیوە بە ناونیشانی وەڵامدانەوەی زندیقەکان و چی کاری خراپی ئەوانە هەیە هەمووی تەفروتونا کردووە، ئیتر چ بانگخوازانی مانەوی یان مەجووسی، هەروەها لە وەڵامدانەوەی مانەویدا کتێبێکی نووسیوە کە زیاد لە هەشتا گومانی ئەوانی هێناوەو وەڵامیشی داونەتەوە، عەرمی کوڕی لبید دەڵێت کەس نیە هێندەی واصل شارەزای وتەی باتینیەکان و خەواریجە دەرچووەکان و زندیق و دەهریەکان و سەرجەم نەیارانی بێت، خوێندکارەکانی واصل بەشدار بوون لە وەڵامدانەوەی سەرکردەکانی زندیقەکان وەك صالح بن عەبدولقودوس، بەڵکو واصل وەفدێکی نارد بۆ سەرجەم ناوچەکان تا بیروڕای ئەو زندیقانە وردوخاش بکات، کەسی

وەك هوزەیل بن عەلاف دەکەوت کە چاك لە ئسلوبی زندیقەکاندا رۆچووبوو و دەیزانی فێڵەکانیان چین، بەشار بن برد رێبازەکەی عومەری کوڕی ئەبی رەبیعەی لە غەزەلدا گرتبوویەبەر، هەروەها لە هێرش و قسەو تندا رێبازەکەی حەتیئەی گرتبوویەبەر، مەهدی بەرنگاری بوویەوەو پێی وت خەڵك لەسەر خراپە هان دەدەیت و هێرش دەکەیتە سەر پاکداوێنەکان؟! هاوکات ئەو بڕوای بە رەجعەت هەبوو و هەموو ئوممەتی بە بێباوەڕ دەزانی، هەروەها یەکێك بوو لەوانەی پشتیوانی رای ئیبایسی دەکرد لەوەی ئاگر لە قوڕ باتشرە، بە دیدی ئەو زەوی تاریك و ئاگر رووناکی بەخشە، ئیبلیسیش پێی وابوو ئەو باشترە لە ئادەم، بەشار گاڵتەی دەکرد بە بانگ و نکووڵی دەکرد لە زیندووبوونەوەو لێپێچینەوەی رۆژی دوایی، زۆربەی شیعرەکانی دژ بە قورئان بوو، دیدی ئیباحی هەبوو، دەوترێت کۆڕێکی هەبوو بە ناوی بوردان کە تیایدا ئافرەتان ئامادە دەبوون، ئەم کابرایە دەمارگیری بۆ فارس هەبوو و چووبووە ناو مەجووسیەتەوەو رقی زۆری لە عەرەب بوو و قسەی پێ دەوتن، ئەوەبوو بە قامچی لێی درا ت مرد و دواتر لەبەر ئەو هەموو جنێوفرۆشی و شیعرە غەزەلەی هەیبوو فڕێ درایە چۆڵەوانیەکەوە.

وێڕای ئەم هەموو راستیەی بەردەستە بۆ هەرکەسێك کە لە ژیانی بەشار بن برد بکۆڵێتەوە، کەچی دەبینین برێ نووسەر هەن لە سەردەمی نوێدا گرنگی پێ دەدەن و چەندین توێژینەوەی ئەدەبی بەرفراوانی پڕ لە سەرسوڕمانی لەبارەوە دەنووسن‌و بەرزی رادەگرن، کەسانی وەك عەبدورەحمان صدقی و ئیبراهیم

عەبدولقادر مازنی، هەروەها ئەبوونەوواس کە زۆر لە بەشار ئیباحی تر بوو و زیاتر دژی ئیسلامو عەرەبیش بوو هەر گرنگی پیّ دەدریّت، ئەمشە خۆی لە کەسانی وەك عەقاد و عەبدورەحمان صدقی و چەند کەسێکی تردا دەبینێتەوە بەڵکو گۆزاری هیلال ژمارەیەکی تایبەتی لەبارەوە بڵاوکردەوە کە تیای ژمارەیەکی زۆر لە شارەزایانی ئەدەبی عەرەبی هاوچەرخ نووسینیان هەبوو لە بارەیەوە، بە داخەوە کەس هەستی بەو مەترسیە گەورە نەکرد کە لەپشت ئەم هەموو گرنگی پێدانەوەیە، دەزانین ئەبوونەواس خۆی سەرقاڵی وەسفی مەی و مێر منداڵ کردووەو لە کۆشکی خەلیفەدا وەسفی دەکردن و دەیخستە پێکەنین، ئامانجێکی زۆر قووڵتر لەوەی هەبوو کە ئەویش خزمەتکردنی پیلانی باتینی بوو، ئەو پیلانەی ئامانجی لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، ئەبو نەواس زۆر زیرەكو فێڵزان بوو و بیروباوەڕی بە کەم دەگرت و گومڕایی و زندیقی بڵاودەکردەوە، مێژوونووس و توێژەران بە یەکێك لە گەورە ڕێبەرانی دووانەخوایی دەزانن، لە شیعرەکانیەوە دەردەکەوێت کە چەند کاریگەر بووە بە مانەوی و مەزدەکی، بانگخوازی سەردەمی خۆی بوو بۆ ڕزگاربوون لە کۆت و بەند و هەنگاونان بۆ ئەوپەڕی چێژوەرگرتن، ئەو دەیوت تەنها بڕوا بە شتێ دەکات کە هەستەوەرەکانی درکی پێ بکەن و بڕوای نەبوو بە زیندووبوونەوە یەکێك لە بنەماکانی مانەوی گومان نانەوە بوو لە بیروباوەڕی و هێرش بردنە سەر هەموو ئایینەکان، ئەبوونەواس زۆر لە غەزەلدا ڕۆچووبوو و غەزەلیش بەشێکی سەرەکی مانەویەت بوو.

هەروەك بیروونی باس دەكات دەڵێت حەمزەی ئەصبەهانی كە دیوانی ئەبوونەواسی كۆكردوەتەوە دەڵێت ئەبوونەوواس غەزەلی نێرینەی داهێنا و ئەو بوو قەصیدەی مەینۆشی لە ئەدەبی عەرەبیدا دەست پێكرد.

لە شیعرەكانیدا چەند دیمەنێكی روونی مانەوی و مەزدەكی بەدی دەكەیت كاتێك دەبینیت گومان دەخاتە سەر بیروباوەڕ و هێرش دەكاتە سەر ئایین و باسی ئیباحیەتی رەها و غەزەلی نێرینە دەكات، وێڕای دەمارگیری بۆ فارس و بە كەمگرتنی عەرەب، لە كتێبەكەی ترماندا (خصائص الأدب العربي) فراوانتر باسی ئەبوونەواس و بەشارمان هێناوە.

## پاشکۆ ( ئەبووزەری غیفاری )

خوێنەری ئازیز بۆ ئەوەی گومانێ نەبرێت هاوەڵێکی گەورەی وەك ئەبووزەری غیفاری تێکەڵ بە پەیام و پیلانی خەواریج و سەبەئیەکان بکرێت، بۆیە بە باشمان زانی شتێ لە ژیانی ئەم هاوەڵەو هەڵوێستی لە سەردەمی فیتنەدا بخەینەڕوو تا خوێنەر بە وردبوونەوە لە ژیانی بزانێت بۆچی هەڵوێستی ئەم هاوەڵە لەو ماوەدا وابووەو جیای بکاتەوە لە ڕەوتی سەبەئیەکان، ئەم بابەتەشمان لەو توێژینەوە وەرگرتووە کە تایبە تبە ژیانی هاوەڵان نووسیومانە بە ناونیشانی (ناسینی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ) و لە نۆ بەرگدا نووسراوە.

(ئەبووذەری غیفاری)(رضي الله عنه)

ناوی جوندوبی کوڕی جونادەی کوڕی سوفیانی کوڕی عوبەیدی کوڕی حەرامی کوڕی غیفارە، کونیەکەی ئەبووذەری غیفاریە[1] و زیاتر بەوەش ناسراوە، لەگەورە هاوەڵانی ناسراوەو لە یەکەمین موسڵمان بوانەو پێغەمبەر(ﷺ) چەندین وەسفی کردووە.

---

١ - أسد الغابة، ج1، ص 440.

رایەکی تر دەڵێت بەڵکو ناوی بورەیری کوڕی جونادە بووە،[١] بەڵام ذەهەبی دەڵێت رای راست ئەوەیە ناوی جوندوبی کوڕی جونادەیە،[٢] هەروەك ئیبن ئەثیریش دەڵێت رای راستتر و زیاتریش ئەوەیە کە ناوی جوندوبە.[٣]

دایکی ناوی رەملەی کچی وەقیعەی غیفاری بوو،[٤] ئەبووذەر برایەکی هەبوو کە ناوی ئونەیسی کوڕی جەنادەی غیفاری بوو و برا گەورەی ئەبووذەر بوو.[٥]

هەروەها ئەبووذەر کوڕێکی هەبوو بە ناوی عیمارە کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٦]

ئەبووذەر لە سەردەمی نەفامیشدا بڕوای بە بتەکان نەبوو و باسی بوونی خوایەکی تاك و تەنهای دەکرد.[٧]

ئیبن سەعد گێڕانەوەیەکی هێناوە کە ئەبووذەر پێش موسڵمانبوونی کەسێکی ڕێگر بوو و لەگەڵ ئەوەشدا ئازا بوو و بەتەنها خۆی ڕێگری دەکرد، دواتر خوا دڵی راکێش کرد بۆ ئیسلام و وازی هێنا لە ڕێگری.[١]

---

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج4، ص 219.

٢ - تأريخ الإسلام للذهبي، ج3، ص 405.

٣ - أسد الغابة، ج6، ص 106.

٤ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج6، ص107.

٥ - الإصابة في تمييز الصحابة، ج1، ص136.

٦ - المعجم الأوسط للطبراني، الرقم 4961.

٧ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج4، ص 222.

ئونەیس لەگەڵ ئەبووزەری برای و دایکیدا پێکەوە دەژیان، دواتر نەبوونی‌و وشکە ساڵی ناچاری کردن شوێنی خۆیان جێ بهێڵن‌و بچن بۆ لای خاڵوانیان لە نەجد، دواتریش ئەوێیان جێهێشت بەرەو لای مەککە، ئەبووزەر چوویە مەککەو هەواڵی هاتنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست و دواتر چوویە خزمەتی‌و موسڵمان بوو، دواتر گەڕایەوە بۆ لای ئونەیسی برای‌و دایکی وبانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش موسڵمان بوون‌و گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان تا پەیامی ئیسلام بگەیەنن بەهۆزەکەشیان‌و لەوەشا سەرکەوتوو بوون.[٢]

ئەبووزەر دەڵێت ئێمە کە لەناو هۆزەکەمان چووینە دەرەوە ئەوان لە مانگە حەرامەکاندا شەڕیان رەوا کردبوو، من و دایکم و ئونەیسی برام دەرچووین و چووین بۆ لای خاڵۆمان، ئەویش رێزی گرتین و چاکەی لەگەڵ نواندین، بەڵام هۆزەکەی حەسوودییان نواند لەڕووماندا و کەوتنە درۆهەڵبەستن بۆمان، بۆیە نێوانی ئێمەو خاڵمیان تێکدا، بۆیە بڕیارماندا بچین و بارگەو بنەمان پێچایەوە، خاڵۆیشمان سەیری دەکردین و دەگریا، چووین تا لە نزیك مەککە دابەزین، ئونەیس وتی من لە مەککە بڕێ ئیشم هەیە بۆیە چاوەڕێم بە تا دێمەوە بۆ لات، ئەوەبوو ئونەیس چوو و ماوەیەکی زۆری پێ چوو، دواتر هاتەوە، وتم بۆچی هێندە دواکەوتیت؟ ئەویش وتی کەسێکم لە مەککە بینی لەسەر ئایینی تۆ بوو و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە پێغەمبەری خوایە، منیش وتم ئەی

---

١ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج4، ص 222.

٢ - المستدرك على الصحيحين، الرقم 5430، المعجم الكبير للطبراني، الرقم 772.

خەڵکی چییان پێ دەوت؟ وتی خەڵکی پێیان دەوت شاعیر و کاهین و جادووگەر، ئونەیس خۆیشی شاعیر بوو، ئونەیس وتی سوێند بەخوا قسەی کاهینانم بیستووە قسەکانی ئەو لە قسەی کاهینان ناچێت، قسەکانیشی لەئاست گەورەترین شاعیراندا زۆر بەرزترن و هی شاعیر نین، سوێند بەخوا ئەو راستگۆیەو خەڵکی مەککە درۆزنن، منیش وتم دەی لێرە چاوەڕێم کە تا بڕۆم و تەماشایەك بکەم، ئەویش وتی باشە بەڵام وریابە بەرامبەر خەڵکی مەککە چونکە ئەوان هێرشیان بردوەتە سەری، منیش چوومە مەککەو و لای پیاوێکیان خۆم بێناز و نەناس نیشاندا و وتم ئەرێ ئەو کابرا لەدین هەڵگەڕاوەی باسی دەکەن لەکوێیە؟ ئەویش ئیشارەتی کرد و وتی ئەوەیە، منیش خۆم داپۆشی و چوومە لای ئاوی زەمزەم و لە ئاوەکەم خواردەوەو خوێنی دەموچاوم شۆرد و لەوێ نزیکەی شەو و رۆژێك مامەوە و هیچ خواردنێکم نەبوو جگە لە ئاوی زەمزەم، ئیتر برسێتی زۆری بۆ هێنام، دوو ئافرەتیش لەوێ بوون تەوافیان دەکرد، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکر هاتن و لە شاخەوە دابەزیبوون، وتم ئەوە چیتانە؟ وتیان لەدین هەڵگەڕاوە، پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکەی هاتن و پاش تەواف کردن نوێژی کرد، کە لە نوێژەکەی بوویەوە منیش چووم بۆ لای، من یەکەم کەس بووم سەلامی ئیسلامم لێکرد، ئەویش فەرمووی(وعليك رحمةالله)، (رەحمەتی خوا لە تۆش) تۆ لە کێیت؟ وتم لە هۆزی غیفارم، دەستی هێنا بەسەر تەوێڵیدا، منیش لە ناخی خۆمدا وتم ئەوە حەزی نەکردووە کە من لە غیفاریەکانم، ئینجا دەستیم گرت، پرسیاری لێکردم لە

کەیەوە لێرەیت؟ وتم نزیکەی شەو و رۆژێکە، پرسیاری کرد ئەی کێ نانی پێدەدایت؟ وتم تەنها خۆراکم ئاوی زەمزەم بووە، ئیتر هێندە لاواز بوم خەریکە سکم دەشکێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(إنها مباركة إنها طعام طعم)، (ئەو ئاوە موبارەکەو، ئەو ئاوە خۆراکی و خواردنە)، ئەبووبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆڵەتم بدە ئەمشەو من نانی پێ بدەم، ئەویش رێی دا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکر چوون و منیش لەگەڵیان چووم، ئەبووبەکر دەرگایەکی کردەوەو لە مێوژی تائیفی بۆ دەهێناین، ئەوە یەکەم خواردن بوو خواردم، دواتر کە گەیشتمەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(زەویەکم پێ نیشان دراوە تا بۆی بچم کە خورمای هەیە و وادەزانم هەر یەثریب بێت، جا ئایا تۆ پەیامم دەگەیەنیت بە هۆزەکەت بەڵکو خوا بەهۆی تۆوە سوودمەندیان بکات و لەسەر ئەوانیش پاداشتی تۆ بداتەوە)، منیش چوومەوە تا گەیشتم بە ئونەیسی برام، وتی چیت کرد؟ وتم من موسڵمان بووم و باوەڕم پێ هێنا، ئونەیسیش وتی منیش موسڵمان بوم و باوەڕم پێ هێناوە، ئینجا هەردووکمان چووین بۆ لای دایکمان و ئەویش هەمان قسەکەی ئونەیسی کرد، ئینجا هەرسێکمان چووینەوە بۆ ناو خۆزەکەمان و بانگەوازمان کردن، نیوەیان موسڵمان بوون پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بێت بۆ مەدینە، ئیمائی کوڕی رخصەش بەرنوێژی دەکرد بۆیان، ئەو گەورەی هۆزەکەش بوو، ئەو نیوەکەی تریش وتیان هەرکات پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەدینە موسڵمان دەبین، ئەوەبوو کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەدینە ئەو نیوەکەی تریش موسڵمان بوون، ئینجا ئەسلەمیەکانیش هاتن و وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمەش وەك براکانمان موسڵمان دەبین، ئەوەبوو ئەوانیش

موسڵمان بوون، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی(غفار غفر الله لها و أسلم سالمها الله).[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە کاتێك ئەبووذەر چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەبووبەکری لا بوو کە هێشتا ڕۆژێ یان دوو ڕۆژ بوو موسڵمان بووبوو، دەیوت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەخوا ئاوا ئایینەکەمان ناشارینەوەو ئاشکرای دەکەین، پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی نەدەدایەوە، منیش وتم ئەی موحەممەد تۆ بانگەواز بۆ چی دەکەیت؟ ئەویش فەرمووی(بۆ لای خوای تاك و تەنهای بێ هاوەڵ و وازهێنان لە بتەکان و شایەتی ئەوەش بدەیت من پێغەمبەری خوام)، منیش وتم شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خو و تۆش پێغەمبەری خوایت.[2]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە ئەبووذەر دەڵێت لە مەککە لەگەل پێغەمبەر(ﷺ) مامەوەو ئەویش ئیسلامی فێر کردم و شتێ لە قورئانم لە خزمەتیدا خوێند ئینجا وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەمەوێت ئایینەکەم ئاشکرا بکەم، ئەویش فەرمووی(من دەترسم بکوژرێیت)، منیش وتم هەر دەبێت وابکەم با تەنانەت بشکوژرێم، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو، چووم بینیم قورەیشیەکان بازنەیان بەستبوو و لای کەعبەوە قسەیان دەکرد، منیش وتم (أشهد ان لا اله الا الله و أشهد أن محمدا رسول الله)، هەموو داباڕین بەسەرمد

---

[1] - الطبقات الکبری لابن سعد، ج4، ص 219-222.

[2] - الطبقات الکبری لابن سعد، ج4، ص 222.

و كەوتنە لێدانم، لە هۆش خۆم چووم و ئەوانیش وایان زانی منیان كوشتووە، دواتر هاتمەوە هۆش و هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش باری منی بینی و فەرمووی مەگەر ئاگادارم نەكردیتەوە شتی وا نەكەیت؟ وتم ئەی پێغەمبەری خوا حەز و ویستێكی دەروونم بوو كە بەجێم هێنا، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێكردم بگەڕێمەوە ناو هۆزەكەم تا هەركات هەواڵی دەركەوتنی پێغەمبەرم(ﷺ) بیست بچمەوە بۆ لای.[١]

كاتێك كە لێیان دەدا عەبباس دای بە لایاندا و وتی ئەی گرۆی قورەیشیەكان ئێوە بازرگانن و ڕێگەكەشتان بەناو غیفاریەكاندایە، ناترسن ڕێتان پێ ببڕن و بەرتان پێ بگرن؟ ئیتر ئەوانیش بڵاوەیان لێكرد، كەچی بۆ بەیانی ئەبووزەر هەمان باری دووبارە كردەوە، بۆیە ئەوانیش هەمان شتیان لەگەڵدا كردەوە، دووبارە عەبباس دایەوە بە لایاندا و هەمان شتی وتەوە پێیان، ئەوانیش وازیان لێهێنا.[٢]

گێڕانەوەیەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە كە وردەكاری موسڵمانبوونەكەی ئەبووزەر دەخاتەڕوو، ئەبووزەر بە براكەی وت بڕۆ بۆ ئەو دۆڵە و هەواڵی ئەو كابرایەم بۆ وەربگرە كە بانگەشەی ئەوە دەكات پێغەمبەرەو لە ئاسمانەوە هەواڵ و پەیامی بۆ دێت، گوێ لە وتەكانی بگرەو دواتر وەرەوە بۆ لام، براكەی چوو تا چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و قسەكەی بیست و

---

١ - حلية الأولياء، ج1، ص 158.

٢ - حلية الأولياء، ج1، ص 159.

گەڕایەوە بۆ لای ئەبووزەر و پێی وت بینیم فەرمانی دەکرد بە رەوشتی بەرز و قسەیەکی دەکرد کە شیعر نەبوو، ئەبووزەر وتی ئەوەی من دەمویست بۆت نەهێناومەتەوە، بۆیە خۆی بارگەی پێچایەوەو ئاوی هەڵگرت و چوو تا گەیشتە مەککەو چوو بۆ لای کەعبە و بەدوای پێغەمبەردا (ﷺ) دەگەڕا و ئەویشی نەدەناسی، حەزیشی نەدەکرد لای خەڵك هەواڵی بپرسێت، بۆیە بەو بارە مایەوە تا نزیکەی شەو، ئینجا راکشا، عەلی کە ئەوی بینی زانی کەسێکی بێگانەیە، کاتێك بینی شوێنی کەوت و هیچکام پرسیاریان لەهیچکام نەکرد تا بەیانی، دواتر ئەبووزەر لە ماڵی عەلیەوە توێشووەکەی هەڵگرتەوەو چوویەوە بۆ لای کەعبە و سێ رۆژ ئەم شتە دووبارە بوویەوە، لە رۆژی سێیەمدا عەلی کە بردیەوە لەگەڵ خۆی پرسیاری لێکرد ئەرێ پێم ناڵێیت بۆچی هاتویت بۆ ئێرە؟ ئەویش وتی ئەگەر بەڵێنم پێ بدەیت رێنموونیم بکەیت پێت دەڵێم، ئەویش بەڵێنی دا، ئەبووزەریش پێی وت بۆچی هاتووە، عەلیش وتی ئەو پێغەمبەرە راست دەکات، کە بەیانی بوو شوێنم بکەوە، ئەگەر من شتێکی مەترسیدارم بینی واهەڵدەستم وەك ئەوەی ئاو بڕژم، ئەگەریش بەردەوام چووم شوێنم بکەوە تا دەتبەم بۆ لای، ئەوەبوو بەیانی ئەبووزەر شوێنی کەوت تا چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و گوێی لێگرت و هەر لەوێ موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(بگەڕێرەوە ناو هۆزەکەت و هەواڵی-ئایینەکەیان- پێبدە تا فەرمانی منت پێدەگات) ئەبووزەر وتی سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە لەنێوەندی ئەم بێباوەڕانەدا هاواری ئەم ئایینە دەکەم، بۆیە چوویە

کەعبەو بەوپەڕی توانایەوە هاواری کرد(أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمدا رسول الله) ئەوەبوو خەڵکەکە هەستان و کەوتنە لێدانی تا لەهۆش خۆی چوو، عەبباس هات و خۆی دا بەسەر ئەبووزەردا و وتی قوڕتان بەسەر مەگەر نازانن ئەو لە غیفاریەکانەو ڕێی بازرگانیشتان بەو ڕێیەدایە، ئەوانیش وازیان لێهێنا، بۆ بەیانیەکەشی هەمان شت ڕوویدایەوە و دووبارە عەبباس ڕزگاری کرد.[١]

سەبارەت بەوەی ئەبووزەر چەندەم کەس بووە موسڵمان بووە رایەك دەڵێت چوارەم کەس بووە، رایەکی تریش دەڵێت پێنجەم کەس بووە موسڵمان بووە.[٢]

ئەبووزەر لەناو هۆزەکەیدا مایەوەو لە ماوەی جەنگی بەدرو ئوحود و خەندەقیشدا هەر لەناو هۆزەکەیدا بوو و دوای ئەوە هات بۆ مەدینە،[٣] ئیتر لەوێ مایەوە تا وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) لە مەدینە بوو و لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکریشدا لە مەدینە بوو، بەڵام دوای وەفاتی ئەبووبەکر چوو بۆ شام و لەوێ مایەوە تا سەردەمی خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەففان، ئیتر لە

١ - صحيح البخاري، الرقم 3670، صحيح مسلم، الرقم 4625، المعجم الأوسط للطبراني، الرقم 2683.

٢ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج1، ص 252.

٣ - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج4، ص 226.

سەردەمی عوسماندا خەلیفە داوای لێکرد بێت بۆ مەدینە و ئەویش هاتە مەدینەو دواتر لە ناوچەی رەبذە مایەو لەوێ کۆچی دوایی کرد.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە ئەبووذەر دەیفەرموو(ما أقلت الغبراء ولا أظلت الخضراء من رجل أصدق لهجة من أبي ذر).[2]

ئەبووذەر خزمەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد، کاتێك لە خزمەتکردنی دەبوویەوە دەچوو بۆ مزگەوت و لەوێ دەخەوت، شەوێك ئەبووذەر لە سەر زەوی ناو مزگەوت راکشابوو کە پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوە، بە نووکە پێیەك رایچڵەکاند و فەرمووی(بۆ دەبینم خەوت لێ ناکەوێت؟) ئەویش وتی ئەی پێغەمبەر(ﷺ) لە کوێ بخەوم، مەگەر لەم شوێنە زیاتر شوێنی ترم هەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) لەلای دانیشت و پێی فەرموو(ئەی چۆنە ئەگەر لێرە دەرت بکەن؟) وتی ئەوکات دەچم بۆ شام، چونکە شام خاکی کۆچ و خاکی مەحشەر و زەوی پێغەمبەرانە و منیش دەبم بە هاوڵاتیەکی ئەوێ، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو(ئەی چی دەکەیت ئەگەر لە شامیش دەریانکردیت؟) وتی جا دەگەڕێمەوە بۆ ئێرە و ئێرە دەبێتە ماڵ و مەنزڵم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئەی چی دەکەیت ئەگەر هەمتر دەریانکردیت؟) وتی ئەوکات شمشێر هەڵدەگرم و بە بەرگری لە خۆم دەجەنگم تا دەمرم، پێغەمبەر(ﷺ)

---

١ - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج1، ص 252-253.

٢ - سنن ابن ماجة، الرقم 154، سنن الترمذي، الرقم 3819، مسند احمد بن حنبل، الرقم 6436،صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم 156.

زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و بە دەستی سوکنابییەکی پێدا و فەرمووی(ئایا لەوە چاکترت پێ نیشان بدەم؟) وتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دایك و باوکمەوە بەقوربانت بم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(تنقاد لهم حيث قادوك و تنساق لهم حيث ساقوك حتى تلقاني و أنت على ذلك)،[1] (چی فەرمانیان پێکردیت ملکەچیان بیت و بۆ کوێیان ناردیت بڕۆیت تا دەگەیتەوە بە من هەر بەو جۆرە بە).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرموو( يا أباذر إني أراك ضعيفا، وإني أحب لك ما أحب لنفسي، لا تأمرن على إثنين ولا تولين مال يتيم)[2] (ئەی ئەبووذەر من تۆ بە لاوازی دەبینم، ئەوەشی بۆ خۆم خۆشم دەوێت بۆ تۆیش حەزم پێیە، دەی بەرپرسیارێتی دوو کەسیش مەگرە ئەستۆ و ماڵ و سامانی هەتیویش مەگرە ئەستۆ)

له جەنگی تەبووکدا کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان کەوتنەڕێ ژمارەیەك کەس دواکەوتن، جا کە کەسێك دوابکەوتایە و نەچوایە هاوەڵان دەیانوت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فلانەکەس نەهاتووە، ئەویش دەیفەرموو (وازی لێبهێنن ئەگەر خێری تیا بێت ئەوا خوا پەیوەستی ئێوەی دەکات،

---

١ - مسند احمد بن حنبل، الرقم 26946، ضعفه شعيب الأرناؤوط لوجود شهر بن حوشب في السند و هو ضعيف.

٢ - صحيح مسلم، الرقم 3493، سنن أبي داوود، الرقم 2499، صحيح ابن حبان، الرقم 5641، السنن الكبرى للنسائي، الرقم 6296، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم 18788.

ئەگەریش نا ئەوا خوا لەدەست ئەو حەساوەتان دەکات)، تا ئەوەی وترا ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبووذەر دواکەوتووە، چونکە وشترەکەی ئەبووذەر نەدەچوو، بۆیە ئەبووذەر بارەکەی دا بە شانیدا و خۆی بە پێ کەوتەڕێ، پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێدا دابەزی و موسڵمانێك تەماشای کرد کەسێك دێت، وتی ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە کەسێکە بە پیادە دێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(بەڵکو ئەبووذەر بێت)، کاتێك خەڵکەکە لێی رامان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بەخوا ئەوە ئەبووذەرە، ئەویش فەرمووی(رحم الله أباذر يمشي وحده و يموت وحده و يبعث وحده)،[١] (رەحمەتی خوا لە ئەبووذەر بێت، بە تەنها هات و بەتەنهاش دەمرێت و بەتەنهاش زیندوودەکرێتەوە).

لە فەرموودەیەکدا کە بورەیدە گێڕاویەتیەوە هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی(فەرمانم پێکراوە بە خۆشەویستی چوار لە هاوەڵانم و خوا هەواڵی پێداوم کە ئەوانی خۆش دەوێت)، بورەیدە دەڵێت وتم ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی(عەلی و ئەبووذەری غیفاری و سەلمانی فارسی و میقدادی کوڕی ئەسوەدی کیندی).[٢]

---

[١] - المستدرك على الصحيحين، الرقم 4321 و قال الذهبي فيه إرسال، دلائل النبوة للبيهقي، الرقم 1972، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم 5531.

[٢] - مسند الروياني، الرقم 29، مسند احمد بن حنبل، الرقم 22355، سنن ابن ماجة، الرقم 148، سنن الترمذي، الرقم 3738، المستدرك على الصحيحين، الرقمم 4598، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم 2171.

مەعرووری کوڕی سوەید دەڵێت ڕۆژێك ئەبووذەری غیفاریم بینی کە دووجلی یەکرەنگی لەبەردا بوو، کۆیلەکەشی دوو جلی یەکڕەنگی لەبەردا بوو، ئێمەش پرسیارمان لێکرد بۆچی هەردووکیان یەك جۆرە جلیان لەبەرکردووە؟[١] ئەبووذەر وتی جارێك من لەگەڵ برایەك بووم بە کێشەم کە دایکی عەجەمی بوو، منیش بە تانەدان لەدایکی شکاندمەوە،، ئەویش لای پێغەمبەر(ﷺ) شکاتی کردم،[٢] ئینجا کە گەیشتم بە پێغەمبەر(ﷺ)پێی فەرمووم(أعیرته بأمه)،[٣] (ئایا بە تانەدان لە دایکی شکاندت؟)، وتم ئەی پێغەمبەری خوا هەرکەس قسە بڵێت بە پیاوان قسە بە دایك و باوکی دەڵێن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئەی ئەبووذەر تۆ کەسێکیت باری نەفامیت تێدا ماوەتەوە)،[٤] پاشان فەرمووی(إن إخوانكم خولكم جعلهم الله تحت أيديكم، فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يأكل و ليلبسه مما يلبس و لا تكلفوهم ما يغلبهم فإن كلفتموهم ما يغلبهم فأعينوهم)،[٥] (براکانتان خزمەتکاری ئێوەن و خوا ئەوانی خستوەتە ژێر دەستی ئێوە، دەی با هەرکامتان براکەی لەژێر دەستیدا بوو لەو خواردنەی دەرخوارد بدات کە خۆی دەیخوات و لەو جلەی بپۆشێت کە خۆی دەیپۆشێت و لە توانای

١ - صحيح البخاري، الرقم 2427.

٢ - صحيح مسلم، الرقم 3224.

٣ - صحيح البخاري، الرقم 2427.

٤ - صحيح مسلم، الرقم 3224.

٥ - صحيح البخاري، الرقم 2427، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم 14692.

خۆیشیان زیاتریان بەسەردا مەدەن، ئەگەر کارێکتان بەسەردا دان کە لە توانای خۆیان زیاتر بوو و ماندووی دەکردن ئەوا خۆتان یارمەتییان بدەن).

ئەبووذەر لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا:

لێرەدا مشتومڕێکی مێژوویی هەیە سەبارەت بەوەی ئایا ئەبووذەر بەیعەتی داوە بە ئەبووبەکری صدیق یان دواتر بەیعەتی داوە.

مێژوونووسی شیعە یەعقووبی دەقێکی هێناوەو دەڵێت: دەستەیەك لە کۆچەران و پشتیوانان دواکەوتن لە بەیعەت دان بە ئەبووبەکر و هەواداری عەلی کوڕی ئەبووتالیب بوون، لەوانە عەبباسی کوڕی عبدولموتەلیب و فەضلی کوڕی عەبباس و زوبەیری کوڕی عەووام و خالیدی کوڕی سەعید و میقدادی کوڕی عەمر و سەلمانی فارسی و ئەبووذەری غیفاری و عەمماری کوڕی یاسر و بەرائی کوڕی عازب و ئوبەی کوڕی کەعب.[1]

ئەوەی لێرەدا جێی مشتومڕە، بریتیە لە بنەرەتی ناکۆکی نێوان شیعەو سوننە لەسەر مەسەلەی خیلافەت و ئیمامەت، شیعە پێیان وایە ئیمامەت لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) بە میراتی بۆ عەلی و نەوەکانی ماوەتەوە تا ڕۆژی دوایی و ئەبووبەکر و هاوەڵانی تر ئەو مافەیان لێ زەوت کردووە، سوننەش پێیان وایە

[1] - تاریخ الیعقوبي، دار صادر، بیروت، ج2، ص 124.

هیچ بنەڕەتێك نیە بۆ مەسەلەی ئیمامەت و خیلافەتی ئەبووبەکر شیاو و دروست بووە و هەموو موسڵمانانیش لەسەری کۆدەنگ بون.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئەگەر ئیمامەت بەشێکی چەسپاوی بیروباوەڕەو مافی عەلی کوڕی ئەبووتالیبە بە میراتی بۆ خۆی و نەوەکانی:

یەکەم: ئەو بنەرەتە کە بڕیارە بەهەشت ودۆزەخ یەکلا بکاتەوەو ریشەی قەڵەمڕەوی هەموو کۆمەڵگەی ئیسلامیە تا رۆژی دوایی، بۆچی بە ئایەتێك راشکاوانە باسنەکراوە، ئایا ئەمە ناراستی ئەو بانگەشەیە نیە؟ یان ئەوەیە ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان لە کۆکردنەوەی قورئاندا راستیگەلێکی ناو قورئانیان لابردووە؟ جا ئەگەر بڵێین یەکەمیان راستە، ئیتر بنەرەتی بانگەشەی ئیمامەت بە دەلیلی قورئانی لەکاردەکەوێت، ئەگەریش بڵێین دووەمیان راستە، ئەوە هیچ بنەرەتێکی دروست بۆ ئیسلام نامێنێتەوە کە لەسەری بڕۆین، چونکە ئەگەر ئەوان و هاوەڵانی تر قورئانیان ناتەواو تۆمار کردبێت، کەوابوو هەم قورئان تەواوی پەیامی خوا نیە، هەم چی فەرموودەیە لەکاردەکەوێت، هەم خوێندکارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەبنە خوێندکارانێکی باش پەروەردە نەکرا و و ناپاك و هەلپەرست(دوور لەوان).

دووەم:ئەگەر بڕیار بێت میراتی پێغەمبەرایەتی هەم بە دەسەڵاتە دنیاییەکەی و هەم بە سروشە رۆحیەکەیەوە، بە میرات بۆ کەسەکانی پێغەمبەر(ﷺ) جێبمێنێت، ئەوە تەنها عەلی کوڕی ئەبووتالیب شیاو نیە هەمووی بۆ خۆی بەرێت، بەڵکو عوسمان دەبێت نزیکتر بێت، چونکە ئەو دوو

کچی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بەهاوسەر گرتووە، هەروەها ئەگەر ئەو گریمانەش دابنێین لەبەرئەوەی عەلی ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ) بووەو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموودەی زۆری لەسەر ئەو وتووە، ئەواعەلی تەنها فاتیمە ژنی نەبووە، بەڵکو هەر لە خوێنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئومامەی کچەزای پێغەمبەر(ﷺ) ژنی بووە، هەروەها ئەگەر بڕیار نەوەکانی عەلی بێت، ئەوا کوڕەکانی تری عەلی کوڕی ئەبووتالیبیش هەمان پشکیان بەردەکەوێت.

سێیەم: چۆن دەکرێت عەلی کوڕی ئەبووتالیب کە موژدەپێدراوی بەهەشت و زاوای پێغەمبەر(ﷺ)و میراتگری دین و دنیایی پێغەمبەر(ﷺ)بێت، کەچی ئامادە نەبێت شەریکات لەسەر ئەو مافە خوداییەو دەرفەت بدات کەسانێکی تر ڕێرەوی بڕیاری خوا و ئایینی خوا بگۆڕن، لە کاتێکدا ئەو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) چەندین جار لە غەزاکاندا چووەتە گەرمەی جەنگەوەو باکی نەبووە لە مان و نەمانی لە دنیادا.

ئەم باسە مشتومڕی زۆر لەخۆ دەگرێت، پێویستی بە توێژینەوەیەکی ورد هەیە لەو بارەیەوە کە کەسێك پێی هەستێت:

یەکەم: دڵسۆز بە ئیسلام بێت، چونکە کەسێك دڵسۆز بە ئیسلام نەبێت سەختە بتوانێت پرسە هەستیارەکانی پەیوەست بە ناکۆکی نێوان موسڵمانان لەبەرچاو بگرێت.

دووەم: کەسێکی بێلایەن بێت، نەك کەسێکی عاتیفی و هەڵچوو بێت، کەسێك بێت لەوە تێگەیشتبێت خوای گەورە پەیامی (انا ربکم الاعلى)ی فیرعەونی وەك خۆی تۆمار کردووە، پەیامی (عبس وتولى)ی بۆ سەردراری مرۆڤایەتی خستووەتەڕوو، بۆیە نابێت پێش توێژینەوەی وردی رووداوەکە بڕیاری خۆی دابێت.

سێیەم: قسەی زبر و پەرگیری تێدا نەبێت، بەڵکو زانستیانە شرۆڤەی رووداوەکە بکات و دەرفەتیش بهێڵێتەوە بۆ خوێنەر تا بەپێی دەقە زانستیە راستەکان بڕیار لەسەر رووداوەکە بدات.

ئەرکی ئەو کەسە چیە؟:

دەبێت ئەو کەسە هەستێت بە کۆکردنەوەی هەموو گێڕانەوەکان لەو بارەوە، پاشان بێت ریزبەندی کاتییان بکات، بۆ هەر گێڕانەوەیەك با تەواو دژی قەناعەتی خۆیشی بێت بێ دەستکاری دایبنێتەوە، پاشان بێت شرۆڤەی راستی ئەو گێڕانەوەیە چ لە رووی سەنەد و چ لە رووی رووداوی مێژووییەوە یەکلا بکاتەوە، پاشان گونجاندنی نێوان گێڕانەوەکان بخاتەڕوو، دواجار وەڵامی هەریەك لە را دژیەکەکان بۆ یەکدی بخاتە بەرچاو، ئیتر لەوێدا شتێك لەبەردەم خوێنەر نامێنێت کە دواتر جیا لەو توێژینەوەیە بکاتە بەر گوێی.

چوونی ئەبووذەر بۆ ناوچەی رەبذە:

**یەکێك لەو مەسەلانەی کە کراوە بە رەخنە لەسەر عوسمانی کوڕی عەففان و تانەدان لە خیلافەتەکەی مەسەلەی چوونی ئەبووذەر بوو بۆ ناوچەی رەبذە، چونکە ئەو تۆمەتەی ئاراستە کراوە کە ئەو بە زۆر و بە فەرمان ئەبووذەری دوورخستوەتەوە بۆ ناوچەی رەبذە، سەبارەت بەم مەسەلەش وردەکاریەکی پێویست دەخەینە ڕوو:**

**ئیبنولعەرەبی لە کتێبەکەیدا(العواصم من القواصم) سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێت:**

**سەبارەت بەوەی گوایە عوثمان ئەبووذەری دوورخستبێتەوە بۆ ناوچەی رەبذە ئەوە راست نیەو وای نەکردووە، ئەبووذەر کابرایەکی دنیانەویست و زاهید بوو و سەرکۆنەی کاربەدەستەکانی عوسمانی دەکرد و ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە بەسەریاندا(والذين يكنزون الذهب و الفضة و لا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم).**

**ئەبووذەر پێی وابوو ئەوان لە سوار و جلوبەرگدا زێدەڕۆیی دەکەن، بۆیە لەسەرئەوە نارەزایی بەرامبەریان دەردەبڕی و سەرکۆنەی دەکردن، دەیویست چی لەو ماڵو سامانەی بەردەستیان هەیە دابەش بکرێت، ئەوەش شتێکی پێویست نەبوو.**

ئیبن عومەر و هاوەڵانێکی تریش دەیانوت هەرچیەك زەکاتەکەی بدەیت ئیتر بریتی نیە لە کۆکردنەوەی -زێڕ و زیو-، ئەوەبوو لە شام دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەبووزەر و موعاویەدا روویدا، ئیتر ئەبووزەر هات بۆ مەدینە، خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، ئەویش هەمان رێی خۆی دەگرتەبەر-دنیانەویستی و ویستی ئەوەی هەموان بەوجۆرە بن-، عوسمان پێی وت خۆزگە کەنارت بگرتایە، مەبەستی ئەوەبوو تۆ لەسەر رێبازێکیت کە بۆ تێکەڵی خەڵك نابێت، چونکە تێکەڵی مەرجی خۆی هەیە و کەنارگرتنیش مەرجی خۆی هەیە، هەرکەسیش بیەوێت وەك ئەبووزەر بژی دەبێت بە تەنها بژی، یان تێکەڵی خەڵك بکات بەڵام وازبهێنێت خەڵکی لەو بارەدا بژین کە لە شەریعەتدا حەرام نەکراوە، ئەوەبوو بۆ پشتگوێخستنی دنیا بە سەربەرزی ئەبووزەر چوو بەرەو ناوچەی رەبذە، باری ئەبووزەر باشتر بوو، بەڵام ئەو بارە بۆ هەموو خەڵك نابێت، چونکە ئەگەر لەسەر ئەو رێبازە بچوونایە بەدڵنیاییەوە لەناودەچوون، سوپاس و ستایش بۆ خوا کە هەموو بارەکانی رێکخستووە.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەو رەخنە لە عوسمان دەگیرێت لەسەر کارێك کە عومەر -پێشتر- کردبووی، دەگێردرێتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب ماوەی یەك ساڵ ئیبن مەسعوودو چەند هاوەڵێکی تری لە مەدینە بەند کرد تا ئەو کاتەی شەهید بوو، ئەوکات عوسمان ئازادی کردن، عومەر

لەبەرئەوە بەندی کردن چونکە ئەوانە فەرموودەی زۆریان لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕایەوە.

دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەبووذەرو موعاویەدا روویدا، ئاخۆ ئەبووذەر برێ قسەی دەكرد كە لە سەردەمی عومەری كوڕی خەتتابدا ئەوانەی نەدەوت، بۆیە موعاویە ئەم مەسەلەی باس كرد بۆ عوسمان و ترسا ئاشووبێك لەنێو خەڵكیدا دروست بێت، چونكە ئەبووذەر هانیان دەدات بۆ دنیانەویستی و برێ حاڵ كە هەموو خەڵكی بەرگەی ناگرن بەڵكو تایبەت بۆ هەندێ كەس دەبێت و كەمینەیەك دەتوانن بەرگەی بگرن، بۆیە وەك پێشتر باسمان كرد عوسمان نامەی بۆ نووسی تا ئەبووذەر بێت بۆ مەدینە، كاتێك هاتە مەدینە خەڵكی لەدەوری كۆبوونەوە، ئەبووذەر بە عوسمانی وت بەنیازم بچم بۆ ناوچەی رەبذە، عوسمانیش وتی وابكە، ئەوەبوو ئەبووذەریش وایكرد، تەنها ئەو هەنگاوەش بۆ ئەو گونجاو بوو.[1]

ئیبن تەیمیەش پێی وایە چوونی ئەبووذەر بۆ رەبذە لەبەر نەگونجانی ئەو ئیجتیهادەی بوو كە كردبووی، لەو بارەوە دەڵێت:

ئەبووذەر لە رەبذە نیشتەجێ بوو و لەوێش مرد لەبەر هۆكارێك كە كێشە كەوتە نێوان ئەو و خەڵكەوە، چونكە ئەبووذەر كەسێكی صالحی دنیانەویست

[1] - العوصم من القواصم، تحقيق محب الدين الخطيب و محمود مهدي الأستانبولي، ط2، دار الجيل(بيروت-1987)، ص 85- 88.

بوو، پەیامیشی وابوو کە دنیانەویستی واجبە و مرۆڤ چی لە زیادە پێویستی خۆی هەڵبگرێت ئەوە کەنز و سامانێکە کە لە رۆژی دواییدا پێی داخ دەکرێت، بۆ ئەوەش پشتی دەبەست بە شتێك کە لە قورئان و سوننەتدا بەڵگەی لەسەر نیە، ئەو پشتی دەبەست بە فەرمایشتی خوا(والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله...)، بۆیە چی زیاد لە پێویست بوایە بە کەنزی دادەنا، بۆ ئەوەش پشتی دەبەست بەوەی لە پێغەمبەری خوای (ﷺ) بیستبوو کە فەرموویبووی(يا أبا ذر ما أحب أن لي مثل أحد ذهبا يمضي عليه ثالثة وعندي منه دينار إلا دينارا أرصده لدين)، (ئەی ئەبووزەر حەز ناکەم هێندە کێوی ئوحود زێرم هەبێت و سیانەی بەسەردا تێپەڕ بێت و دیناری لەو زێڕە لای من مابێت مەگەر بۆ قەرزم دانابێت).... کاتێك عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف مرد و سامانێکی جێهێشت ئەبووزەر ئەوەی بەو کەنزە دانا کە لەسەری سزا دەدرێت، عوسمانیش سەبارەت بەو مەسەلە دانوستان و مشتومڕی لەگەڵ ئەبووزەر دەکرد تا ئەوەی کەعب هاتەژوورەوەو هاوڕای عوسمان بوو، بۆیە ئەبووزەر لێیدا، هەر بەو هۆکارەش لە شام ئەبووزەر کێشەی لەگەڵ موعاویە هەبوو، دەستەیەکیش هەبوون هاوڕای ئەبووزەر بوون... خۆ خوای گەورە لە قورئاندا میراتی دیاری کردووەو دابەشی کردووە، دەی میراتیش بۆ کەسێك دەبێت کە دوای خۆی سامانێك جێبهێڵێت، چەندین هاوەڵ لە پشتیوانان و بگرە لە کۆچەرانیش هەبون کە لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) سامانیان هەبووە، چەندین پێغەمبەریش هەبون کە سامانیان هەبووە، ئەبووزەر دەیویست شتێك لەسەر

خەڵك واجب بكات كە خوا واجبی نەكردبوو لەسەریان، لەسەر شتێك سەركۆنەیان بكات كە خوا لەسەر ئەوە سەركۆنەی نەدەكردن، ئەو لەو رایەیدا موجتەهید بوو و وەك هەموو موجتەهیدانی تر لەسەر گوێڕایەڵیەكەی پاداشت وەردەگرێت...لە سەردەمی خیلافەتی عوسماندا -ماڵ و سامان زۆر بوو- و دەوڵەمەندان خوویان دایە زۆر بواری دنیا كە هەیانبوو لە رووی رێژە و جۆرەوە دەچوونە مەیدانی موباحەوە، ئەبووزەریش هێندە نكوولّی دەكرد لێیان تا ئەوەی رێی موباحیشی دەگرت لێیان، ئەمەش هۆكارێكی كێشەی نێوان دوو دەستەكە بوو، بۆیە كەنارگرتنی ئەبووزەر لەبەر ئەو هۆكارە بوو، ئەگەرنا عوسمان هیچ كێشە و مەرامێكی بەرامبەر بە ئەبووزەر نەبوو، ئەوەش هاتووە ئەبووزەر ڕاستگۆترین كەسە واتای ئەوە نییە لە هەموویان باشتر بێت، بەڵكو كەسێكی باوەڕداری لاواز بوو، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی( یا أباذر إني أراك ضعیفا، وإنی أحب لك ما أحب لنفسي، لا تأمرن علی إثنین ولا تولین مال یتیم) (ئەی ئەبووزەر من تۆ بە لاوازی دەبینم، ئەوەشی بۆ خۆم خۆشم دەوێت بۆ تۆیش حەزم پێیە، دەی بەرپرسیارێتی دوو كەسیش مەگرە ئەستۆ و ماڵ و سامانی هەتیویش مەگرە ئەستۆ)، یان لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە(المؤمن القوي خیر وأحب إلی الله من المؤمن الضعیف و في كل الخیر) ئەهلی شورایش باوەڕدارانی بەهێز بوون، ئەبووزەرو هاوڕێنەكانیشی باوەڕدارانی لاواز بوون، باوەڕدارانی چاكی نێو

خیلافەت وەك عوسمان و عەلی و عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف باشتر بوون لە ئەبووذەر و هاووێنەكانی.[1]

عەسكەری دەڵێت: ئەبووذەر خۆی لەبەر زوهد و دووركرتنی لەو سامانەی لە دەستی خەڵكدایە چوون بۆ ڕەبذەی هەڵبژارد.[2]

ئیبن خەلدوون دەڵێت: ئەبووذەر داوای مۆڵەتی كرد لە عوسمان تا لە مەدینە بچێتە دەرەوە، عوسمانیش مۆڵەتی دا و ئەبووذەریش چوو لە ڕەبذە دابەزی و لەوێ مزگەوتێكی بنیاد نا و عوسمانیش وشتری پێدا و دوو مەملووكی –خزمەتكاری– بۆ دانا و مووچەشی بۆ بڕیەوە،[3] هەروەها عوسمان پەیامی نارد بۆ ئەبووذەر و پێی وت جارجارە سەردانی مەدینە بكە تا نەریتی دەشتەكی وەرنەگریت، ئەویش وایدەكرد.[4]

---

١ - منهاج السنة النبوية لابن تيمية، تحقيق د.محمد رشاد سالم، ط1، مؤسسة قرطبة، ج6، ص 173-174.

٢ - الأوائل للعسكري، ج1، ص 55.

٣ - تاريخ ابن خلدون، ط5، دار القلم(بيروت-1984)، ج2، ص 588.

٤ - تأريخ الطبرى، ج2، ص 616.

مردنی ئەبووذەر

سەبارەت بە کاتی مردنی ئەبووذەر لە ساڵی سی و دووی کۆچی و لە مانگی ذیلحیججەدا بوو،[1] ئیبن مەسعوودیش نوێژی مردووی لەسەر کرد، چونکە ئەوکات ئیبن مەسعوود لە مەدینەوە بەرەو کووفە دەچوو، داوا کرا لە ئیبن مەسعوود نوێژی لەسەر بکات، ئەویش وتی ئەوە کێیە؟ وترا ئەبووذەرە. ئەویش گریانێکی زۆر گریا و وتی برا و کەسی خۆشەویستم بە تەنها ژیا و بە تەنها مرد و بە تەنهاش زیندوو دەکرێتەوە، خۆشبەختی بۆی.[2]

کاتێك ئەبووذەر لەسەرەمەرگدا بوو ژنەکەی دەستی کرد بە گریان، ئەبووذەر وتی بۆچی دەگریت؟ ئەویش وتی لەبەرئەوەی کە هەر دەبێت من کفنت بکەم و هیچ جل و بەرگێکم لا نیە تا پێی کفنت بکەم، ئەویش وتی مەگری چونکە بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) رۆژێك کە لەگەڵ چەند کەسێکی تر لەلای بووم دەیفەرموو(لیموتن رجل منکم بفلاة من الأرض تشهده عصابة من المؤمنین)، (کەسێك لە ئێوە لە چۆڵە زەویەکدا دەمرێت کە دەستەیەك لە موسڵمانان ئامادەی مەرگی دەبن)، دەی هەرکام لەوانەی ئەو رۆژە لەگەڵم بوون لە ناو کۆمەڵ و قەرەباڵغیدا مردن، ئیتر ئەوە منم کە لە چۆڵەوانیدا دەمرم. سوێند بەخوا درۆم نەکردووەو درۆشم لەگەڵ نەکراوە، دەی سەیرێکی رێگەکە بکە، ژنەکەشی وتی جا سەیری چی بکەم کە حاجییان چون و رێگەش براوە،

[1] - البداية والنهاية لابن كثير، ج7، ص 165.

[2] - الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج1، ص 253.

ئەویش وتی برۆ و سەیرێکی ورد بکە، ئیتر ژنەکەی زوو زوو دەچوو سەیرێکی ڕێگەکەی دەکرد و دەهاتەوە بۆ خزمەت و سەرپەرشتی ئەبووزەر، ئینجا تاوە تاوە دەچوویەوە سەیرێکی دەوروبەری دەکرد، تا جارێك خەڵکێکی بینی بە بارگەو بنەو وڵاخەوە دەهاتن، کە گەیشتنە لای وتیان ئەوە چیتە لێرە ئەی ئافرەت؟ ئەویش وتی کەسێکی موسڵمانان دەمرێت، وتیان کێیە؟ وتی ئەبووزەر، وتیان ئەبووزەری هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ)؟ وتی بەڵێ، ئەوانیش هەموو دەیانوت بە دایك و باوکمانەوە بەقوربانی بین، خێرا چوون بەرەو لای و چوونە لای، ئەویش بەخێرهاتنی ئەوانی کرد و وتی کاتێك من و چەند کەسێکی تر لای پێغەمبەر(ﷺ) بووین بیستم پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو(کەسێك لە ئێوە لە چۆڵە زەویەکدا دەمرێت کە دەستەیەك لە موسڵمانان ئامادەی مەرگی دەبن)، دەی هەرکام لەوانەی ئەو ڕۆژە لەگەڵم بوون لە ناو کۆمەڵ و قەرەباڵغیدا مردن، ئیتر ئەوە منم کە لە چۆڵەوانیدا دەمرم، ئێوە گوێبیستنی منن کە ئەگەر خۆم یان ژنەکەم پۆشاکێکمان هەبوایە بۆ کفن کردنم ئەوا بەو پۆشاکەی خۆم یان ژنەکەم کفن دەکرام، ئێوە گوێبیستمن کە من بەشایەتتان دەگرم یەکێك لە ئێوە کفنم بکات کە ئەمیر یان عەریف یان پۆستەچی یان نەقیب بووبێت، هەرکامیان یەکێك لەو سیفەتانەی تێدا بوو جگە لە گەنجێکی پشتیوانان نەبێت کە وتی مامە گیان من کفنت دەکەم و هیچکام لەوانەشم نیە کە باست کرد، لەم

عەبایەی خۆمدا کفنت دەکەم، هەروەها لە دوو پۆشاکی تریشمدا کە دایکم بۆی ئامادە کردبووم.[١]

دوای ئەوەی نوێژی مردووی لەسەر کرا و ئەسپەردە کرا، ئینجا ئەو دەستەی موسڵمانان خێزانەکەی ئەبووذەریان بردەوە بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان،[٢] عوسمانیش ژن و منداڵەکانی ئەبووذەری لەگەڵ ژن و منداڵەکانی خۆی دانا.[٣]

ئەبووذەر یەکێك بوو لەو کەسانەی کە زۆر فەرمانی دەکرد بە چاکەو ڕێگری دەکرد لە خراپە، لەبەر ڕەزامەندی خوا گوێی نەدەدا بە لۆمەی هیچ کەسێك.[٤]

ئەبوونوعەیمی ئەصبەهانی سەرەتای دەستپێکردنی ژیاننامەی ئەبووذەری غیفاری بە وەسفێکی ناوازە دێنێت و دەڵێت(العابد الزهيد، القانت الوحيد، رابع الإسلام، ورافض الأزلام قبل نزول الشرع والأحكام، تعبد قبل الدعوة بالشهور والأعوام، وأول من حيا الرسول بتحية الإسلام، لم يكن تأخذه في

---

١ - صحيح ابن حبان، الرقم 6779، المستدرك على الصحيحين، الرقم 5444، مسند أحمد بن حنبل، الرقم 20915، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم 1470، حسنه شعيب الأرناؤوط، كما حسنه الألباني في صحيح و ضعيف الترغيب و الترهيب، الرقم 3314.

٢ - أسد الغابة، ج1، ص 442.

٣ - البداية والنهاية لابن كثير، ج7، ص 165.

٤ - تاريخ الإسلام للذهبي، ج3، ص 406.

الحق لائمة اللوام، ولا تفزعه سطوة الولاة والحكام، أول من تكلم في علم البقاء، وثبت على المشقة والعناء، وحفظ العهود والوصايا، وصبر على المحن والرزايا، واعتزل مخالطة البرايا إلى أن حل بساحة المنايا، أبو ذر الغفاري رضي الله عنه، خدم الرسول، وتعلم الأصول، ونبذ الفضول).[1]

ئايا ئەبووذەر لە ئاشووبخوازەكان بوو؟

بێگومان ئەبووذەری غیفاری لە ئاشووبخوازەكان نەبوو، بەڵكو موجتەهیدێك بوو كە لە مەیدانێكی ئیجتیهادەكانیدا نەیپێكا، بەڵام ئەوەی كە كێشە بوو ئەوەبوو ئاشووبخوازان ئەو بانگەوازەی ئەبووذەریان قۆستەوە بۆ مەرامی پیسی خۆیان و توانییان بیكەنە چەكێك بۆ دژایەتی خیلافەتی عوسمانی كوڕی عەففان و دواجار ڕەواكردنی خوێنی، هیچكام لە هاوەڵان و تابعیەكان و زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعەش گومانیان نیە لەوەی ئەبووذەر هیچ پەیوەندی و هاوكاریەكی نەبووە لەگەڵ ئاشووبخوازان، بەڵكو نیازێكی چاكسازی هەبووەو ئیجتیهادێكی كردووەو ئیجتیهادەكەی نەیپێكاوەو پشت بەخوا یەك پاداشتی بۆ بووە.

---

[1] - حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني، ج1، ص 156-157.

# بەشی پێنجەم

# کۆمەڵە رووخێنەرەکان

# پیلانی قەرمەتی

کۆمەڵە رووخێنەرەکان بەرهەمی ئەو پیلانە مەترسیدارە بون کە هێزەکانی دژ بە ئیسلامو دەوڵەتی دایاننا، کاریگەریەکی سروشتی ئەو پاشماوە گەورەیە بوو کە خرایە نێو ئاسۆی هزری ئیسلامیەوە، ئەمەش لەرێی موعتەزیلەو فەیلەسووفان و تەصەوفی فەلسەفی هزری باتینیەوە، ئەو کۆمەڵانە زۆر و فرەچەشن بوون، بەلام هەموویان یەك ئامانجیان هەبوو کە ئەویش سەروبن کردنی قەوارەی ئیسلامی یان پەرتکردن یان تەنگپێهەڵچنین یان تێکەڵکردنی بە بیری مرۆیی بتپەرستی مادیگەری یان لەناوبردنی بنەماو بەهاکانی و نەهێشتنی رەسەنایەتیەکەی، چالاکی لەناوبردن لە بزووتنەوەی قەرمەتیەکان و زەنج و راوەندی و خوراسانی و بابەکی و مازیارد و ئەفشیندا خۆی نواند، هەموو ئەمانە هەوڵیان دەدا لە دەرەوەی بازنەی عەرەبیەوە خۆیان نیشان بدەن بەو ئامانجەی دەوڵەتی ئیسلامی بڕووخێنن چونکە بازنەی عەرەبایەتییان بە بازنەی پارێزەری بانگەوازی ئیسلامی دەزانی و پێیان وابوو بە رووخاندنی دەتوانن خودی ئیسلامیش بڕووخێنن، بزووتنەوەی زەنجیش پێشەکیەکی پیلانی قەرمەتی بوو، بزووتنەوەی زەنج ئەنجام هاندانێکی دەرەکی بوو کە هەوڵیدەدا دەستی هەبێت لە کۆمەڵێکدا کە بازی ژیانی کۆمەلایەتییان خراپ بوو، سەرکردەی زەنج دەیوت ئەو لە خەواریجەکانەو دەشیوت رەچەڵەکێکی عەلەوی

هەیە، وێڕای ئەو وێنە ساختەی کە هەندێ سەرچاوە هەوڵیان داوە ئەو بزووتنەوەی پێ نیشان بدەن و دەڵێن ئەو بزووتنەوەیە ئامانجی بەدیهێنانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی ئیسلامیە، بەڵام هەڵسوکەوتی سەرکردەی زەنج و تاقمەکەی بە روونی ئەوە نیشان دەدەن کە پیلانێ بووە بۆ شلەژاندنی بوونی ئیسلامی، ئەگەر بزووتنەوەیەکی ئیسلامی رەسەن وایە ئەوە ئەندامانی پەنایان دەبردە بەر رێبازێکی ئیسلامی نەك ئەو شێوە دڕندانەی کوشتو بڕو وێرانکاری و خراپەکاریەی کە ئەنجامیان دا بێ ئەوەی لەپشت ئەو هەڵمەتانەوە وێنەیەکی دادپەروەری کۆمەڵایەتی نیشان بدەن، بەڵکو دواجار کوشتنو تاقبڕکردنی موسڵمانانی لێکەوتەوە، وەك فەیصەل سامر لە کتێبەکەیدا (ثورة الزنج) باسی دەکات و پێی وایە شۆڕشی زنجەکان دەرچوون نەبوو لە دەوڵەت و نیزام، بەڵکو دەرچوون بوو لە ئایین، بۆیە دەبینیت خۆبەخشانە هەزاران کەس لە عێراق و فارس و بەحرەینەوە چوون بۆ جەنگی زەنج، خێرا بەهۆی هاوکاری خەڵکی باشووری عێراق و بەرگری دەوڵەتەوە زەنجەکان بەشێکی زۆری هێزی خۆیان لەدەستدا، ئەو زیانانەش کە لەسەر دەستی سەرکردەکانی بزووتنەوەی زەنج تووشی خەڵکی ناوچەکان بوو و ئەو زیانەی بەهۆی بەرگریکاریەوە تووشیان بوو، رقی خەڵکەکەی بەرامبەر بە زەنجەکان زیاتر کرد.

بێگومان توێژینەوەی لە بزووتنەوەی زەنج لە سایەی راڤەی ئیسلامی بۆ مێژوو ئەم راستیانە دەخاتەڕوو:

یەکەم: بزووتنەوەیەکی پیلانگێڕی بووە کە لەژێر کاریگەری ئامانجی بیانیدا بوو نەك زادەی هەستی راستەقینە بێت.

دووەم: بزووتنەوەکە ئەوەی نیشاندا کە ئەوانەی تیایدان دوور بوون لە ڕێبازی ئیسلامی و کینەو پیلانیان بە دەستەوە بوو، چونکە کوشتو بڕ و خراپەکاری وایان نیشان دەدا مەگەر تەنها بە خوێندنەوەی نووسینەکانی تەبەری ئینجا بزانیت چی ڕوویداوە.

سێیەم: شوێنکەوتوانی بزووتنەوەی زەنج چەندین شاری گرنگیان وێران کرد وەك بەصرەو ئیلە، ئەگەر ئەوان چاکسازییان بە دەستەوە بوایە شارەکانیان وێران نەدەکرد و ئە ڕێبازی دادپەروەریە ئیسلامیەی دەبوو پێیان بوایە رایاندەگەیاند، بەڵام شتی وا بوونی نەبوو.

چوارەم: ئەو بزووتنەوەیە بێبەش بوو لە بوونی بەرنامەیەکی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی ئیسلامدا و نەیتوانی لە چوارچێوەی ئیسلامدا داپەروەری کۆمەڵایەتی بێنێتەدی، بەڵکو ئەو کۆیلانەی خۆیان ئازاد کرد سوور بوون لەسەر ئەوەی عەرەبەکان بکەنە کۆیلەو بکەونە وێزەیان.

پێنجەم: بازارێکی کەنیزەك فرۆشییان دامەزراندبوو بۆ ژنانی عەرەب، بەهای هەر دانەیەك هێندە بەرز دەبوویەوە ئەگەر ژنی دیلی بەنووهاشم بوونایە، ئەمەش پێناس و ئامانجی بزووتنەوەکە نیشان دەدات.

لێرەوە دەزانین ئەو بزووتنەوەیە چۆن شکستی هێنا، چونکە خراپەی زۆری ئەنجام دا و بەرنامەیەکی گشتگیری رەسەنایەتی نەبوو، بەڵکو مۆفەق شەفیق

خۆی یەکلا کردەوە بۆ لێدانی زەنجەکان و یەك دوای یەك گورزی کوشندەی لێ دەوەشاندن تا دواجار لە پایتەختەکەیاندا گەمارۆی دان و پەیوەندی لێ بڕین و دواجار لە سالّی 270 ی کۆچیدا پایتەختەکەیان خۆی دا بە دەستەوەو سەرکردەکەشیان کوژرا.

بێگومان ئەو هێڵە گشتیانە بەسن بۆ نیشاندانی ساختەی هەوڵی بانگخوازانی رۆژئاواگەری و نووسەرانی مارکسی و کەسانێکی تری ئەم سەردەمە کە بزووتنەوەکە بە بانگەوازێکی دادپەروەری و ئازادی وەسف دەدەن، جێی سەرسوڕمانە دکتۆر تەها حوسەین یەکەم کەسە باسی ئەو بزووتنەوەیە دەکات و بە بزووتنەوەیەکی دادپەروەری کۆمەلاّیەتی وەسفی دەکاتو شوێن پێی پیلانی رۆژهەلاّتناسیو موژدەبەری بەرنادات، ئەو پیلانەی هەولّ دەدات لەپێناو خزمەتکردنی پیلانێکی نوێدا مەشخەلّەکانی مێژووی ئیسلامی بکوژێنێتەوە.

دواتر وەك درێژەدانێ بە بزووتنەوەی زەنجەکان بزووتنەوەی قەرمەتی هات، بزووتنەوەی زەنج رووبەرەکەی لەنێوان بەصرەو واسیتدا بوو، بەلاّم قەرمەتیەکان بانگەوازەکەیان لەنێو دانیشتوانی عەرەبی باشووری عێراق و نەبتیەکاندا بلاّو دەکردەوە، سەرەتاکەی بریتی بوو لە بەیەکگەیشتنی عەبدولاّی کوڕی مەیموونی قەداحی دامەزرێنەری بزووتنەوەی باتینی لەگەلّ حەمدان قەرمەتی رێبەری بزووتنەوەکە، عەبدولاّ مەیموون قەداح بە کوڕەکانی دەوت پێشەوا یان ئاین و رەوشت تەنها گومڕایی و گالّتەجارینو خەلّکی تر هی ئەوە نین لەم بنەمایانە تێبگەن، باتینیەت بانگەوازی خۆی بە ناوی خۆشەویستی بۆ

ئەهلوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) بڵاو دەکردەوە، دواتر بوو بە دامەزراوەیەکی نهێنی کە چەندین کەسایەتی و پیاوی نێو دەوڵەتی ئیسلامی تیرۆر دەکرد، پێشڕەوی ئەوانەش نیزامولمولکی تووسی بوو کە دیارترین وەزیری ئەوکاتی دەوڵەتی عەبباسی بوو، دواتر فەخرولمولك، قەداح پشتیوانانی خۆی لەنێو بتپەرستان و خوێندکارانی فەلسەفەی یۆنانیدا دەست دەکەوت.

بلاشیر دەڵێت قەرمەتیەکان توانییان دزە بکەنە نێو ریز خەڵکەوەو پشتیوان بۆ خۆیان پەیدا بکەن تا رێبازەکەی ئەوان بگرنەبەر و گوڕوتینیان هەبێت بۆ بنەماکانیان، بەرگێکی رۆحییان کردبووە بەری بزووتنەوە سیاسیەکەیان تا بەهێزیان بکات، لە ناوچەی بەحرەین دەسەلاتێکی سەربەخۆیان دامەزراند، وەزیر نیزامولمولك نەك تەنها لە رووی سەربازی و سیاسیەوە، بەڵکو لە رووی رۆشنبیریشەوە ئەو بزووتنەوەی شکاند، ئەوەبوو چەند ناوەندی رۆشنبیری دامەزراند تا بەرنگاری ئەو چالاکیە ببنەوە، چەند پەیمانگەی دامەزراند تا پیاوان تیایدا تەخەروج بکەن‌و بتوانن بەرامبەر بانگەوازە باتینیەکان بەستنەوە، ئەو پەیمانگانەش بریتی بوون لە خوێندنگەی نیزامی لە بەغداد، خوێندنگەی نیزامی توانی بەرامبەر ئەو بانگەوازانە بوەستێتەوە کە دوژمنانی ئەهلی سوننە بەرامبەر ئەهلی سوننە بەرپایان کردبوو.

قەرمەتیەکان ئەزموونێکی رەسەنی ئیسلامییان نەگرتەبەر، ئەوان زۆر رقیان لە ئیسلام بوو، بەڵگەی ئەوەش سووکایەتیەکانیانە بەرامبەر بە پیرۆزیە

ئیسلامیەکان و ڕێزی بەیتولحەرام، ئەوان شالاویان بردە سەر مەککەو لە ساڵی 137 ی کۆچیدا گیرفانی هەموو حاجیانیان بەتاڵ کرد و کەوتنە کوشتنیان و دەرگای کەعبەیان شکاند و حەجەرولئەسوەدیشیان دزی.

تەنها ئەم ڕووداوە بەسە تا ساختەی وتەی بانگخوازانی ڕۆژئاواگەری و ڕۆژهەلاتناسان و مارکسیەکانی وەك گاروودی[1] و چەندینی تر ئاشکرا ببێت کە پێیان وایە ئەو بزووتنەوەیە ئەزموونێکی دروستی ئیسلامی بووە.

گاروودی هەوڵیداوە قەرمەتیەکان بە بانگەوازکەرانی دادپەروەی کۆمەلایەتی وەسف بکات، دکتۆر موحەممەد قاسم ناراستی ئەو قسەی خستووەتەڕوو و ئەوەی سەلماندووە هەوڵی قەرمەتیەکان بۆ بەدیهێنانی کەرامەتی مرۆڤ نەبووە، بەڵکو بزووتنەوەیەکی جوداخوازی بوو لە سەردەمێکدا گەشەی سەند کە دەوڵەتی عەبباسی دابەش بوو بۆ چەند دەوڵەتۆکەیەکی ناکۆك، ئەمەش کاری کردە سەر ڕۆحیەتی ئیسلامی.

دکتۆر قاسم دەڵێت بزووتنەوەی قەرمەتی درێژەدانە بە شۆڕشی زەنج کە کەمێك پێش نیوەی سەدە سێیەمی کۆچی دەرکەوت، ئە وشۆڕشەی کە بۆ ڕزگارکردنی کۆیلەکان دەرکەوت، بەلام بزووتنەوەیەکی دادپەروەری کۆمەلایەتی نەبوو، بەڵکو جۆرێ لە تۆڵەسێنی بوو، بەڵکو ئەو کۆیلانە کە خۆیان ئازاد کرد

---

[1] - ئەگەر مەبەستی نووسەر لێرەدا رۆجیە گاروودی بێت ئەوە ئەو کەسایەتیە لەم دواییانەدا موسڵمان بوو و بوو بە بەرگریکارێکی بەهێز لە ئیسلام و چەند نووسینی بەهێزی هەیە سەبارەت بە هۆکاری موسڵمانبوونی و گەورەیی و تایبەتمەندیەکانی ئیسلام. (وەرگێڕ).

سوور بوون لەسەر زەلیل کردنی عەرەب لە رێی بەکۆیلەگرتن و لێدانیان، بەڵام بزووتنەوەی قەرمەتی کە لە باکووری رۆژئاوای وڵاتی عێراق دەرکەوت و دواتر لە ناوچەی کووفە بنکەی داکوتا و هەندێ ناوچەی وڵاتی شام و کەناراوەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی بە لێواری کەنداوی عەرەبی گرتەبەر، دواجار لە بەحرەین سەقامگیر بوو.

ئەو بزووتنەوەیە کە خۆی بە شۆرشێکی کۆمەڵایەتی وەسف دەکرد، پەیوەندیەکی پتەوی هەبوو لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسماعیلیدا، با بە رووکەش لەیەك جیابوونایە بەڵام لە ژێرەوە پەیوەندییان بە یەکەوە هەبوو، چونکە فاتیمیەکان پێیان وابوو دوای دەرکەوتنی دەوڵەتەکەیان لە رۆژئاوا پاش سەرکەوتنی دەوڵەتی فاتیمی لە مەغریبی عەرەبی، دەتوانن بە رووخاندنی دەوڵەتی عەبباسی سەربەخۆ بڕیاری سیاسی بدەن.

لە لایەکی ترەوە دەکرێت بوترێت حەلاجی صۆفی یەکێك بوو لە گەورەترین بانگەوازکەران بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی عەبباسی، چونکە پەیوەندی هەبوو لەگەڵ قەرمەتیەکاندا.

دکتۆر قاسم ەڵێت هێندە بەسە کە خودی مامۆستا جاروودی دان بەوەدا دەنێت کە بزووتنەوەی قەرمەتی بزووتنەوەیەکی تائیفی بووە، قەرمەتیەکان سامانیان بە کۆمەڵگەیاندا پەخش دەکرد و تا ئاستێ یەکسانییان لەنێوانیاندا بەدی هێنا –بە وتەی جاروودی– (هەموو کەسی بەوپەڕی توانایەوە کاری

دەکرد تا بە هۆی ئەو خزمەتەی پێشکەشی دەستەکەی دەکرد بە دەستەکە. بگاتە پایەیەکی نایاب).

تێبینی ئەە دەکرێت رێبەری ئەو بزووتنەوەیە لە مەوالیەکان بوو و لەنێو چینی کرێکار و پیشەساز و کۆیلەو جووتیارو کرێکارە مەوالیەکاندا بیرووراکانی بڵاو دەکردەوە، دواتر دەستەیەك لە رۆژئاواوە دایانە پاڵیان، بزووتنەوەکە لە شوێنێکی نزیك بە شوێنی بزووتنەوەی زەنج دامەزرا و شوێنێکی بە پیتی لە کووفە گرتەدەست، هەوادارانی ئەو بزووتنەوەیە خۆیان وەك شیعەو هەواداری بۆ ئالوبەیت و خۆشەویستی بنەماڵەی عەلەوی نیشاندا، ئەگەرچی لەرووی کرداریەوە رێیەکی تریان گرتەبەر، چونکە هێرشیان بردە سەر شوێنە پیرۆزەکان و تانەدان لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵکو تانەدان لە خودی پێغەمبەر(ﷺ).

ئەو کۆمەڵگە ئیشتیراکیە کۆمەڵگەیەکی چینایەتی بوو، هەرکەس هەواداری بوایە سامانی پێ دەدا تا بچێتە چینی سەرەوە، شیوعیەتێك لە ساماندا هەبوو. بەڵام چینی کۆیلەکان کە دیلەکان بوون لەگەڵ ئەوانی تردا یەکسان نەبوون.

دکتۆر قاسم ئاماژە دەدات بە پەیوەندی شاراوەو ئاشکرای نێوان باتینیەت و خاچپەرستان لە هەردوو سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچی، بە روونی دیاردەیەکی قووڵی هزری نیشان دەدات کە لە سەدەی نۆیەمی زاینیدا دەستی پێکرد و لە سەدەی سیانزەدا گوازرایەوە بۆ ئەورووپا، بیری قەرمەتی و باتینیەکان لەگەڵ خاچیەکاندا گوازرایەوە بۆ ئەورووپا و بوویە هۆی دەرکەوتنی

ماسۆنیەت، ئەمەش واتە بیرۆکەی دژایەتی ئاینەکان لەرێی بەگژدادانی ئاینەکان لای ماسۆنیەکان و پشتیوانانیان لەنێو بانگخوازانی شۆڕشی فەرەنسیدا بوونی هەبووە.

ماسۆنیەکان حەسەن بن صەباحی سەرکردەی دەستەی ئیسماعیلی رۆژهەڵاتی لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا بە پێشینی خۆیان وەسف دەکەن و لەبارەیەوە دەڵێن ئەو گەورە مامۆستای ماسۆنیەت بووە لە جیهانی ئیسلامیدا، لێرەوە دەکرێت تێبگەین چۆن گارووەدی بزووتنەوەی قەرمەتی بە رەگەزێکی بزاڤی ئیشتیراکی داناوە.

بێگومان هەرکەس توێژینەوە لە بزووتنەوەی قەرمەتی بکات، تێدەگات ئەوانە هەنگاوی نەگونجاو لەگەڵ ئیسلامیان گرتووەبەر، دیارترینیان توندوتیژی و وێرانکاری و ئەنجامدانی کاری ئابڕووبەری، هەروەك لەنێو کۆمەڵگەکەیاندا بیروڕای مەزدەکییان پەیڕەو دەکرد، وەك هاوبەشی لە سامان و ژندا، ئیتر چۆن دەکرێت مێژوونووسێکی بە ئامانج یان توێژەرێکی رۆژئاواگەری بڵێت ئەو بزووتنەوەیە یان بزووتنەوەیەکی تری هاوشێوەی بزووتنەوەیەکی چاکسازی ئیسلامیە، بەڵکو نەیارانی ئیسلام هەر لە بتپەرەست و دوانە خوایی و مەجووسیەکانیشەوە کە بە درۆوە خۆیان بە هەواداری ئالوبەیت دەزانن و ئامانجیان لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلامی بووە لەپێناو لەناوبردنی خودی ئیسلامدا، ئا ئەمانە بوونە ئاڵاهەڵگری هەردوو بانگەوازی زەنج و قەرمەتیش.

بێگومان ئەو چەمك‌و واتایانەی ئەو بزووتنەوانە لە سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتییاندا خستیانەڕوو، وەرگیراوی مەجووسی و بتپەرستی بوو، ئەوان بڕوایان بەوە هەموو بەهەشت بریتیە لە دنیا و خۆشیەکانی، ئیتر بڕوایان نەبوو بە زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتن، هەروەك پێچەوانەی پەیامی ئیسلام دەوەستانەوە لە سیستمی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا، بەڵکو بە ڕوونی نەیاری خۆیان بۆ بیروباوەڕ و سیستمی ئیسلام دەردەبڕی‌و بە سەرچاوەی نارەحەتییان دەزانی، هەوڵیان دەدا لەبری ئیسلام چەمك‌و واتای باتینیەت بچەسپێنن، هەمان کاریشیان کرد کە پەیڕەوی پەیامی بیری مرۆیی بتپەرستی و ماددی بوو، ئەزموونیش سەلماندی کە ئەوانە تەنها ستەم و گەندەڵی و بێرەوشتی و وێرانکارییان بەخشی و ئیسلامیش بەهێز و خۆڕاگر مایەوەو ئەو بانگەوازانەی تر نەمان.

چونکە ئەو بزووتنەوانە لەسەر بنەمای ڕێبازێکی بنەڕەتی وا دانەمەزرابوون کە دەرفەتی مانەوەیان پێ بدات، هەرکامیان ئەوپەڕی توندوتیژی و وێرانکاری گرتبوویەبەر، ئەوانەی بانگخوازی بوون کاری ئابڕووبەری بێسنووریان ئەنجام دەدا، ئەوانەی ئالاهەڵگری هەردوو بانگەوازەکە بوون بانگەشەی ئەوەشیان دەکرد کە سەر بە ئەهلوبەیتن و هەواداری ئەوانن، مەبەستیشیان لەناوبردنی دەوڵەت بوو.

ئەو بزووتنەوانە چەمك‌و پەیامی خۆیان لەو سیستمە نهێنیە باتینیەوە وەردەگرت کە ئیخوانوصەفاو هاوشێوەکانیان دایاننا‌و لە بنەڕەتدا ئامانج لێی

رووخاندنی دەوڵەتی ئیسلامی و گێڕانەوەی شکۆی کۆنی فارسی مەجووسی و گەڕانەوە بۆ بتپەرستی و دوانە خوایی و مانەویەت بوو.

بزووتنەوەکانی قەرمەتی لە عێراقو بەحرەینو حەشاشیەکان و باتینیەکان لە سووریا و ئێران هەموویان پەیوەندییان بە یەکەوە هەبوو و حەشیشەیان وەك پێناوێکی لەخشتەبردنی گەنجانی هەواداریان بەکاریان دەهێنا، بەوە هەڵیاندەخەڵەتاندن کە ئیتر ئەرکی پەرستشیان لەسەر نیەو هەموو سنوورێکی حەرامیان بۆ ڕەوایە.

ڕۆژهەڵاتناس دوزی هەوڵیداوە ئەو بزووتنەوەیە بەرز ڕاگرێت و دەڵێت دەرکەوتنی ئەم بزووتنەوەیە دەرەنجامی ئەوەبوو کە جەماوەرێکی زۆری خەڵك شوێن ڕێبازی جیاجیاد ەکەوتن و هەموان پێکەوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجێ کاریان دەکرد، ئێمەش دەڵێین ئەو ئامانجە تەنها پیلانگێڕی دژ بە ئیسلام بوو، تەنها ئارەزووبازی و لەخشتەبردن ئەو هەمووەی پێکەوە کۆکردبوویەوەو نەیاندەتوانی هیچ لاریەك ڕاست بکەنەوەو بە گەندەڵیو ستەمکارییان سەلماندیان کە شکستیان خواردووە.

کاریگەریەکەی ماوەیەکی کەمی خایاند و خێرا ڕووی ڕاستی دەرکەوت و روون بوویەوە کە بزووتنەوەیەکی نەیار بە ئیسلامەو لەنێو چەند هێزێکی بیانیدا دەرکەوتووەو ئامانجی ئەوەیە ئەو قەوارە ئیسلامیە لەناوبەرێت، کۆبوونەوەیەکیان سازدا کە تەنها پەیوەندی ئارەزووبازی و مەینۆشی کۆی دەکردنەوەو بۆ بەدیهێنانی ئامانجە دوورمەوداکانیان ئارەزووەکانیان بۆ بەدی

دەهێنان، بانگەوازەکەیان بەتاڵانبردنی سامانی دەوڵەمەندان و مەی خواردنەوەو بە هاوسەرگرتنی خوشك و کچ و لەناوبردنی پیاوانی دەوڵەت و نەهێشتنی ئارامی نێو کۆمەڵگەی لەخۆگرتبوو.

ئەو تاقمە مەجووسی و جوولەکەو مەسیحی و صابیئەو بتپەرست و بەرهەمیان کە هەموویان نکووڵیان دەکرد لە بوونی ئیسلام و داخ لەدڵ بوون بەرامبەر بە ئیسلام، لە سایەی سەرکردایەتی قەرمەتی و بزووتنەوە باتینیەکاندا یەکیان گرت و کۆبوونەوە، ئیتر تاکە بەرهەمیان بریتی بوو لە وێرانکاری، تاکە مێژوونوسێکی بە ویژدان ناتوانێ ئەو خراپەو گەندەڵیە بە بزووتنەوەیەکی چاکسازی وەسف بکات، مەگەر جوولەکەی جیهانی ئەو کارە بکات، وەك لە کۆنگرەی بلتیمور لە ساڵی 1948 ی زاینی لە ویلایەتە یەککگرتووەکان هاودەم بە کۆمەڵێك موژدەبەر و رۆژهەڵاتناس پیلانێکیان دانا بۆ زیندووکردنەوەی ئەو بزووتنەوانەو خستنەوەڕوویان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا تا وەك بزووتنەوەیەکی چاکسازی و راپەڕینێ دژ بە سیستمی ئیسلامی بیخەنەڕوو، ئەو بانگەوازەش توانی برێ نووسەر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە تا قەرمەتی و باتینیەکان بە شۆڕشی ئیسلامی ناوببەن، بەلام نەیانتوانی کەس لەخشتە بەرن‌و ئێستا موسڵمانان سەرچاوەکانی گومان دەناسن‌و دەزانن جوولەکە داگیرکەر و مارکسیەت پێشەنگی ئەو گومانسازیە دەکەن.

بارەکە لە بزووتنەوەی زەنج‌و قەرمەتیەکاندا نەوەستا، بەڵکو چەند بزووتنەوەی تر دەرکەوتن وەك بزووتنەوەکانی موقنعی خوراسانی و بابەکی

خورەمی و مازیار ئەفشین و راوەندی، هەموو ئەمانەش هەمان هەواداری باتینیو ئاراستەی کینەلەدڵی مەجووسیانەیان هەبوو کە هەوڵیان دەدا سیستمی ئیسلامی وێران بکەن، ئەو بزووتنەوە نهێنیانە وایان نیشاندەدا موسڵمانن و ئەهلوبەیتی پێغەمبەریان خۆش دەوێت، تا لەو رێگەوە دەسەڵاتی عەرەبی ئیسلامی لەناوبەرن و بەوەش رێخۆشکەری بکەن بۆ لەناوبردنی خودی ئیسلام، ئەوان لە ناوچە فارسیەکاندا خەڵکیان کۆدەکردەوەو بە ئارەزووبازی لەخشتەیان دەبردن‌و رق و کینەیا دەخستە نێو دڵیانەوە، بۆیە وێڕای ئەو ترس‌و بیمەی هەیانبوو هاوکات بانگەوازیان بۆ هێز و دەسەڵات دەکرد، بەلام کاتێك هێزێکی راستەقینە بەرنگاریان بوویەوە خێرا رووخان، وەك ئەوەی بڵێیت قەلاکانیان لە گەڵا و پەڕە دروست کرابێت، پیلان باتینی بە کۆکردنەوەی تاریکاییەکانی مەجووسیەت و مەزدەکی و زەردەشتی و مانەوی نەیتوانی بەرنگاری رووناکای ئیسلام بێتەوەو بوویە خۆڵەمێشێ کە بەم دواییانە رۆژهەڵاتناسان و موژدەبەران و نەیارانی ئیسلام لە سەردەمەین وێدا هەوڵیان دا بیگەشێننەوەو زیندووی بکەنەوەو جارێکی تر بیخەنەوە دەست موسڵمانان تا پەرتەوازەیان بکات و لە راستی ئیسلام دووریان بخاتەوەو جارێکی تر ناکۆکی لەناوچووی نێوان عەرەب و فارس‌و هەموو هێزەکانی تر زیندوو بکەنەوە.

ئەوپەڕی بەهێزیو توانای باتینیەکان بە دەرکەوتنی حەسەنی کوڕی صەباح خۆی نواند، ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد سەر بە پاشا کۆنەکانی حیمیەرە، چوو لە قەڵایەکی شاخاوی ناسراوی بە ئەلەموت لە دووری 843

کیلۆمەتر لە دووری دەریای خەزەر نیشتەجێ بوو، نیزامولمولك ترسی هەبوو لە حەسەنو بەسەرهاتی لەوبارەوە ناسراوە کاتێك لە کۆشکی مەلەکشاهدا کەوتە شوێنی، حەسەن سەرەتا لای نیزامولمولك سەرقاڵ دەرسو دەور بوو تا نیزامولمولك پیلانێکی بۆ دانا ناچاری کرد هەڵبێت.

لە قەڵای ئەلەمووتەوە دەوڵەتی حەشاشیەکان دامەزرات تا جەنگیز خان لە کاتی رۆیشتنی رووەو بەغداد گرتی، حەشاشیەکان لە برێ شاخدا خۆیان قایم دەکرد و رێیان بە خەڵکی دەگرت، ئیتر هێزەکانی دەوڵەت سەرەتا نەیاندەتوانی بگەنە ئەوێ، ئەوانیش دەیانتوانی بە هاوکاری خاچپەرستان بارگرژی بنێنەوەو دەوڵەت سەرقاڵ بکەن بە بەرنگاربوونەوەی شاڵاوی خاچپەرستی، لەگەڵ ئەوەشدا سەلجووقیەکان توانییان گەورەترین قەڵای باتینیەکان لەناوبەرن، ئەویش ئەو گورزە کوشندە بوو کە زاهیر بیبرس ئاراستەی کردن.

حەشاشیەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان پشتیان دەبەست بە تیرۆر کردن، وەك چۆن بۆ بێهۆشکردنی ئەندامە نوێکان حەشیشیان بەکاردەهێنا و دەیانبردن بۆ باخچە رازاوەکانیان تا وایان تێبگەیەنن ئەوان لە بەهەشتدان. هێزی حەشاشیەکان لە هەموو ناوچەکانی دەوڵەت لە فارس و عێراقدا تەشەنەی سەند، بەڵام وێڕای ئەو ماوەی بەسەریان برد، لە کەنار کۆمەڵگەی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامیەوە دەژیان.

ئەوان قۆناغی لاوازی خیلافەت و پەرتبوونی دەوڵەتو جیابوونەوەی هەندێ ویلایەتیان بەهەند وەرگرت، ئەمەش کاتێك دەیانبینی هێزی سەربازی جیاجیا دەستیان گرتووە بەسەر دەوڵەتداو سەرکردایەتی دەکەنو والی ناوچەکان دیاری دەکەن و سامان و سوپاسان بە دەستەوەیەو خەلیفە تەنها ناوێکی بۆ ماوەتەوەو هیچی تر.

هەموو ئەمانە پێشەکیەك بوون بۆ رووخانی بەغداد لە ساڵی 656ی کۆچیو کشانی خاچپەرستان رووەو قودس، لەو ماوەدا زۆر راستی ئاشکرا بوون و زۆرێك لەوانەی هەڵخەڵەتابوون هاتنەوە هۆش، زەرکەوت زۆرێك لەوانەی بە فێڵ خەڵکیان لەخشتە بردبوو وەك ئیبن عەرەبی و حەلاج و سەهرەوەردی هەموویان خوێندکاری باتینیەت بوونو لەژێر ناوی بریقەداردا خۆیان حەشار دابوو لەکاتێکدا لە ژێرەوە پەیوەندی سیاسییان هەبوو لەگەڵ پیلان گێڕاناو رێککەوتبوون لەسەر رووخاندنی دەوڵەتی ئیسلامی.

هەروەك دەرکوت بزووتنەوەی باتینی هەشت یان نۆ دەستو تاقمی پیلان گێڕین لە چەند ناوچەیەکی عێراقیو فارسیدا کە پاشماوەی مەجووسیەتو مەزدەکی و بابلییان لەخۆگرتووەو برێ هێما و ئامازەی نهێنی هۆیان هەیە کە لە پشت ئەوانەوە ئامانجی خۆیان شاردوەتەوە، ئەو بانگەوازانە بوونەتە پەناگەیەك بۆ هەر کەسێکی داخ لەدڵ و هەر ئارەزووبازێ.

لە سەردەمی نوێدا چەندین نووسینی شعووبی و شیوعی هەن هەوڵ دەدەن ئەو رێچکە باتینیانە زیندوو بکەنەوەو لە سایەی راڤەی ماددی بۆ مێژوودا

قسەیان لەسەر دەکەن، یان لە سایەی چەمکو واتای رەگەزی و نەتەوایەتی بەرتەسکدا باسیان دەکەن، هەندێ هەوڵ دەدەن ئەوانە وەك بزووتنەوەیەکی چاکسازی رووەو بەدیهێنانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی یان راپەڕینی نەتەوایەتی بناسێنن، پێیان وایە بزووتنەوەکەی بابەکی خورەمی راپەڕینی گەلی ئازەربایجانی بوو دژ بە خیلافەتی عەبباسی، ئەمەش زێدەرۆییەکی زۆرو شێواندی راستی مێژوویی تێدایە، چونکە بابەکیش یەکێك بوو لەو بزووتنەوانەی کاری رووخاندنی بینای ئیسلام و وێرانکردنی سەکۆی بیری رەسەنی قورئانی بوو، مێژوونووسی عەبباسی کە نووسەری کتێبی (العیون و الحدائق فی اخبار الحقائق)ە دەڵێت: لە ئیسلامدا رووداوێك نەبووە هێندەی دەرکەوتنی بابەکی خورەمی زیانی بووبێت بۆ ئیسلام و موسڵمانان، ئەویش بەو پەیامەی کە قەرمەتی و باتینیەتی لێکەوتەوە.

بانگخوازانی رۆژئاواگەری لە بازنەی بیری رۆژئاوایی یان مارکسیدا هەمان قسە دەڵێنەوە گوایە باتینیەت هەوڵیداوە مافو ئازادی بۆ ئافرەت بگێڕێتەوەو بێڕەوشتی و بێبەرگییان بە بزووتنەوەیەکی پێشکەوتنخوازی ئافرەتان لەقەڵەمداوە.

بزووتنەوەکەی بابەکیش یەکێك بوو لەو بزووتنەوە باتینیانەی کە هەبوو. لەگەڵ بزووتنەوەی قەرمەتیدا یەك بنەمایان هەبوو کە ئەویش وازهێنان بوو لە پەرستش و نەمانی ئەرکە ئەخلاقیەکان، بەڵگەنامەکانی مێژوو (مەسعوودی لە کتێبەکەیدا) جەخت لەوە دەکەنەوە بابەك لەگەڵ سیۆقیلی ئیمپراتۆری رۆمدا

هاوپەیمانی بەستووەو بە نووسراویٚ لەسەر ئەوە ریٚککەوتون کە سوپای عەبباسی لەناوبەرن و دەسەلاٚتی عەرەبی نەهیٚلن.

سەرچاوەکان دەلیٚن ئیمپراتۆری رۆم بریٚ هاوکاری گەورەی پیٚشکەش کردووە بە بابەکی خورەمی تا هیٚرش بباتە سەر موسلمانان، پیٚشوازیشی کردووە لەو خورەمیانەی رایانکرد بۆ خاکی بیزەنتی، دواتر پاشماوەی بابەکیەکانیش پاش چوونە نیٚو ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی دایانە پالیان، مازیاریش کە یەکیٚك بوو لە پیلانگیٚرانی ژیٚر ئالاٚی بزووتنەوەی باتینی پاش بەدیل گرتنی دانی نا بەوەدا لەگەلٚ پیلانگیٚراندا ریٚککەوتووە لەسەر سەندنەوەی دەسەلاٚت لە عەرەب و گیٚرانەوەی بۆ کیسراکانی فارس، هەروەك ئەفشین و مازیار ریٚککەوتبوون لەسەر زیندووکردنەوەی ریٚبازی دوانەخوایی و مەجووسیەت، ئیتر چۆن دەکریٚت ئەمرۆ کەسیٚك بیٚت ئەو بیرە بخاتەوەروو بۆ موسلمانان و بە بیریٚکی پیٚشکەوتنخوازی یان ئیشتیراکی ناوی بەریٚت، چۆن دەکریٚت ریٚچکەو رەوتی وا بە بزووتنەوەی دادپەروەری کۆمەلاٚیەتی وەسف بکریٚن بە وچەشنەی تەها حوسەین و کۆمەلیٚك لە رۆژهەلاٚتناسان و بانگخوازانی رۆژئاواگەری دەیلیٚن.

باتینیەت هەولیداوە جەماوەر بە هەلە مەنتیقیەکانو فیردەوسی چاوەروان کراو لەخشتە بەریٚت، دواتر دەرکەوت ئەوەش نموونەیەکی پیلانی مارکسی سەردەمە، ئەو بزووتنەوانە شکان و پەیامە هزریەکەشیان بەرگەی رەسەنایەتی ئیسلامی نەگرت و خیٚرا رەسەنایەتی ئیسلامی زالٚ بوو بەسەر بیری سەرشیٚویٚنی مرۆییدا، هەرەك دەرکەوت چالاکی ئەو دەستە رووخیٚنەرانە هیچکات نەبووەتە

هەڕەشەی نەمانی ژیاری ئیسلامی لە هیچ ناوچەیەکدا، بەڵکو بەهێزتری کردووەو بانگەشەی پووچی ڕۆژهەڵاتناسانیشی بەدرۆ خستۆتەوە.

## بەشی شەشەم

## زیندووکردنەوەی بیری مرۆیی

بیری مرۆیی تووشی بەرنگاربوونەوەیەکی رەسەنی راستەقینە بوویەوەو ساختەی ئەو بیرەی ئاشکرا کردو کرۆکی ئەو رەسەنایەتیە ئیسلامیەی خستۆتەڕوو کە چەمکی ئەهلی سوننەو جەماعەی بۆ بەکاردێت، بەڵام قەڵەمڕەوی بیانی بە دەزاگاکانی رۆژهەڵاتناسیو موژدەبەریو شاڵاوی هزری و رۆژئاواگەری و شعووبیەتەوە کار دەکات بۆ زیندووکردنەوەی ئەو بیرە تا گومان بنێتەوەو یەکبوونی بیری ئیسلامی پەرت بکاتەوە، ئەو هەوڵە لەژێر ناوی نوێکردنەوەی بیری عەرەبی دەستی پێکرد، ئەمەش بەو بانگەشەی بیری عەرەبی هاوچەرخ خۆی دامەزراوەو جیایە لە بیری ئیسلامی و سەرلەنوێ خۆی بنیاد دەنێت و خۆی دادەبڕێت لە چواردە سەدە ئەزموون، بەڵکو بەو جۆرە خۆی دەبەستێتەوە بە بیری رۆژئاواییەوە کە پیاولنی ئیسرائیلیات و موژدەبەران بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەمەش لەپێناو پێکهێنانی بیرێکی نوێ بە ناوی بیری عەرەبی، لە روانگەی بیری رۆژئاواییەوە بڕوانێتە ئیسلامو بیروباوەڕی ئیسلامیو ئەدەب وەك بەرهەمێکی سەردەمو بارودۆخ تەماشا بکات، لەکاتێکد روانینی ئیسلامی عەرەبی پێی وایە ئەدەبی عەرەبی ئیشەو پێناوی ژیانی لە بنەڕەتێکی رەسەنی قورئانیەوە وەرگرتووەو ئەدەب تەنها بەشێکە لە بیری گشتگیری عەرەبی و لێی جیانابێتەوە، بەڵکو لەسەر بنەمای

بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پاداشتی ڕۆژی دوایی و ئەخلاقیەتی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی دامەزراوە.

ئەو هەوڵە مەترسیدارە دابەش کرا بەسەر وانەکانی تایبەت بە زیندووکردنەوەی ئیعتیزال و وایان نیشان دەدا نوێکردنەوەی بیری ئیسلامی بەدەست موعتەزیلەو پیاوانی ئەهلی کەلامەوە دەبێت، هەروەها بە بانگەواز کردن بۆ نوێکردنەوەی بیری فەلسەفی لەو لایەنانەوە غەزالی هێرشی کردوەتەسەر و ئیبن تەیمیە لەناوی برد، بەڵکو بانگەواز دەکەن بۆ زیندوو کردنەوەی تەصەوفی فەلسەفی، ئەو تەصەوفەی حلول و ئیتیحاد و وەحدەتولوجودی لەخۆدەگرت، هەروەها بانگەواز کردن بۆ زیندووکردنەوەی بیری باتینی شعووبی.

بزووتنەوەی نوێکردنەوەی بیری مرۆیی لەو چوار مەیدانەدا هەنگاوی خۆی نا، ئەمەش لەژێر ئالای (بیری ئازاد) دا.

ڕۆژهەڵاتناسی بەم هەنگاوە دەستی پێکرد: زیندووکردنەوەی داروپەردووی کۆنی ئەو بوارانەو چاپکردن‌و پەخشکردنەوەیان.

ئەو قۆناغە لە ساڵی 1909 بە کتێبەکەی لویس ماسینیۆن دەستی پێکدر تا لە ساڵی 1926 و دوای ڕووخانی خیلافەت تەها حوسەین بوویە ئاڵاهەڵگری، دواتر لە ساڵی 1946 دا عەبدورەحمان بەدەوی نوێی کردەوە، دواتر لە ساڵی 1967 ەوە زەکی نەجیب مەحموود لێنەوی، ئینجا سەرلەنوێ دەست کرا بە زیندووکردنەوەی ئەو فەرهەنگانە:

یەکەم: لویس ماسینیون کتێبەکانی حەلاج و سەهرەوەردی و فەرید عەتار و ئیبن سەبعینی بڵاوکردەوە.

دووەم: جۆلد سیهەر نووسینەکانی صەلاح بن عەبدولقودوسی بڵاوکردەوە.

سێیەم: کریمکی نووسینەکانی تایبەت بە ئیبانی کوڕی عەبدولحەمید لاحقی بڵاوکردەوە.

چوارەم: فرەنسکۆ جبریلی و باوەل کراوس تایبەت بە نووسینەکانی ئیبنولموقەفەعی بڵاوکردەوە.

پێنجەم: باول کراوس نووسینەکانی تایبەت بە ئیبن راوەندی بڵاوکردەوە.

شەشەم: فرنسکۆ جبریلی نووسینەکانی تایبەت بە بەشار بن بردی بڵاو کردەوە.

حەوتەم: باول کراوس نووسینەکانی تایبەت بە موحەممەد بن زەکەریای رازی بڵاوکردەوە.

هەشتەم: نووسینەکانی ئەسین باسیۆس سەبارەت بە ئیبن عەرەبی.

دواتر رۆڵی رۆژئاواگەرە عەرەبەکان دێت کە رۆڵێکی گەورەیان بینی:

یەکەم: تەها حوسەین سەبارەت بە زندیقەکان (بەشار بن بردو ئەبوونەواس‌و حەمادو ئیبانی کوڕی عەبدولحەمید) کتێبی نووسی‌و نووسینەکانی ئیبنولموقەفەع‌و پەیامەکانی ئیخوانوصەفای چاپکردەوە.

دووەم: عەبدوڕەحمان بەدەوی دوو کتێبی نووسی(شخصيات قلقة) و (من تأريخ الإلحاد في الإسلام)، تیایدا هەریەك لە حەلاج و سەهرەوەردی و

ئیبنولموقەفەع و ئیبن راوەندی و رازی هێناوە، شەتەحاتی صۆفیگەرایی لە ئەبووزەیدی بەستامی و پەیامەکانی ئیبن سەبعینەوە هێناوە، نووسینەکەی ئیبن بلاسیۆسی سەبارەت بە ئیبن عەرەبی وەرگێڕا، بەمەش بەشێکی زۆری ئەو فەرهەنگە غەنووصیو مەجووسیە کۆنەی زیندوو کردەوە، هەرچەندە ئەوە وەك وەرگێڕانێ بۆ نووسینەکانی رۆژهەلاتناسان ئەو کارەی کرد.

سێیەم: دکتۆر زەکی نەجیب مەحموود لە هەردوو کتێبەکەیدا (تجدید الفكر العربى) و (المعقول و اللامعقول في التراث العربي) دا بیری بتپەرستی غەنوصی مرۆیی دارشتووەتەوە.

بزاڤی نوێکردنەوەی بیری مرۆیی لە چەند روانگەیەکەوە خۆی نواند:

یەکەم: نووسینەوەی مێژووی قەرمەتی و زەنج و باتینیەکان و دانانیان بە بزووتنەوەی دادپەروەری و ئازادی یان شۆڕشی ئیسلامی، لەوانەش نووسینەکەی مەحموود ئیسماعیل سەبارەت بە بزووتنەوە نهێنیەکان لە ئیسلامدا، نووسینەکەی حوسەین وەزیر سەبارەت بە راپەڕینی گەلی ئازەربایجانی.

دووەم: بانگەوازکردن بۆ موعتەزیلەو راوەندی، ئەمەش لە هەولەکەی دکتۆر زەکی نەجیب مەحمووددا خۆی دەنوێنێت.

سێیەم: پاچکردنەوەی کتێبەکانی وەحدەتولوجود و حلوول و ئیتیحاد. بەنموونە چاپکردنی کتێبەکانی ئیبن عەرەبی و حەلاج.

چوارەم: هەوڵی سەپاندنی ڕێبازی ڕاڤەی مارکسی بۆ مێژوو، وەك هەڵەکەی ئەحمەد عەبباس صالح بە ناونیشانی (اليمين و اليسار فى الاسلام).

پێنجەم: هەوڵەکەی لوتفی سەید کە لە وەرگێڕانی کتێبی ئەخلاقی ئەرستۆدا خۆی نیشان دەدات و فەلسەفەی ئەرستۆ دەکاتە سەرچاوەی ڕاپەڕینی نوێی عەرەبی، هەروەها تەمام حەسان کتێبی (مسالك الثقافة الإغريقية إلى العرب) ی وەرگێڕا کە لە نووسینی ئۆلیری بوو، هەروەها کتێبی (الأصول اليونانية النظريات السياسية في الإسلام) لە نووسینی ئیبراهیم بیومی مەدکور، هەموو ئەمانە هەوڵێ بوون تا بیری هێلینی زاڵ بکەن بەسەر بیری ئیسلامیدا.

عەبدوڕەحمانی بەدەویش ئەم نووسینانەی هەبوو (شطحات الصوفية لأبو زيد البسطامى والأفلاطونية المحدثة عن العرب و الخوارج و الشيعة و رسائل ابن سبعين).

بەوجۆرە هەمو لقەکانی کۆکردوەتەوە (فەلسەفی و صۆفیگەری و کەلامی) تا بەرەیەکی مەترسیدار پێکبهێنن کە بنەرەتەکەی چەمکو واتاکانی بیری مرۆیی بن، ئەمەش بەدواداچوونی هەوڵەکەی ماسینیۆن و باول کراوسە.

عەبدوڕەحمان بەدەوی کارەکانی ڕۆژهەڵاتناسانی نوێ کردەوەو وەریگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، لە کتێبەکەیدا (تاريخ الالحاد فى الاسلام) باس لە زندیقەکان دەکات و بە فراوانی باسی ژیانیان دەکات و بیری ئەوانە گەرم دەکاتەوەو دەیخاتە بەردەم ڕۆشنبیرانی عەرەب، باسی تالووت و نعمان و صالح

بن عەبدولقودوس و عەبدولکەریمی کوڕی ئەبیلعەوجا و ئەبووعیسا وەراق و بەشار و حەماد و ئەبانی کوڕی عەبدولحەمید و ئەبولعەتاهیە دەکات.

کەسی وەك سەید حوسەین نەصر لە ئێران سەبارەت بە ئیبن سیناو سەهرەوەردی و ئیبن عەرەبیش نووسینی هەیە و ناوی ناوە دانایانێکی موسڵمان و ئەو بیرو بانگەوازەی ئەوان نوێ دەکاتەوەو دەیانبەستێتەوە بە زەدەشتی و مانەوی، زانستی هێما و نهێنیەکان زیندوو دەکاتەوەو سەرسامیەکی زۆری خۆی نیشان دەدات پێیان و تەواو کەنار دەگرێت لە چەمكو واتای رەسەنایەتی ئیسلامی.

بەوجۆرە چوارچێوەی پیلانی دژ بە ئیسلام لەو خولەدا فراوان بوو، ئەزموونی یەکەم لە بەردەم رێبەرانی پیلانەکەدا (رۆژئاواگەری و شیوعیەت و جوولەکەی جیهانی) روون بوو، هەڵگرانی پیلانەکە بینییان چۆن ماوەی دوو سەدە پاشماوەی هیلینی فارسی باتینی بتپەرستی تانی بیری ئیسلامی نغرۆ بکات، بۆیە بەو توێژینەوە فراوانانەیان لە هەموو بوارەکاندا کەوتنە زیندووکردنەوەی ئەو هەوڵانە، هەر بوارێ دەرفەت هەبوایە بۆ لێدانی بیری ئیسلامی کاریان تێدا دەکرد، چونکە بیری ئیسلامی بواری فەلسەفەی لاواز کردبوو وبەرنگاری موعتەزیلەش بووبوویەوە، ئیتر ئەمەش هۆکاری دواکەوتەیی موسڵمانان بوو.

هەڵمەتەکە بۆ سەر ئیمامی غەزالی زۆر توند بوو، چاوپۆشی و خۆ بێئاگا کردن لە رێبەرانی بزووتنەوەی بەرگریکاری و بەرنگاربوونەوە، ئەوانەی

ئالاهەڵگری بیری رەسەنایەتی ئیسلامی بوون، پاشان زەقکردنەوەی ناوی ئاڵاهەڵگرانی باتینیەت و فەلسەفەو زندیقی کۆن کە بە مەشائیەکان یان شرۆڤەکاران ناسراون، شتێکی دیار بوو، ئیتر دەیان توێژینەوەیان لەبارەوە کرا و زۆربەشیان لە پێوەری رەسەنایەتی ئیسلامیدا دەرنەدەچوون، زیاترین تۆمەتەکانیش رووەو فارابی و ئیبن سینان.

یەکێك لە مەترسیدارترین بانگەشەکانی پیلانەکە بریتیە لە جیاکردنەوەی بیری ئیسلامی نوێی لە بیری ئیسلامی قۆناغەکانی سەرەتای ئیسلام، ئەمەش لەژێر ناوی بیری عەرەبیدا، تەنها لەپێناو کەنارخستن و شکاندنیدا، بەڵام بزووتنەوەی بێداریخوازی ئیسلامی توانی بەرنگاری ئەو پیلانە بێتەوەو چەندین توێژینەوەو نووسینی لەو بارەوە پێشکەش کردو تیایدا ساختەکاریەکانی ئاشکرا کرد و گومانەکانی هەڵتەکاند، چەندین بریاری ئیسلامی تایبەت بەو پیلانانە پێنووسیان خستەکار.

## ئیسرائیلیاتی نویٚ له میٚژوو و بیروباوه‌ڕدا

ئیسرائیلیاتی نویٚ نویٚکراوه‌یه‌کی هه‌مان ئیسرائیلیاتی کۆنه، به‌لاّم ئه‌مجار خراوه‌ته نیٚو بازنه‌ی ڕیٚبازی زانستیه‌وه‌و جوانی ده‌ربڕین و داهیٚنانی بیردۆزه‌ی نویٚی پیٚوه نووسیٚنراوه، چه‌ندین تویٚژه‌ر ریشه‌ی تلموودییان له هه‌ریه‌ك له‌مانه‌دا ئاشکرا کرد:

ڕیٚبازی شیکاری ده‌روونی لای فرۆید.

ڕیٚبازی گۆڕانی ڕه‌وشت لای لیفی بریل.

ڕیٚبزای ته‌مانی به‌رپرسیاریٚتی تاکه‌که‌سیو زاڵبوونی به‌رپرسیاریٚتی به‌کۆمه‌ڵ لای دۆرکایم.

ڕیٚبازی به‌رزراگرتنی راڤه‌ی ئابووری بۆ میٚژوو لای مارکس.

له‌بواری لیٚدانی ئیسلامدا، هه‌وڵه‌کان به زۆری چڕ کرابوونه‌وه سه‌ر ساخته‌کردنی میٚژوو و ویٚناکردنی هه‌ڵمه‌ته باتینی و قه‌رمه‌تیه‌کان به بزووتنه‌وه‌گه‌لیٚکی شۆڕشگیٚڕی چاکسازی.

دوای ئه‌وه‌ی دواده‌قی کۆنگره‌ی بلتیمۆر له ساڵی 1942 ی زاینی ده‌رچوو و بانگه‌وازی ده‌کرد بۆ گرنگیدان به تویٚژینه‌وه‌و زیندووکردنه‌وه‌ی بزووتنه‌وه نهیٚنیه‌کانی ناو ئیسلام، ئیتر ئه‌و بزووتنه‌وه‌یه له ئاسۆی بیری ئیسلامیدا ده‌رکه‌وت و. بریٚ نووسینی عه‌ره‌بی له‌و بواره‌دا ده‌رکه‌وتن که هه‌وڵیان ده‌دا بزووتنه‌وه‌کانی دژ به ئیسلام وه‌ك بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامیی ڕه‌سه‌ن نیشان بده‌ن.

لەم ساڵانەی دواییدا زیاتر جەخت لە قەرمەتیەکان دەکرایەوەو وەك بزووتنەوەیەکی پێشکەوتووخواز وەسف دەکران، بانگخوازان دەهاتنە رۆژهەڵات تا وا نیشان بدەن قەرمەتیەکان بانگخوازانی دادپەروەین لە ئیسلامدا، ئەمەش وەك جاروودی و چەندێکی تر، دکتۆر تەها حوسەینیش لە ساڵی 1950 دا لە گۆڤای الكاتب ی میصری جوولەکەییدا بە هەمان شێوە وەسفی کردون.

لەراستیدا بزووتنەوەی قەرمەتی بزووتنەوەیەکی ئیسلامی نەبوو، بەڵکو بزووتنەوەیەکی پیلان گێڕ بوو دژ بە ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامی، ئەو پیلانە هاوبەشەی کە هەریەك لە جوولەکەو مەجووسی و هێزە شعووبیەکان لە بەرژەوەندی دەوڵەتی رۆمانی رۆژهەڵاتی کاریان دەکرد.

دەکرێت لەمبارەوە ئەم خاڵانە بخەینەڕوو:

یەکەم: بزووتنەوەی قەرمەتی مۆرکی مرۆیی نەبوو یان دروشمی ئازادکردن یان رێزدارکردنی مرۆڤی نەبوو، بەڵکو ئیسلامی کردبوویە پەردەیەك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی پیلانەکە، بەڵکو بزووتنەوەیەکی تەولوی تائیفی بوو.

دووەم: بزووتنەوەی قەرمەتی پەیوەندی هەبوو بە شۆڕشی زەنجەوە، خاوەن مۆرکێکی ئیسلامیش نەبوو، بەڵکو وەك دکتۆر مەحموود قاسم دەڵێت بزووتنەوەیەکی تۆڵەسێنی بوو (ئەوان ئەو کۆیلانەیان هان دەدان کە خۆیان ئازاد کردبوو تا عەرەبەکان بکەنە کۆیلەو بکەونە وێزەیان).

سێیەم: ئەو بزووتنەوەیە ئیسلامی نەبوو، لەبەرئەوەی تاکە رۆژێکیش رێبازی ئیسلامی پەیڕەو نەکرد، بەڵکو رێبازی شیوعیەتی لە سامان و ئابڕوودا

پەیڕەو دەکرد، کۆمەڵگەکەیان لەسەر کێبڕکێ دامەزرابوو، بەردەوام پێشڕەوی لەسەر سامانی دارایی وەستابوو، بۆیە کۆمەڵگەیەکی چینایەتی بوو.

چوارەم: هەروەها مۆرکی بزووتنەوەی ئیسلامی تێدا نەبوون چونکە هێرشی دەبردە سەر ناوچە پیرۆزەکان و تانەدان لە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی، قەرمەتیەکان لە وەرزی حەجدا هێرشیان برد و نزیکەی سی هەزار حاجییان کوشت و بەردەرەشی کەعبەشیان برد تا خەڵك نەچێت بۆ حەج.

پێنجەم: دەقە مێژووییەکان جەخت دەکەنەوە لە پەیوەندی پتەوی نهێنی نێوان بزووتنەوەی قەرمەتی و بزووتنەوەی باتینی ئیسماعیلی با بە رووکەشیش لێك جیاواز بووبن.

شەشەم: کۆمەڵگەی قەرمەتی کۆمەڵگەیەکی چینایەتی بوو کە چینی دەسەڵاتدار و چینی کۆیلەی لەخۆدەگرت، ئەوانەی بە دیل گیرابوون کرابوونە کۆیلەو هیچ مافێکی ئازادی یان یەکسانییان لەگەڵ خەڵکی تردا نەبوو، ئەمەش واتە قوڵپکردنەوەی بارەکە، بۆیە کۆیلەکان دەیانویشت دەستبگرن بەسەر دەسەڵاتداو هاوڵاتیانی ناوچەکەیان کردە کۆیلە.

حەوتەم: بەڵگەنامە مێژووییەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە پەیوەندیەکی ئاشکراو نهێنیش لەنێوان باتینیەکان و خاچپەرستاندا هەبووە.

هەشتەم: حەلاج نموونەیەکی ئەو پەیوەندیەی نێوان باتینیەکان و دوژمنانی دەوڵەتی ئیسلامیە، حەلاج یەکێك بوو لە گەورەترین بانگخوازانی هەڵتەکاندنی دەوڵەتی عەبباسی پەیوەندی هەبوو لەگەڵ قەرمەتیەکاندا، لێوەی

گێردراوەتەوە لە یەکێك لەو فەرموودە قودسیانەی کە دەیوت قسەی خۆیەتی لە ساڵی 292 ی کۆچیدا سوێندی خواردووە، ئەوەش هەمان ساڵ بوو کە شۆڕشی گەورەی قەرمەتی تیایدا روویدا، لویس ماسینیون لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە حەلاج هەموو ئەمانەی تۆمار کردووە.

هەموو ئەمانە ساختەی بانگەشەی ئەوانە نیشان دەدات کە بانگەشەی ئەوە دەکەن بزووتنەوەی قەرمەتی شۆڕشێکی ئیسلام یان بزووتنەوەیەکی چاکسازی بووە، هەروەها هەندێ لە نووسەرانی عەرەب گرنگییان داوە بە حەلاج و وەك بانگخوازی ئازادکردنی مرۆڤ لەدەست ستەم وەسفی دەکەن، لەکاتێکدا راستیەکەی ئەوەیە حەلاج نەیتواتی لە بواری رێبەری ئیسلامیدا تاکە ساتێکیش پێچەسپاو بوەستێت.

سەرچاوەکانی مێژوو وا وەسفی دەکەن کە کەسێك بووە بە بنەڕەت مەجووسی بووە، سەرقاڵی کاری نائاسایی و فرتو فێڵ بووەو بانگەشەی ئەوەی کردووە نهێنیەکان دەزانێت، دواتر گەیشتە ئەوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و دواتریش بانگەشەی خوایەتی بکات، مێرمنداڵانی کۆشکی موقتەدر بیللاهی عەبباسی لەخشتەبرد تا ئامانجەکەی خۆی بەوان بێنێتەدی، ئەمەش بوویە هۆی کوشتنی.

ئیمامولحەرەمەین جوەینی سەبارەت بە حەلاج دەڵێت حەلاج و جینابی سەرکردەی قەرمەتیەکان پەیوەندیەکی نهێنییان لەنێواندا بوو بۆ لەناوبردنی دەوڵەت، هەر ئەمەش هۆکاری راستەقینەی کوشتنی حەلاج بوو، حەلاج لەبەر

وتەکانی نەکوژرا هەرچەندە تەواو لە گومان و بتپەرستیدا ڕۆچووبوو، بەڵکو لەبەرئەوەی کوژرا کە بە بەڵگەوە سەلما پەیوەندی هەبووە لەگەڵ قەرمەتیەکانداو ئەو نوێنەرایەتی قەرمەتیەکانی کردووە، قەرمەتیەکانیش سیستمی ئیسلامییان کەنار خستبوو و خوێن ڕشتن و کاولکاری وڵاتیان گرتبوویە بەر و لە هەجەر پایتەختێکیان بۆ خۆیان دانابوو و حەجەرولئەسوەدیان برد بۆ ئەوێ و ماوەی سیساڵ لەوێ هێشتیانەوە.

دەوترێت بانگەشەکەی حەلاج بۆ حلوول و ئیتیحاد و ئیشراق و وەحدەتولوجود لەپێناو پەرتکردنو شێواندنی بیری ئیسلامیدا بووە، تا ڕێنماییەکانی ئیسلام لەناوبەرێت، بەمەش ڕێخۆشکەری بکات بۆ نەهێشتنی دەسەڵاتی سیاسی ئیسلام، ئەمەش هەمان هەنگاوی باتینیەکان بوو، جا دوژمنانی ئیسلام کاتێك نەیانتوانی دەوڵەت لەناوبەرن، ئینجا پەنایان بردە بەر لێدانی بیروباوەڕی یەکخواپەرستی کە هەموو موسڵمانانی کۆکردبوویەوە، ئینجا بە برێ بیرۆزەی تەصەوفی هیندی و مەجووسی فارسی و فەلسەفەی بتپەرستی یۆنانی ئەو کارەیان دەست پێکرد، سەرەتا گاڵتەیان دەکرد بە شەریعەتی ئیسلامی و ڕێیان دەدا بە بەزاندنی سنوورەکان و ڕەواکردنی حەرامەکان، حەلاج لەو بوارەدا ماوەیەکی زۆری بڕی و دواجار بانگەشەی خوایەتی کرد، تۆمەتبار کرا بە ڕەخنەگرتن لە قورئان و پێی وابوو دەتوانێت مردووەکان زیندوو بکاتەوەو دەیوت جنۆکەکان خزمەتی دەکەن و کاری وەك موعجیزە ئەنجام

دەدات و جۆرێکی نوێی حەجی داهێنابوو کە تەواف کەعبەی نەدەویست، بڕێ نووسینی بە هێمای هەبوو کە تەنها خۆی و نێردراوەکانی لێی تێدەگەیشتن.

دکتۆر قاسم ئاماژە بەوە دەدات بەڵگەی پەیوەندی حەلاج بە قەرمەتیەکانەوە ئەوەیە کە نەیدەهێشت خەڵك بچێت بۆ حەج و لەبری ئەوەی کەعبەیەکی بچووکی لە ماڵی خۆیدا دانابوو تا شوێنکەوتەکانی تەواف بە دەوردا بکەن بەوەش دەبووە بەدیلی چوونیان بۆ کەعبە.

دیاردەیەکی نوێی توێژینەوەکە بریتیە لە وەحدەتولوجود کە سەرچاوەیەکی کۆنی ئایینی هەیەو بڕوای بە یەکخواپەرستی نیەو بڕوای بە فرەیی هەیە تا ئەوەی دەکرێت بوترێت پایەیەکی بنەڕەتی ئەو بیرە فرەییە، کەسانی وەك دکتۆر حوسەین فەوزی و چەندینی تر بە شانازیەوە دەڵێن بڕوایان هەیە بە وەحدەتولوجود.

رێبازی وەحدەتولوجود هێنراوەتە نێو بیری ئیسلامیەوە، ئەگینا لە بنەڕەتدا رێبازێکی کۆنی فەلسەفیە وپەیوەندی هەیە بە بتپەرستی و مەجووسیەت و فەلسەفەی ئیغریقی و هیندی و فارسیەوە، لەکاتێکدا ئیسلام لەبری ئەوانە پەیامی یەکخواپەرستی هێنا، وەحدەتولوجود واتە بەخواکردنی بەدیهێنراوەکان و دانانی هەموو کەون بە خوا، ئەم بانگەشەش لەگەڵ کرۆکی بیروباوەڕی ئیسلامیدا ناگونجێتو بە هیچ جۆرێکیش ناکرێت ئەو بیرە لەگەڵ بیروباوەڕی یەکخواپەرستیدا بگونجێنرێت.

ئیسلام بەرامبەر بیروباوەڕی وەحدەتولوجود پێی وایە بوون دوانە:

واجیبولوجود و مومکینولوجود، واجیبولوجود خوای بەدیهێنەری بوونەوەرە، خوای تاك و تەنهای بێ هاوەڵ، مومکینولوجودیش ئەو بەدیهێنراوانەن کە ئێمە راستەوخۆی بە پێنج هەستەوەرەکانمان هەستیان پێ دەکەین.

هەروەها ئیسلام نکوولّی دەکات لە بیروباوەڕی ئیتیحاد، واتە توانەوەی خوا لەنێو مەخلووقدا، یان نغرۆبوونی مەخلووق لەنێو خالقدا.

ئیسلام هەریەك لەوانە لەیەك جیا دەکاتەوەو رازی نیە لە وەحدەتولوجود چونکە لەگەڵ پەیامی لا اله الا الله دا ناگونجێت.

لێرەوە دەبینین چۆن رۆژهەڵاتناسی کە کەرەستەیەکی دەستی رۆژئاواگەری و موژدەبەریش بووە جەخت دەکاتەوە لەو پرسانە:

یەکەم: پرسی تەصەوفی فەلسەفی و بیرۆکەی وەحدەتولوجود لە بواری بیروباوەڕدا.

دووەم: پرسی شۆڕشەکانی دژ بە ئیسلام کە هەوڵ دەدات وەك شۆڕشی ئیسلامی بیانانسێنێت، وێنەی قەرمەتیەکان و زەنج و چەندینی تر.

هەندێ لەوانەی بەم شێوازە دەنووسن ماوەیەکی زۆرە لەخشتە براون، بەردەوان نەوەکانی شعووبیەت یەکدوای یەك دێن و بانگەشەکەی خۆیان نوێ دەکەنەوە (والله یقول الحق و هو یهدی السبیل).

## ئیسلام چۆن کۆتی ئیغریقی شکاند؟

ئەو بانگەشانەی بەردەوام دەوترێنەوەو پێیان وایە بیری ئیسلامی پەیوەندی هەیە لەگەڵ بیری ئیغریقی یلان هیلیندا، هەمیشە بەرنگاری راستیەك دەبنەوە کە ئەویش هەڵوێستی ئیسلامە بەرامبەر بە ئیغریق و چۆنێتی تێکشکاندنی ئەو کۆتە ئیغریقیەی هەبوو، چۆن بیری ئیسلامی لەدەست شوێنەوار و کاریگەری و زیانەکانی بیری ئیغریقی رزگاری بوو.

رۆژهەڵاتناسانو موژدەبەرە رۆژئاواییەکان بێ وەستانو بێ سوان خەمیان لای ئەو دەروازەیە بوو چۆن هەوڵ بدەن بیری ئیسلامی وەك بەرهەمێکی بیری یۆنانی ئیغریقی وێنا بکەن، یان بیکەنە پاشکۆیەکی تەواوی بیری یۆنانی ئیغریقی، وەك ئەوەی بڵێیت موسڵمانان پێش سەدەی سێیەمی کۆچی هەر لە دابەزینی قورئانەوە تا ئەو کاتە هیچ بیرێکیان نەبوبێتو ماوەی دوو سەد ساڵی تەواو بێ بیر بووبن، بەڵکو لەو ماوەدا بیری ئیسلامی قەوارەو بوونی خۆی وەرگرت، هێشتا ئەوکات بیری یۆنانی لە جیهانی ئیسلامیدا خۆی نەنواندبوو، هەموو پایە کرداریەکانی لێکۆڵینەوە لە سوننەت و دانانی نەح و بنیادی شەریعەت و زمان و نووسینەوەی مێژوو و بوارەکانی زانست و توێژینەوەو بنیادی رێبازی ئیسلامی بۆ مەعریفە کە لە قورئانەوە وەرگیرابوو، هەموو ئەمانە کاتێك روویاندا کە هێشتا موسڵمانان هیچ پەیوەندیەکیان لەگەڵ بیری هیلینیدا نەبوو، بەڵکو پێش ئەو بەیەککەیشتنە پایەکانی بیری ئیسلامی دامەزران، ئینجا

که بیری یۆنانی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، موسڵمانان خوێندیانەوەو لێی رامان و بەرپەرچیان دایەوە.

موسڵمانان که کەوتنە خوێندنەوەی فەرهەنگی یۆنانی، تەنها مەبەستیان زانستە سروشتیەکان و زانستەکانی بیرکاری بوو، ئیتر هیچ پێویستیان نەبوو بەو بیرە لاهووتیەی که بە فەلسەفەی یۆنانی ناویان دەبرد، بەڵکو موسڵمانان زۆر لێی بێباك بوون، بەڵام شەپۆلی وەرگێڕانەکە خێرا لە بنەماکانی خۆی دەرچوو و هەندێ نەستووری پێشڕەوییان گرتەدەست که بارەکەیان گۆڕی بۆ وەرگێڕانی ئەو بوارە ئاڵۆز و مەترسیدارو شێواوە که بیریارانی موسڵمانانی لە دەوری خۆی کۆکردەوە بە دوو ئامانج، یەکەمیان هەوڵی گونجاندنی ئەو بیرە لەگەڵ یەکخواپەرستیدا، ئەمەش هەوڵێکی شکستخواردوو بوو و هەریەك لە کیندی و فارابی و ئیبن سینا پێی هەستان، بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەبوو، کاتێك دەقەکان کەوتنە بەردەست خەڵك، هەمان دەقە راستەقینەکانی بیری یۆنانی نەبوون، هەوڵی دووەمیش هەوڵی وڵامدانەوەیەکی تەواوی بیری یۆنانی بوو لە بواری ئیلاهیاتدا و گەڕانەوە بۆ مەنتیقی بیری ئیسلامی وەرگیراو لە قورئان بوو، ئەویش لە هەوڵەکەی پێشەوای پایەبەرز ئیبن تەیمیەدا خۆی دەنوێنێت.

لەراستیدا دەوترێت نەستووری و سریانەکان زۆر ساختەکار و سەرشێوێن بوونو نیەتی خێریان لە زانست نەبوو، بەلکو ئەو بیرەی یۆنان و ئیغریقەکان که وەرگێڕایە سەر زمانی موسڵمانان، بنەڕەتی دروستی نەبوو، بەڵکو وێنەیەکی ساختەی هەبوو که بیری سریانی و نەستووری وەرگێڕەکانی تێکەڵ کرابووو

ئامانج لێی خزمەکردنی بڕێ چەمكو واتای ئایینی بوو، لێرەوە دەردەکەوێت ئەو هەوڵانە بۆ شێواندنی بیری ئیسلامی و بەدەستخستنی سامانێ بووە نەك لە خۆشەویستی زانستەوە،وێڕای ئەوەی وەرگێڕان بەکارهێنرا بۆ بانگەوازکردن بۆ ڕێچکەکانی خۆیان و سەرخستنی مەزهەبەکانیان.

مەترسیەکە لێرەوە دەرکەوت: هەندێ کتێب کە هی ئەرستۆ یان ئەفلاتوون نەبوون درانەوە پاڵ ئەرستۆ و ئەفلاتوون، لێرەوە نارەوایی هەوڵەکەی کەسانی وەك فارابی دەرکەوت کە هەوڵیان دەدا بیرێ پێشکەش بکەن کە لە بنەڕەتدا هی خاوەنەکەی نیە، جا ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە نەستووری و یەعقووبیەکان دەستکاری دەقەکانی بەردەستیان دەکرد و بەپێی بەرژەوەدی دینەکەیان دەستکارییان دەکرد، یان هەندێکی تریان کەمو زیادیان لە دەقەکاندا پەیڕەو دەکرد و بەپێی ئارەزووی و بەپێی گونجان لەگەڵ مەزهەبەکەیان وەرگێڕانەکەیان دەستکاری دەکرد، ئەوکات دەزانین بەهای ئەو فەرهەنگە کۆنە چەندێ بووە.

ئەرستۆ لە لووتکەی ئەو فەرهەنگەدا بوو و گرنگیەکی بێشوماری پێ درا، ئەو گرنگیەی کە هیلینیە نوێکان لە سەردەمی نوێدا نوێیان کردەوە.

قسەیەك هەیە وەك شتێکی یەکلاکراوەی لێهاتووە کە دەڵێت مەنتیقی ئەرستۆ لووتکەی دەستکەوتی موسڵمانانە لە یۆنان، بەلام ڕاستیەکەی وا نیە، چونکە مەنتیقی ئەرستۆ لە کۆمەڵگەی یۆنانیەوە وەرگیراوە کە تەواو جیایە لە

کۆمەڵگەی ئیسلامی، بۆیە مەنتیقەکەی ئەرستۆ بۆ کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی نەگونجاوەو پەیڕەو ناکرێت.

مەنتیقی ئەرستۆ دەربڕینێکی وردی کۆمەڵگەی کۆیلایەی یۆنانیە کە دابەش بووبوو بۆ چینی خانەدان و کۆیلەکان، خانەدانەکان وێنەیەك بوون و رادەمانو کۆیلەکانیش کەرەستە بوونو کاریان دەکرد، بەڵام کۆمەڵگەی ئیسلامی تەواو جیاواز بوو لەو کۆمەڵگەیە، تیایدا برایەت و یەسکانی هەبوو، هەر لە رامان لە زەوی و ئاسمانەکانو کارکردن و ئەزموون و تاقیکردنەوەوە تا دواخاڵ دەرۆیشت، لێرەوە بەرنامەی کۆمەڵگەی ئیسلامی زۆر جیایە لە کۆمەڵگەی یۆنانی، ئەمەش لە چەند روویەکەوە، گرنگترینیان یەکخواپەرستی و نەهێشتنی کۆیلایەتی و پەیڕەوی بواری زانست، بەمەش ئەوپەڕی جیاوازی روون و قووڵی نێوان دوو کۆمەڵگەو دوو بیری جیاواز دەردەکەوێت.

بیری ئەرستۆیی پێی وایە زانست گشتیەو زانستی لاوەکی زانست نیە، بەڵام بیری ئیسلام جیا لەو دیدە ئەو بنەماریەی تێکشکاند و بواری ئەزموونی لە بەشە لاوەکیەکاندا گرتەبەر، بەمەش بیریارانی موسڵمان لە چەمكو واتای سنور و پێناسەی ئەرستۆیی دەرچوون و پیاوانی فیقهو ئوصول توانییان دیدێکی نوێی تەعریف دابنێن کە لەسەر بنەمای واقیع دامەزراوە، ئەمەش دەرچوون بوو لە سنوری پێوەرسی ئەرستۆیی لەپێناو گەیشتن بە ئەنجامی زانستی، مۆرکی بیری زانستی ئیسلامی مۆرکێکی ئەزموونیە، بیریارە موسڵمانەکات رەخنەیان گرت لە پێوەری ئەرستۆ، ئیبن خەلدوون لە بارەیەوە دەڵێت ئەو پێوەرە

پێوەرێکی ئەندێشەییە، بەڵام موسڵمانان زیاتر لە یۆنان زانیارییان وەرگرت و هەنگاوێکی گەورەیان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نا کە ئەویش بنیادی بنەرەت و بنەمای خودی زانستی نوێ یە، ئەویش یەکخستنی رامان و پەیڕەوی کردارییە، موسڵمانان گرنگیەکی زۆریان دا بە پەیوەندی باڵای نێوان شتەکان و ئەو پەیوەندیەش لەسەر بنەمای ئەزموون خرایەڕوو، لەسەر ئەم بنەما باڵایەش (گەڕان بەدوای عیللەتدا) بیروونی و رازی و جابری کوڕی حەییان و ئیبن سینا ئەزموونی زانستی خۆیان گرتەبەر، لەهەمان کاتدا رێبازی زانستی لە بیردا دامەزرا، ئیبن خەلدوون راڤەی جووڵەی مێژوو و گۆڕانی پەیوەندیە مرۆییەکان دەکات.

بەم یەدەد پێشکەوتووە بۆ بوون و مرۆڤ، بیری ئیسلامی تەواو جیاواز بوو لەو بیرە یۆنانیەی کە وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی و لە بەشە جیاجیاکانی رۆشنبیری بواری زانست و ئوصول و فیقهو فەلسەفەی عەقڵی و روانین بۆ مرۆڤدا لێك جیاواز بوون، ئەو جیاوازیەش کاتی و کتوپڕ نەبوو، بەڵکو ئەنجامێکی سورشتی جیاوازی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەوڵەتی ئیسلامی و ژیاری یۆنانی بوو.

بەمەش بیری ئیسلامی لە کرۆکەوە وەك بیرێکی ئیسلامی دەرکەوت و مەنتیقی ئەرستۆی تێپەڕاند و ئەزموونی زانستی درێژە پێدا و رامانی نەزەری و پەیڕەوی کرداری پێکەوە بەکارهێنا، بەمەش لە بازنەی فەلسەفەی ئەرستۆیی و

ئەفلاتوونی چوویە دەرەوەو عەقڵی ئەزموونی و ڕێبازی زانستی ڕەسەنی بەدەستەوە بوو.

زۆرێك لە توێژەران کاریگەری ڕێبازی ئەرستۆییان وێنا کردووە، دکتۆر قاسم وا وەسفی دەکات کە ڕێبازێکی دوابڕاوەو زۆرێك لە بیریارانی عەرەبی گومڕا کردووەو دواتر لە ئاست گەشەی ژیاری عەرەبیدا دەستەوسان وەستاوە، دوابڕاویەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زۆر گرنگی بە مەسەلە گشتیەکان دەدات جیا لە توێژینەوە لە وردەکاری شتەکان، بۆ ڕاشتی ئەم قسەشمان مێژووی ڕێنیسانسی ئەورووپی وەردەگرین کە پاش ماوەیەکی زۆر ئینجا لەو چەقبەستوویيە ڕزگاری بوو کە ڕێبازی یۆنانی تووشی کردبوو، ئەمەش دوای ئەوەی ڕێبازی ئیسلامییان وەرگرت لە بواری زانست و فەلسەفەدا، دەکرێت بە خودی ڕینان بەڵگە بهێنینەوە، ئەو ڕۆجەر بیکۆن بە ئەمیری ڕاستەقینەی بیری ئەورووپی لە سەدەی سیانزە ناو دەبات، دەبێت ئەوەش بزانیت چۆن ئەو ئەمیرایەتیەی وەرگرتووە، دەشکرێت ئەو نهێنیە ئاشکرا بکەین، ئەویش ئەوەیە بیکۆن یەکەم کەس بوو لە ئەورووپا بانگەوازی کرد بۆ هێرش کردن سەر ڕێبازی ئەرستۆتالیسی و داوای دەکرد ڕێبازی موسڵمانان بگیرێتەبەر، ئەو ڕەخنەی لە هاوسەردەمیەکانی خۆی دەگرت کە بۆچی وا بیرکاری نەفرەتباران دەکەن، لەکاتێکدا دەکرێت بە بیرکاری بەڵگە بهێنیتەوە بۆ هەرشتێکی پێویست بۆ تێگەیشتن لە سروشت، ئەگەر بیرکاری نەبوایە شتەکانی ئەم جیهانەمان بە دروستی نەدەناسی، بۆیە لە مەسەلە دنیایی و دینیەکانیشدا بیرکاری سوودی

هەیە بۆمان، هەروەها رەخنەی دەگرت لەوەی بۆچی تێبینی و ئەزموون بەکارناهێنن لەکاتێکدا نهێنیەکانی سروشت تەنها بە توێژینەوەی لە مەسەلە لاوەکی و وردەکاریەکان ئاشکرا دەبن تا بمانگەیەنێتە یاسا گشتیەکان.

بەوجۆرە رێبازی ئیسلامی زاڵبوو بەسەر رێبازی ئەرستۆییدا و پاش ئەوەی لە بواری هزری ئیسلامیدا تێکیشکاندبوو، دواجار هەر لە بوارەکەی خۆیشیدا تێکیشکاند.

وێڕای ئەمەش نەگونجانێکی زۆر هەیە لەنێوان ئیسلام و فەلسەفەی یۆنانیدا، بیری یۆنانی ئەزموون و تاقیکردنەوەی بە کەم دەگرت، لەکاتێکدا مەنتیقی ئەرستۆ گەورەترین دەربڕی رۆحی یۆنان بوو، بەڵام موسڵمانان سەرقاڵی ئەو کرۆك و ماهیەتە نەبوون کە فەلسەفەی یۆنانی خۆی پێوە سەرقاڵ کردبوو، بەڵکو خۆیان سەرقاڵ کرد بە تایبەتیەکانەوەو لە بەرنامەیەکی وردا ئەوەشیان ریزبەند کردبوو، جا هەندێ پاشکۆی هزری رۆژئاوایی هەن کە دەڵێن ئیغریقەکان یەکەم کەس بوون بیرکردنەوەی زانستییان داهێنا، ئەم قسەیە زۆر نازانستیە.

ئیسلام بوو رەوتی هزری رووەو مەسەلە تایبەتیەکان و ئەزموون و تاقیکردنەوە برد، دەربڕینەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەم بوارەوە زۆر ماوەفراوانە کاتێك دەفەرموێت (بیر بکەنەوە لە بەدیهێنراوەکانی خوا، بەڵام بیر مەکەنەوە لە زاتی خوا، ئەگەرنا بە هیلاکەتا دەچن).

وێڕای ئەمەش ئیسلام نەیهێشت فەلسەفەی یۆنانی لەناوبچێت، چونکە کاتێك نەصرانیەت چوویە یۆنان، ترسی دینەکەی لێ نیشت، بۆیە ڕێگری کرد لە خوێندنی فەلسەفەو کتێبەکانی فەلسەفەشی خستە ژێرخانەکانەوە تا دواتر موسڵمانان ئەو کتێبخانەیان هێنایەوە سەرزەوی.

موسڵمانان هەڵەکانی گالینۆسیان لە بواری پزیشکی یۆنانیدا ڕاست کردەوە، هەڵەکانی پەتلیمۆس و ئەبۆقرات و ئەقلیدۆسیان لە بیرکاریدا ڕاست کردەوە، بەرنگاری هەڵەکانی ئەرستۆ بوونەوە بواری مەنتیقدا، وێڕای کاریگەری ئیغریق لە بەرهەمی فەلسەفیدا، بەڵام نەیتوانی هیچ گۆڕانێك لە پەیامی ئیسلام بۆ مرۆڤ ئەنجان بدات، موسڵمانان مەسەلەی ئولوهیەتیان لە ئەرستۆوە وەرنەگت، هەریەك لە کیندی و فارابی و ئیبن سیناش لە بواری فەلسەفەدا تەنها درێژەپێدەری ڕۆحی هیلینی بوون لە جیهانی ئیسلامیدا، هەرچەندە هەوڵێکی زۆریان بە خەرج داوە تا چەمکی یەکخواپەرستی و پاکراگرتن و پێغەمبەرایەتی بچەسپێنن.

توێژەران پێیان وایە فەلسەفەی ئیسلامی زادەی ژینگەی ئیسلامیە، دوای هاتنی زانستەکانی قورئان و فەرموودە ئیتر زانستێکی ڕەسەنی ئیسلامی دەرکەوت کە ئەویش زانستی ئولولی فیقهەو پێشەوا شافیعی داینا، ئەو پێشەوایەی یەکەم نەیاری ڕەوتی هیلینی بوو، یەکەم کەس بوو زەنگی مەترسی لێدا و وتی خەڵکی لەبەر نەشارەزابوونیان لە زمانی عەرەبی و هەوادارییان بۆ زمانی ئەرستۆتالیسی تووشی نەزانی و ئەو پەرتەوازەییە بوون.

پێشەوا شافیعی بۆ یەکەم جار سەرەباسەکانی ئوصولی دارشت وەك زانستێکی رێکخەری بەشەکان کە بەرنامەیەکی گشتی هەبێت و تێگەیشتن لە رێی هەڵێنجانی زانستەکان دیاری بکات.

شێخ موستەفا عەبدورەزاق کە خاوەنی ئەو بیری رەسەنایەتی فەلسەفەی ئیسلامیەیە دەڵێت ئەم ئاراستەی شافیعی ئاراستەیەکی عەقڵی زانستی بوو کە گرنگی نەدەدا بە لق و پۆپەکان، بەڵکو گرنگی دەدا بە رێکخستنی بەڵگە وردەکاریەکان تا بە چەند بنەمایەك کۆبکرێنەوە، هەموو ئەمەش هۆکار بوو تا شافیعی لە جیهانی ئیسلامی و بواری توێژینەوەی ئیسلامیدا وەك ئەرستۆ لە جیهانی هیلینی و توێژینەوە یۆنانیەکان تەماشا بکرێت.

شافیعی چاك شارەزای یۆنانی بوو و هێرشێکی توندی دەکردە سەر رێبازی ئەرستۆیی، نەك تەنها لایەنە سلبیەکانی ببینێت، بەڵکو لایەنی ئیجابیشی لەبەرچاو گرتبوو، شافیعی لە بواری ئوصولدا رێبازێکی دانا کە بوویە بنەرەتێ بۆ رێبازی ئەزموونی، ئەو رێبازەی تایبەتمەندی ژیارو رۆشنبیری ئیسلامیەو ئەگەر ئەوە نەبوایە زانست لە جیهانی ئیسلامیدا دادەکەوت و رێنیسانسی زانستی نوێی ئەورووپاش دوا دەکەوت.

بە دەربرینی دکتۆر نەشار رێبازی زانستی و ئەزموونی دەربڕی سروشتی ئیسلامە، بەڵکو ئیسلام گونجاندنی بواری نەزەری و کرداریە، عەرەبەکان ئەمەیان گەیاندە جیهانی ئەورووپی، بۆیە موسڵمانان سەرچاوەی ئەو ژیارەن کە لەسەر رێبازی ئەزموونی دامەزرا.

پێشەوا ئیبن تەیمیە هات و ئەو هێڵە روونە بەهێزەی درێژەپێدا، رێیەك كە بەردەوان بیریارانی موسڵمان بێ وەستان كاریان بۆ دەكرد لەپێناو رزگاركردنی بیری مرۆیی لە هەژموونی فەلسەفەی یۆنانی، موسڵمانان كاریان ئەوەبوو رێیان نەدەدا كەسێتی و ژیاری ئیسلامی لەنێو كەسێتیو ژیارێكی دیكەدا بتوێتەوە یان لێكهەڵوەشێت، بەوجۆرە موسڵمانان بەرامبەر بە هێزە شاڵاوهێنەكان وەستانەوە.

ئیبن تەیمیە لە كتێبەكەیدا (الرد علی المنطقیین) لەو بوارەدا گەیشتووەتە لووتكە، لە وەڵامدانەوەی مەنتیقگەرا یۆنانیەكاندا یبن تەیمیە بە گەورەترین نوێنەری رۆحیەتی ئیسلامی دادەنرێت بەرامبەر هیلینیەت و رەخنەی توند دەگرێت لە مەنتیقی ئەرستۆتالیسی، بەوەشەوە ناوەستێت، بەڵكو مەنتیقێكی بۆ ئیسلام خستووەتەروو كە تایبەتمەندیە عەقڵیەكانی لەخۆگرتووەو خاوەن مۆركی ژیاری خۆیەتی.

توێژەران ئیبن تەیمیە بە رێبەری گەورەی هەموو ئاراستە نوێ و رۆژئاواییەكان دادەنێن لە رەخنەگرتن لە مەنتیقی ئەرستۆ، هەر لە ئەرجانوون فرنسیس باكون تا مەنتیقیەتی وەزعی، ئیبن تەیمیە هەر لە سەرەتاوە رێبازی زانستی و ئەزموونی موسڵمانانی گرتەبەر تا گەیشتە لووتكە، دواتر برێ بواری تری بۆ ئەو رێبازە ئیسلامیە زیاد كرد كە ئەوانەشی لە كرۆكی قورئان و سوننەتەوە وەرگرتبوو، دوابڕاوی كاری گونجاندنەكەی فارابی و ئیبن سینای خستووەتەڕوو و پیچ وابوو ئامانج لەوە لەناوبردنی ئیسلامە لەناوخۆوە، هێرش

دەکاتە سەر موتەکەلمەکان و تۆمەتباریان دەکات بە لادان لە قورئان و سوننەت، لاوازی بەڵگەی ئەوان بەرامبەر بە نەیاران و بیدعەکاران دەخاتەڕوو.

دواجار دەگاتە ئەنجامێکی روون کە ئەویش ئەوەیە ناکرێت صەریحی عەقڵ لەگەڵ صەحیحی نەقڵ (قورئان و سوننەت) نەیار بێت، راکەی رازی و غەزالی بەرپەرچ دەداتەوە سەبارەت بە پێشخستنی عەقڵ بەسەر نەقڵدا ئەگرە هاتو لە مەسەلەیەکدا پێکەوە نەگونجان، چونکە پێی وایە ئەوە دەرچوونە لە بنەرەتێکی ئیسلام، بڕوای وایە ئەرکی عەقڵ راڤەو دەربڕینی سرووشە.

راستیەك هەیە ناکرێت لەبەرچاو ون بێت، ئەویش ئەوەیە فەلسەفەی یۆنانی توانی زاڵ بێت بەسەر مەسحییەت و جوولەکایەتیدا، بەڵام نەیتوانی بەرامبەر بە ئیسلامیش ئەوە بکات، رێبازی یۆنانی پێچەوانەی رێبازی موسڵمانانە، یۆنانیەکان تەنها کاریان رامان بووە، بەڵام موسڵمانان چوونەتە بواری ئەزموونیشەوە، قورئان رێنموونی کردن رووەو بنیادی رێبازی زانستی ئەزموونی.

نەیارانمان چەمکی فەلسەفە وەك مەشخەڵێکی ئازادی ناو دەبەن، بەڵام لەراستیدا ئامانجەکەی ئەوان هەڵتەکاندنی چەمكو واتای روونی ئیسلامە تایبەت بە فیترەو یەکخواپەرستی، پەیامێ کە هیچ پێویستی نیە بە چەکی فەلسەفە، مەگەر بەو چەشنەی پێشەوا ئیبن تەیمیە لێی تێگەیشتووە.

## ئەو فەلسەفەی بە زمانی عەرەبی نووسرایەوە

ئەرنست رینان لەو کتێبانەیدا کە هێشتا لە زانکۆ عەرەبیەکاندا دەخوێنرێن جەخت لەوە دەکاتەوە فەلەفەی عەرەبی نووسراوی فەلسەفەی یۆنانیە بە پیتی عەرەبی، هەرکە یەکە توێژەری رۆژهەلاتناس لە زانکۆی میصری کۆن هات تا لە بواری فەلسەفە بکۆلێتەوە (کۆنت دی گلارز) ئەوەی بە خوێندکارە موسلمانەکانی وت کە فەلسەفەیەکی عەرەبی بوونی نیەو ئەوەی دەدرێتەوە پاڵ کیندی و فارابی و ئیبن سینا و ئیبن روشد، هەمووی فەلسەفەیەکی یۆنانیەو بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوە.

ئەم قسەیە زۆر کەسی بێزار کردو کەوتنە وەلامدانەوەو دەیانوت نەخێر فەلسەفەیەکی عەرەبی هەیەو رۆڵی کیندی و فارابی و ئیبن سینا و ئیبن روشد تەنها وەرگێڕان نەبوو، بەڵکو رۆڵی بنیادیان بینیوە.

ئەحمەد لوتفی سەید کە کتێبی زانستی ئەخلاقی ئەرستۆتالیسی وەرگێڕاوە –لەکاتێکدا وەرگێڕانەکە هی بارتلی سنهیلەر بوو– لە پێشەکیەکەیدا دەڵێت:

هەرچەندە وەرگێڕانی کتێبەکانی فەلسەفە تەنها کتێبەکانی ئەرستۆی نەگرتەوە، بەلام فەلسەفەی ئەرستۆ زاڵ بوو بەسەر فەلسەفەی عەرەبیدا و مۆرکی خۆی بەسەردا سەپاند، لەراستیدا فەلسەفەی عەرەبی تەنها فەلسەفەکەی ئەرستۆتالیس بوو کە مۆرکی عەرەبی وەرگرت و ناوی فەلیەفەی عەرەبی لێنرا و پەیوەندی ریشەیی نێوان دوو فەلسەفەکە بە چاکی مایەوە تا ئاستێ زانکۆ ئەورووپیەکان لە سەدەکانی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستد

فەلسەفەی عەرەبییان دەخوێند و وەك فەلسەفەی مەشائی واتە فەلسەفەی ئەرستۆ تەماشایان دەكرد.

دكتۆر صەرووف سەبارەت بەم وتەی لوتفی سەید دەڵێت نووسەرە ئەورووپیەكانیش كە توێژینەوەیان لە فەلسەفەی عەرەبی كردووە پاڵپشتی ئەم بۆچوونە دەكەن، بەڵگەش بۆ ئەوە بە قسەكەی ئەلەكسیس ولیەم ولسن دێنێتەوە كە پێی وایە ئەوەی پێی دەوترێت فەلسەفەی عەرەبی تەنها ناوو زمانەو هیچی تر، بەڵكو بیرێكی یۆنانی ڕێكخراوە كە بە زمانێكی باڵا دەربڕاوەو كاریگەری ڕۆژهەڵاتی بەسەردا سەپاوە.

هەروەها دەڵێت فەلسەفەی مامۆستای یەكەم هەمیشەییەو سنووری ناوچەیی و كاتی بۆ نیە، بەڵكو هەموو شارستانیەتیێ لەسەر ئەو بنەمایە بنیاد نراوە، تەنانەت ئەم شارستانیەتە نوێیەی ئێمە

ئەم ئاراستەیە لە ساڵی 1925 دا بوو كە لە هەمان ساڵدا زانكۆی ئەهلی گۆڕا بۆ زانكۆی ڕەسمی و لوتفی سەید هێنرا، خوێندكارو شوێنكەوتەكانی بە مامۆستای پایەدار و سەرۆكی زانكۆ ناوی دەبەن، تەها حوسەین و چەندێكی تر هاتن كە بانگەوازیان دەكرد بۆ فەلسەفەی یۆنانی و ئەرستۆ.

جا ئایا لوتفی سەید مامۆستایەكی پایەبەرز و ڕاستگۆیە لەو قسانەی سەبارەت بە ئەرستۆ دەیلێت و دەیكاتە سەرچاوەی ڕێنیسانسێكی نوێ، نووسینەكانی تەها حوسەین و چەندێكی تر هەمان ڕێی گرتەبەر یان جۆرێ لە فێڵ و گومانی تێدایە!

ئایا ئەرستۆ سەرچاوەی ژیاری رۆژئاوایی بوو لە سەردەمی رێنیسانس و دواتردا، یان یەکەم کاری رێنیسانس بریتی بوو لە هەڵوەشاندنەوەی ئەرستۆ و هێرش بردنە سەر رێبازەکەی و دانانی رێبازەکەی بە هۆکارێکی چەقبەستوویی رۆژئاواو چەند سەدە رۆژئاوای کۆت کردبوو تا رێبازی ئەزموونی ئیسلامی هات و وزەو تواناکانی رەها کرد؟ رێ بەڵکو زانایانی ئیسلام کە قورئانیان کردبوو بە سەرچاوە بۆ بنیادی رێبازی زانستی ئەزموونی بۆ دانانی بەردی بناغەی ژیار و زانست، هەریەك لە درابەر و بریفۆلت و گۆستاف لۆبۆن لە کۆن و سارتەر و هۆنکە و چەندینی تر لە سەردەمی نوێدا ئەو شایەتیە دەدەن بۆ موسڵمانان. کۆتا کتێب لەو بارەوە بریتیە لە کتێبەکانی (شمس الله تشرق علی الغرب) و (أوروبا ولدت في آسیا).

بۆیە لوتفی سەید راستگۆ نەبووەو راگری ئەەبی عەرەبیش تەها حوسەین سپاردەکار نەبووە لە وەرگێرانی ئەو پەیامەدا، بەڵکو موسڵمانان سەرەتا رەخنەیان گرت لە ئەرستۆ و دواتریش رۆژئاواییەکان لە سایەی زانیاری موسڵمانەکانەوە رەخنەیان گرت لە ئەرستۆ و نەوینە رێبازی ئەزموونی موسڵمانان کە ئەوانی گەیاندە ئەم پێشکەوتنە تەکنەلۆجیەی ئەمرۆ.

ئەی ئیتر ئەو نەگونجانە چیە؟ رۆژهەلاتناسان و داگیرکەران ئەم پرسیارە دەکەن وەك دکتۆر مەحموود قاسم دەڵێت ئەوان موسڵمانانیان برد بۆ لای ئەرستۆ و خۆیشیان بەرەو رێبازی موسڵمانان چوون (جابیر و ئیبنولهەیسەم و بیروونی).

ئەرستۆ جارێکی تر موسڵمانان دەخاتەوە نێو بازنەیەکی داخراوی رامان و بێبەشیان دەکات لە بەرهەمی رێبازی ئەزموونی کە خۆیان دایانمەزراند و رۆژئاواش گەشەی پێدا.

بەوجۆرە دەبینین ئەم دەروازەیە لەسەر دەستی تەها حوسەین و دەستەیەك لە شوێنکەوتوانی رووەو فراوانی چوو تا ئەوەی بڕیاری ئەوە دەدەن عەرەبەکان لە کۆندا ملکەچی رێبازی یۆنان و ئەرستۆ بوون و لەبەرئەوەی بیری رۆژئاوایی نوێ بەرهەمی بیری یۆنانیە، بۆیە پاشکۆیی موسڵمانان بۆ ئەو بیرە شتێکی نوێی و نامۆ نیە، چونکە ئەوان شوێنکەوتەی یۆنان بون، بۆیە جێی نامۆ نیە ئەمڕۆش شوێن نەوەکانی یۆنان بکەون، جا مامۆستای ئەو توێژە راستگۆ نەبووەو تەها حوسەین لەوەدا راستی نەکردووە، چونکە موسڵمانان رێبازی ئەرستۆیان وەرنەگرت و بەهیچ جۆرێ بیری یۆنانییان لەخۆنەگرت، بەڵکو پێچەوانەکەی راستە، ئەوان بەرنگاری بوونەوەو رەخنەیان لێگرت و جیاوازی قووڵی نێوان بیری یۆنانی و مەنتیقی قورئانییان خستەڕوو، چەندسن کەس بەرنگاری ئەو مەنتیقەی یۆنان و ئەرستۆ بوونەوە، دیارترینیان بریتی بوون لە غەزالی و ئیبن تەیمیە.

ئەگەرچی قسەی زۆر دەکرا لەسەر ئەوەی ئایا نووسینەکانی فارابی و ئیبن سینا فەلسەفەیەکی ئیسلامین یان پاشکۆ مەشائیەکانی یۆنانیەکانە، پیاوێکی بەڕێز بوو بە سەرۆك بەشی فەلسەفە لە کۆلێژی ئاداب کە ئەویش شێخ موستەفا عەبدوڕەزاق بوو، ئەم پیاوە بە شێوەیەکی دروست مەسەلەکەی یەکلا

کردەوە، ئەمەش لە روانگەی توێژینەوەکانی زانکۆکەوە، هەرچەندە تەها حویەن راگری کۆلێژی ئاداب بوو، شێخ موستەفا وتی فەلسەفەی ئیسلامی لە کتێبی موتەکەلیم و فیقهناسەکانەوە وەردەگیرێت و پێشەوا شافیعی بنەمای ئوصولی فیقهی داناوە، بۆیە ئەو یەکەم فەیلەسووفی ناو ئیسلامەو پایەی لەناو زمانی عەرەبیدا وەك پایەی ئەرستۆ وایە لەناو زمانی یۆنانیدا.

بەمەش قوتابخانەی رەسەنایەی لە بواری فەلسەفەدا سەریهەڵدا و ماوەیەکی زۆر رێی بڕی و فراوان بوو، لە شوێنکەوتەکانی بریتی بوون لە مەحموود خوزەیری و دواتر موحەممەد عەبدولهادی و عەلی سامی نەشار.

قوتابخانەی رەسەنایی ئیسلامی لە فەلسەفەدا ئەوەی سەلماند کە منەتیقی ئەرستۆتالیسی رێبازی ژیار و بیری یۆنانیەو لە قوتابخانە عەقڵیەکاندا قبووڵ نەکراوەو رێبازی ئەزموونیی ئیسلامیش دوای چەند سەدە گەیشتە ئەورووپا و بوو بە سەرچاوەی ژیاری نوێی ئەورووپی هەرچەندە زۆر جیاواز بوو لە ژیاری یۆنانی، دۆزینەوەی بوونی ئەو رێبازە لای موسڵمانان راڤەی رۆحیەتی ژیاری ئیسلام دەکات، ژیاری ئیسلامی ژیارێکی کرداری ئەزموونییە کە لە سایەی دیدێکی زیندووی هەستپێکراوەوە مرۆڤ رووەو بەدیهێنانی کرداری مرۆیی دەبات.

هەروەها چەندین توێژینەوە شێواوی و مەترسی ئەو سەرچاوانەمان بۆ دەخەنە روو کە فارابی پشتی پێ بەشتون، دکتۆر موحەممەد عەبدورەحمان مەرحەبا دان بەوەدا دەنێت و دەڵێت ئەو بیرەی یۆنان و ئیغریق گوازرایەوە بۆ

موسڵمانان، بنەڕەتی دروستی نەبوو، بەڵکو وێنەیەکی ساختە بوو کە چەمك‌و واتای سریانی و نەستووریە وەرگێڕەکانی تێکەڵ کرابوو و مەبەست بەوەش خزمەتکردنی چەمك‌و واتای ئایینی خۆیان بوو، لێرەوە ئەو بیرە نەیتوانی شتێکی بەسوود بە بیری ئیسلامی ببەخشێت.

لەلایەکی ترەوە دەرکەوت بەرنگاربوونەوەی فەلسەفەی یۆنانی و بەتایبەت ڕێبازی ئەرستۆ هەر لەگەڵ وەرگێڕانیاندا دەستی پێکردووە، چونکە بیری ئیسلامی پێش ئەو وەرگێڕانە لەسەر بنەمای بەها قورئانیەکانی یەکخواپەرستی و ئەخلاق و پەیوەندی نێوان سروش و عەقڵ دارێژرابوو، بۆیە سەخت بوو بیری ئیسلامی تێکەڵ بە فەلسەفەی یۆنانی بکرێت، بەتایبەت کە فەلسەفەی یۆنانی فەلسەفەی کۆمەڵگەیەکی بتپەرستی بوو کەلەسەر بنەمای کۆیلایەتی و بەرزراگرتنی عەقڵ‌و جەستەپەرستی دامەزرابوو، وێڕای ئاگادار بوون لە خراپی و دەستکاریکردنی وەرگێڕانەکان، هەرچەندە دەستەیە لە فەیلەسووفەکان کە پێیان دەوترا مەشائیە موسڵمانەکان هەوڵێکی زۆریان بەخەرج دا تا فەلسەفەی یۆنانی بخەنە نێو چوارچێوەی ئیسلامەوە، بەلام هەوڵەکەیان تەواو شکستی هێنا، غەزالی زۆر بەهێز بەرنگاری فەلسەفەی ئیلاهی یۆنانی بوویەوەو تیرەکەی ئاراستەی بەرامبەر کردەوە، چونکە فەلسەفەی یۆنانی لەگەڵ یەکخواپەرستیدا نەدەگونجا، ئەوەشی خستەڕوو قسەکردن لە مەسەلە سروشتیەکاندا بەڵگەییە، بەلاّم لە مەسەلەی ئیلاهیاتدا مەزندەییە.

له فه‌لسه‌فه‌ی ئیلاهیاتدا غه‌زالی به‌رامبه‌ر سێ مه‌سه‌له‌ی گه‌وره وه‌رستایه‌وه که فه‌لسه‌فه‌ی یۆنانی دانی پێدا ده‌نا و ته‌واو جیاواز بوو له چه‌مك‌و واتای ئیسلام، ئه‌ویش دێرینه‌بوونی جیهان و ئاگادارنه‌بوونی خوا به ورده‌کاریه‌کان و نکوولّی کردن له زیندووبوونه‌وه.

غه‌زالی هێرش ده‌کاته سه‌ر ئه‌و فه‌یله‌سووفانه‌ی که نکوولّی له بوونی خوا ده‌که‌ن و پێیان وایه جیهان هه‌ر له دێرینه‌وه هه‌بووه، ئه‌مه‌ش په‌یام‌و روانینی ده‌هریه‌و زندیقه‌کانه، ئه‌وانه‌ش که ده‌یانوت نه‌فس ده‌مرێت و زیندوو نابێته‌وه، ئه‌وانه‌ش که نکوولّییان ده‌کرد له رۆژی دوایی.

هه‌روه‌ها غه‌زالی رووبه‌کی تری مه‌سیداری ئیبن سینا و فارابی ده‌خاته‌روو که بوونی په‌یوه‌ندییانه به بانگه‌وازه رووخێنه‌ره‌کانی باتینیه‌ت و ئیخوانوصه‌فاو هاوشێوه‌کانیانه‌وه، ئه‌وانه‌ی په‌یوه‌ندییان هه‌بوو به دوژمنانی ده‌وڵه‌تی ئیسلامیه‌وه وێنه‌ی قه‌رمه‌تیه‌کان و چه‌ندی تر.

دوای ئه‌وه ئیبن ته‌یمیه هات و له کتێبه‌که‌یدا (وه‌لآمدانه‌وه‌ی مه‌نتیقگه‌راکان) ئه‌وه‌ی خستووه‌ته‌روو که بیری ئیسلامی مه‌نتیقێکی تایبه‌تی خۆی هه‌یه که له قورئان‌و سوننه‌ته‌وه وه‌رگیراوه، له قورئان‌و سوننه‌ته‌وه مه‌نتیقی ئیسلامی هه‌لّێنجا، ئه‌و پێی وایه ئه‌و مه‌نتیقه موسڵمانان بێباك ده‌كات له عه‌قلّیه‌تی یۆنانی سه‌باره‌ت به بڕیاردان له‌سه‌ر مه‌سه‌له‌کان و رامانی فه‌لسه‌فی، وه‌لآمی ته‌واوی مه‌نتیقگه‌راکان ده‌داته‌وه، ئه‌وانه‌ی که مۆرك و شوێنه‌واری بیری یۆنانی عه‌قڵی داگرتبوون و که‌ناری خستبوون له فه‌لسه‌فه‌و

مەنتیقی قورئان و سوننەت، لە وتەیەکیدا دەڵێت: ئەو بەڵگە عەقڵیانەی کە پێشەوایانی دیاری ئەهلی کەلام و فەلسەفە دەیانخەنەروو، لە قورئاندا زۆر کامڵتر و جوانتر و دوور لە هەر هەڵەیەك کە ئەو کەسانەی تێکەوتووە حەق و راستیەکەی هاتووە.

دکتۆر نەشار دەڵێت ئیبن تەیمیە رابەری هەموو ئاراستە نوێکانە لە رەخنەگرتن لە مەنتیقی ئەرستۆدا، هەر لە ئەرجانوون فرنسیس بیکۆنەوە تا مەنتیقیەتی وەزعی، گرنگی داوە بە رەخنەگرتن لە فەیلەسووفانی ئیسلام وەك فارابی و ئیبن سینا و ئیبن روشد و هەموو هاوشێوەکانیان کە هەوادارن بە مەنتیقی ئەرستۆ، ئاماژەش دەدات بە بێسوودی هەوڵەکانیان و دوابڕاوی گونجاندنی نێوان ئیسلام و ئەفلاتوونی نوێ (فارابی و ئیبن سینا)، پێی وایە ئامانج لەوە لەناوبردنی ئیسلامە لەنێوخۆوە.

یەکێك لە کتێبەکانی ئەو بوارە بریتیە لە کتێبی (ترجیح أساليب القران على أساليب اليونان) بە پێنووسی موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم وەزیر حەسەنی یەمەنی صەنعانی کە لە ساڵی 840 ی کۆچیدا وەفاتی کردووە.

خوێندنگەی رەسەنایەتی دەبوو بەرنگاری ئەو خوێندنگەیە بێتەوە کە دەیدا بە شانو باڵی خوێندنگەی یۆنانیدا، ئەوەی دوای مشتومڕی دکتۆر نەشار لەگەڵ بیروراکانی دکتۆر ئیبراهیم بیومی مەدکوور لە کتێبەکەیدا (في الفلسفة الاسلامية) دەردەکەوێت وەك شوێنکەوتەکانی رێبازی لوتفی سەید و تەها حوسەین، مەدکوور پێی وایە ئەرجانون ئەرستۆ لە خوێندنگە کەلامی و فیقهی و

زانستی و فەلسەفیەکاندا کاریگەری هەبووە، دکتۆر نەشار دەڵێت مەنتیقی ئەرستۆتالیسی گوازرایەوە بۆ جیهانی ئیسلامی و تەنها کاریگەری لەسەر خوێندنگە مەشائیە ئیسلامیەکان هەبوو و خوێندنگەکانی تر کە زادەی سیستمێکی ئیسلامی بوون تەواو دوور بوون لێیەوە، تەواو دژایەتی کرۆك و وردەکاریەکانی مەنتیقی ئەرستۆییان دەکرد، دکتۆر مەدکوور نکوولّی ناکات لە بوونی ئەو مەنتیقە ئیسلامیە، بەلاّم پێی وایە مەنتیقی ئەرستۆیی کاریگەری گەورەی هەبووە لە جیهانی ئیسلامیدا، بەلام من هەر بڕوام بە بوونی شتی وا نیە.

زاڵبوونی مەنتیقی ئەرستۆ کاتێك دەرکەوت کە بیری ئیسلامی لە سەدەی پێنجەمدا داکەوت و تێکەڵ بە زانستی یۆنان کرا، بەلاّم ئەمە بازنەی رەزامەندی فیقهناسانی دواتر و موتەکەلیمە ئەشعەریەکان و موتەکەلیمەکانی سەلەف نەدەگرتەوە و بڕوایان نەبوو بە بەکارهێنانی ئەو مەنتیقەو تەواو دژایەتی ئەو مەنتیقەیان دەکرد.

## نوێکردنەوەی ڕاڤەی باتینی بۆ قورئان

هەوڵێکی زۆر دراوە تا لەنێو ڕاڤەی سەردەمدا وا نیشان بدرێت مەبەست لە سزای دۆزەخ بریتی نیە لەو وێنە رووکەشەی لە دەقەکانی قورئاندا هاتووە، بەڵکوو نموونەیەکی ترساندنو هەڕەشەیە، دکتۆر موحەممەد سوعاد جەلال دەڵێت ئەم قسەیە زۆر رووخێنەرەو دەبێت ئوممەت لەپێناو پاراستنی قەوارەی ئایینەکەی و بنەڕەتی بوونی بەرنگاری ئەو تۆمەتە سەختانە بێتەوە کە لە هەر ناوچەیەك دەرەکەوێت و مەبەست پێی بڵاوکردنەوەی تاوان و خراپەکاریە لەنێو خەڵکدا، چونکە کە بیرۆکەی سزای رۆژی دوایی لە دەروونی تاکدا داماڵرا، ئیتر رەگەزی زیندووکردنەوەی ویژدان و بەرپەرچدانەوەی ئارەزووبازی نامێنێ، ئیتر بانگەشە بۆ بێڕەوشتی رەها و دەربازبوون لە رێساکانی چاکە دەروونی و جنسیەکان دێتەکایە، ئەمەش دەبێتە ئامانجێکی ئایدۆلۆجی بۆ هەندێ فەلسەفەی هاوچەرخی وەك بوونگەرایی و چەندێکی تر، ئەوانەی دەڵێن سزای رۆژی دوایی بوونی نیە مەبەستیانە بە لێزانی خۆیان ئەو فەلسەفە رووخێنەرانە بێنن تا رۆحی ئوممەتی ئیسلامی بکوژنو گوڕوتینی دەروونی و بیروباوەڕی نەهێڵن، بەڵام ئوممەت لە مەیدانی جەنگە جیاجیاکاندا زۆر پێویستی بەو بنەڕەتانە هەیە کە سەرچاوەی توانای خەباتگێڕی و خۆپارێزی موسڵمانن، ئەمەش رۆڵی گێرەشێوێنی شعووبیەت نیشان دەدات لە پێناو لەناوبرنی ئیسلام لەناوخۆوە، ئەویش بە چالاکی فیکری دژ بە چەمكو واتاکی ئیسلام لە سەردەمە دەوڵەتی عەبباسیدا.

بوونیەت و بەرهەمی پێیان وایە سزای ڕۆژی دوایی بوونی نیە، هەندێ ئایینی تری خاوەن کتێبە پێیان وایە سزای ڕۆژی دوایی مەعنەویەو هەست پێکراو نیە، پێچەوانەی موسڵمانان کە پێیان وایە سزای ڕۆژی دوایی هەست پێکراوە، ئەمەش هەوڵێکە بۆ پێچانەوەو لەخۆدا ونکردنی ئیسلام و نەهێشتنی تایبەتمەندیەکانی لە دەروونو ژیانی موسڵماناندا و دانانی برێ چەمكو واتای تر لە شوێنیاندا، بەو هەنگاوەشیان هەریەك لە پرسی سزا و پاداشت لەکاردەخەن و پێیشیان وا نیە ئەرکی شەرعی لەسر هیچ کەسێ واجب بێت چونکە سزاو پاداشت کرۆکی ئەرك و بەرپرسیارێتیەو ئەو ئەو گوتارە نەما ئیتر گوتاری بوونی ئەرك و بەرپرسیارێتی واتایەکی بۆ نامێنێتەوە، بەوەش هەموو ئیسلام لەکاردەخرێت.

قورئانی پیرۆز کە بێگومان لەلایەن پەروەردگارەوە دابەزیوە، هیچ شتێ لە خۆوە ناڵێت و چی تێدایە ڕاست و دروستەو مەنتیقی سەلامەت و دروستی هەیەو حوکمەکانی دروستن، خەڵکی ڕاسپاردووە ئەرکە شەرعیەکان بەجێبگەیەنن کە ئەمەش بنەڕەتی پەروەردە ئوممەتە لەسەر چاکسازی و پێشڕەوی رووەو سەرفرازی، هەروەها بۆ ڕێگری لەوانەی لە فەرمان دەردەچن هەڕەشەو سزای ڕۆژی دوایی باس کردووە.

دکتۆر موحەممەد سوعاد جەلال پێی وایە کارکردن بۆ نەهێشتنی بڕوابوون بە سزای ڕۆژی دوایی هەوڵێکی لێدانی ئیسلامە، بەڵکو دەڵێت ئیسلام بەرنگاری ململانێیەکی مێژوویی سەخت بووەتەوە، لەلایەن کەسانێکەوە بە ناحەق

داویانەتە پاڵ پیلان و دوژمنایەتی دژ بە ئیسلام، دەتوانیت ئیسلام وەك قەڵایەكی پتەو و بەهێز وێنا بكەیت كە لەناویەوە خەڵكێ دەین بیروباوەڕ و نەریتی تایبەت بە خۆیان هەیە، ئەو فەرهەنگە ئایینیە نەك نەتەوەییە پەتی بەهێزی خوایە كە ئەو كۆمەڵە مرۆییانە یەكدەخات و یەكەیەكی بەهێزیان لێ پێكدێنێ چە لە بوون و چ لە كاركردن و بنیاددا، هەروەها توانای خەباتیان پێ دەبەخشێت، كەسانێ دژ بە ئیسلام دوژمنایەتییان ڕاگەیاندووە خۆڕاگری و دڵسۆزی بۆ بیروباوەڕیان و دابەشكردن و پەرتكردنی موسڵمانان دەگرنەبەر تا بنەونە شكاندنی قەڵای رووكەشی ئیسلامی، ئەویش بە داگیركردنی زۆربەی ناوچەكانی موسڵمانان، گرنگ ئەوەیە ئەمانە مەبەستیان لەو دەسەڵاتەیان شكاندنی توێژی قەڵای رووكەشی ئیسلامە كە مەبەستم پێی دەستگرتنە بەسەر ئوممەت و زەویشدا، ئەمە خۆی ناتوانێت ئامانجە رەسەنەكەی بێنێتەدی، بەڵكو مەبەستی دەربازبوونە لە دەسەڵاتی جیهانی ئیسلامی وەك بیر و ئایین و ئایدۆلۆجیا، هێشتا ئەو قەڵای بیروباوەڕ و حوكمە لەنێو موسڵماناندا ماوەو ئەو بیروباوەڕ و حوكمانە ئەگەر لە دەروونی موسڵماناندا كارلێك بكەن ئەوە زامنن تا جارێكی تر بنیادی توێژی شكاوی رووكەشی قەڵاكە بنیاد بنێتەوە.

## بەرپرسی زەنج و حەلاج

بزاڤی پیلانگێڕی دژ بە ئیسلام هەوڵیداوە بڕێ چەمكو واتای ساختە ببووژێنێتەوە تا بتوانێ شعووبیەت و بیری باتینی بە جۆرێ ببوژێنێتەوە کە ئەو بڕوایە بڵاو بکاتەوە بزووتنەوەی زەنج و قەرمەتیەکان چەند بزووتنەوەیەکی دادپەروەری کۆمەڵایەتین.

بەرپرسی زەنج و حەلاج پێشڕەوی ئەو کەسێتیانەن کە جەختیان لێ کراوەتەوە، بەڵام بزاڤی بێداریخوازی ئیسلامی و رەسەنایەتی توانیویەتی ئەو پەیامە ساختانە بخاتەوە شوێنی خۆیانو ئەو بانگەشەیە پووچەڵ بکاتەوە کە گوایە حەلاج چاکسازێکی کۆمەڵایەتی یان بانگخوازێکی دادپەروەری کۆمەڵایەتی بووەو کوژرانی لەپێناو رزگارکردنی کۆیلەکانی سەر زەوی بووە، لویس ماسینیۆن گرنگیەکی زۆری داوە بە حەلاج و ماوەی چل ساڵ کاری لەسەر کردووە چ لە نووسین لەسەری چ لە چاپکردنی بەرهەمەکانیو دانانی ژەهری حەلاج لەبەردەستی رۆشنبیرانی ئەم سەردەمەدا، زۆر سوور بووە لەسەر ئەوەی پەیوەندی نێوان حەلاج و قەرمەتیەکان بەدرۆبخاتەوە، دکتۆر موحەممەد قاسم بەرنگاری ئەو پرسە بۆتەوەو لایەنی راستیەکەی خستووەتەڕوو و دەڵێت ماسینیون زۆر سوور بووە لەسەر ئەوەی بڵێت حەلاج پەیوەندی نەبووە بە قەرمەتیەکانەوە، بەردەوام جەختی لەوە دەکردەوە ئەو کابرایەکی صۆفیگەرا بووەو بانگخوازێکی سیاسی نەبووە، بەڵکو خۆشەویستی ئیلاهی هەبووەو خۆی کردووەتە قوربانی پێناوی خۆشەویستی، بێ سوان پێمان دەڵێت حەلاج

صۆفیەکی سوننی بووەو ویستوویەتی رۆحی ئایینی لە کەشێکی وشك و بێ سۆزی رۆحیدا قووڵ بکاتەوە، ماسینیون و هەندێ لە خوێندکارەکانی پێیان وایە جەلاج بە پەیامی توانەوەی خودا تیایدا بووەتە پردێ لەنێوان مەسیحیەت و ئیسلامی سوننیدا، ئەو هەموو نکوولّی کردنە لە بوونی پەیوەندی نێوان حەلاج و قەرمەتیەکان واتە بوونی پەیوەندیەکی حاشالێکراوە، ماسینیون لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا دان بەوەدا دەنێت هەڵوێستی ئەو کابرا سۆفیە لە مەسەلەی فەرزی حەجدا هۆکاری سەرکۆنەو لەناوچوونی بوو، حەلاج پیرۆزی و گرنگی مەککەی نەهێشت تا بوویە هۆکارێ قەرمەتیەکان هێرش بکەنە سەر مەککەو حاجیەکان لەناوبەرن و کەعبە بڕووخێنن و بەردەڕەشی کەعبەیان برد و دواتر بەردەکەیان بردە هەجەر، نزیکەی بیست و دوو ساڵ بەردەرەشی کەعبەیان لەوێ هێشتەوەو دوای سەقامگیربوونی دەوڵەتی فاتیمی و چەسپانی دەسەلاتی فارسی لە بەغداد لەبری دەسەلاتی عەرەبی ئینجا بەردەڕەشەکە برایەوە بۆ مەککە.

حەلاج هاوسەردەمی دوو بزووتنەوەی شعووبی بوو کە بریتی بوون لە زەنج و شۆڕشی قەرمەتیەکان، هەندێ خاڵی پەیوەندی نێوان ئەو دوو شۆڕشەمان بۆ دەردەکەوێت، ئەمەش لەگەڵ سروشتی رووداوە مێژوویی و کۆمەلایەتیەکاندا دەگونجێت، دەکرێت بوترێت سەدەی سێیەمی کۆچی چەند بزووتنەوەیەکی سیاسی بەخۆیەوە دی کە ئامانجیان بوو لەرووی سیاسیەوە دەست بەسەر دەوڵەتدا بگرن و رێخۆشکەری بکەن بۆ دەوڵەتێکی عەلەوی، ئەمەش دوای

ئەوەی هەوڵەکانی سەدەی دووەم سەرکەوتوو نەبوون لە گواستنەوەی دەسەڵات لە ئومەویەکانەوە بۆ ئالوبەیت.

ئاسایی بوو ئەو بزووتنەوانە مۆرکێکی ئایینی وەربگرن تا پشتیوانانی کینەلەدڵ دژ بە دەوڵەتی عەبباسی لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە، هەندێ پاڵنەری کۆمەڵایەتی و سیاسیو رەگەزی هەبوون بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی عەبباسی، بەڵام شۆڕشە سیاسیەکان لەپاڵ دیاردەیەکی ئایینیدا هەنگاویان نا، چونکە بانگەشی پێغەمبەرایەتی یان خودایی لەو ماوە ناروونەی مێژووی دەوڵەتی عەبباسیدا باو بوونو رێخۆشکەرییان کرد بۆ دەرکەوتنی چەند دەوڵەتۆکەیەکی بچووک بەتایبەت لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچیدا.

بۆیە حوسەینی کوڕی حەلاج یەکەم کەسو کۆتا کەسیش نەبوو بانگەشەی خوایەتی دەکرد، بەڵکو پێش ئەو و دوای ئەویش چەندینی تر هەبوون، هەندێکیان خوێندکاری خۆی بوون، مەبەستمان ئەبووعومەر کە لە نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا ژیا.

لاوازی دەوڵەتی مەرکەزی لە بەغداد هۆکار بوو بۆ دروستبوونی ئاژاوەکانو سەرکەوتوویی شۆڕشی زەنجەکان کە لە ساڵی 255 ی کۆچی دەستی پێکرد و نزیکەی پانزە ساڵ درێژەی خایاند، سەرەتا بزووتنەوەکە لەژێر دروشمێکی ئایینیدا دەستی پێکرد و کەسێك کە خۆی بە هەواداری ئەهلوبەیت دادەنا دەستی پێکرد، ئەویش بریتی بوو لە موحەممەدی کوڕی موحەممەد عەلی عەبدورەحیم کە لە تالەقان لە خوراسان لەدایك بوو، ئەو ناوچەیە بنکەیەکی

بانگخوازانی ئیسماعیلی و فاتیمی بوو له نەوەکانی مەیموونی قەداح و حەلاجیش سەردانی ئەوێی کربوو، بزووتنەوەکە بە هاتنی بەرپرسی زەنج لە خوراسانەوە دەستی پێکرد، ئەو کابرایە بانگەشەی ئەوەی دەکرد عەلی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عیسایەو لە نەوەکانی حوسەینە، توانی سەرکەوتوانە متمانەی زەنجەکان بەدەست بێنێ و ژمارەیەکی زۆر لە دەوری کۆبوونەوە، دواتر رووەو بەحرەین چوو کە بەهێزترین بنکەی قەرمەتیەکان بوو لە دواتردا، خەڵکێکی زۆری ئەوێیش شوێنی کەوتن، ئەویش بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بۆ خۆی دەکرد و دەویت سروشی بۆ دادەبەزێت، دواتر چوو بۆ بەصرەو لەوێوە چوو بۆ بەغداد و دەیوت برێ نیشانەی هەیە کە هەمان کەراماتەکەی حەلاج و ئەوانەی دواتری لەخۆگرتبوو، بەرپرسی زەنج توانی خەڵکێکی ناو بەغداد بە لای خۆیدا راکێشێت، دواتر خۆی و هەوادارانی لە ساڵی 255 دا رووەو بەصرە چوون، بەصرەی هەڵبژارد دوای دەرکردنی والیەکەی، دواتر کۆیلەکانی کۆدەکردەوەو گرووپی لێ دروست دەکردن و بۆ هەر دەستەیەك لە خۆیان سەرکردەیەکی دادەنا، بەڵێنی بەهەشتی دەدا پێیان، بەوەش ژمارەیەکی زۆری هەرزەکارانی بەصرەی لە دەور کۆبوویەوە، زۆرێ لەو کۆیلانەش کە لە دەست رزگار بوون لە کۆیلایەتی و ماندووبوون دابوویانەپاڵی، کە دەسەڵاتی زۆر بوو ئیتر چوو رووەو قادسیەو تالانی کرد و دواتر گەڕایەوەو هێرشی هێنایە سەر بەصرەو کەوتە کوشتنیانو ژمارەیەکی زۆری خەڵکی بەصرەی کوشت، مەسعوودی وێنەی ئەو کوشتارە دڕندانەی کارەساتی

بەصرەی نیشانداوەو دەڵێت خەڵکێکی زۆر لەماڵ و بیرەکاندا خۆیان دەشاردەوەو بە شەو دەهاتنە دەرەوەو سەگیان سەردەبڕی و دەیانخوارد، تەنانەت کە یەکێکیان دەمرد گۆشتەکەیان دەخوارد.

بەوجۆرە خێرا بزووتنەوەی زەنج رووی راستیی خۆی نیشانداو ژنانی ناو وەچەی حەسەن و حوسەین و عەبباسی و هاشمیو قورەیشیەکانی تر لە بازاڕی کۆیلەفرۆشاندا دەفرۆشران، نەریتێکی زەنجیەکان ئەوەبوو کە دیلەکانیان دەکوشت، ئەمەش ترسو بیمی نایەوە، هەندێ شار بێ جەنگ قەڵاکانیان دەدا بە دەستەوە، وەك چۆن خەڵکی ئابادان وایانکرد، هەروەها چوونە ئەهواز و وێرانیان کرد و دواتر سووتاندیان، بەرپرسی زەنج تەنانەت رێزی نەدەگرت لە بەڵێنەکانی بەرامبەر بە دوژمنانی، جا کاتێك چوویە بەصرە کەوتە کوشتار و شەو و رۆژی هەینی و شەممە ماڵو حاڵی دەسووتاند، کاتێك خەڵکی بەصرە داوایان کرد پەنایان بدات، ئەویش شوێنێکی دیاری کرد بۆیان، کە لەوێ کۆبوونەوە ئەم ناپاکی نواند و فەرمانی کرد بیانکوژن، ئینجا چەند ناوچەیەکی بەصرەی سووتاند، هەمان کاری لە شاری واست کرد کاتێك لە ساڵی 264 ی کۆچیدا چووە ناویەوە، بەلام ئەبولعەبباس موەفەق لە ساڵی 267 ی کۆچیدا تووشی یەکەم شکستی کردن.

دواتر نامەیەکی نووسی بۆ بەرپرسی زەنج و تیایدا داوای لێکرد تەوبە بکات، بەڵام ئەو رازی نەبوو، بۆیە موەفەق گەمارۆی ئەو شارەی دا کە بەرپرسی زەنج ناوی نابوو موختارە، ئینجا گەمارۆکەی لەسەر توند کرد،

کاریگەری دەروونی نێو پشتیوانانی بەرپرسی زەنج دیار بوو، هەندێ لە سەرکردەکانیان داوای پەنایان دەکرد لە موەفەق، ئەویش پەنای دان، بەردەوام گەمارۆی شارەکەی دا تا تەواو برسێتی ناو شارەکەی گرتەوەو دواجار موەفەق چووە ناو شارەکەوەو کۆشکەکانی سووتاند و ژنو مندالآنی رزگار کرد و توانی لە سالی 270ی کۆچیدا شۆڕشی زەنج لەناویەرێ.

هێندەی نەبرد دوای مردنی موەفەق لە سالی 278 دا شۆڕشێکی نوێ دەرکەوت کە ئەویش شۆڕشی قەرمەتیەکان بوو و سەدەیەك درێژەی کێشا، حەلاج تۆمەتبار کراوە بەوەی یەکێك بووە لە گەورە بانگخوازەکانی قەرمەتیەکان و لەژێر پەردەی سۆفیگەرایی و بانگەشەی خوایەتی و لەکارخستنی فەرزەکانی ئیسلام وەك نوێژو رۆژوو و حەج و زەکات و یەکخواپەرستی ئەوەی کردووە، ماسینیون زۆر هەولّ دەدات تۆمەتی سیاسی لەسەر حەلاج لابەرێت هەرچەندە دان بەوەدا دەنێت حەلاج بانگەوازی کردووە بۆ نەمانی ئەرکەکان و لای ئەو وەلی بوون لە پێغەمبەرایەتی بەرزترەو وەلی دەتوانێت شەریعەت وازلێبێنێ و برێ دەستەواژەی نوێ دابنێت، وێڕای جیاوازی کاتیی نێوان کۆتایی شۆڕشی زەنج و سەرەتای شۆڕشی قەرمەتیەکان کەچی دەبینین ئەو دوو شۆڕشە پەیوەندییان بە یەکەوە هەبووەو بە شێوەیەك لێك نزیك نەخشەیان بۆ دارێژراوە.

قەرمەتیەکان ئایدۆلۆژیایەکی ئاینییان هەبوو کە لەگەلّ ئایینەکەیاندا نەدەگونجا، ئیتر چ سوننیەکان یان شیعەکانیش، رێبەری قەرمەتیەکان دەیوت

ئەو بانگخوازی مەسیحەو خودی عیسایەو ئەو بریتیە لە کەلیمەو هەر ئەو مەهدیەو جبریلە، هەموو ئەمانە مۆرکی تێکەڵکردنی ماسۆنی و قەرمەتی و باتینین.

ئیبن ئەسیر دەلێت قەرمەت پەیوەندی هەبوو بە بەرپرسی زەنجەوە پێش ئەوەی بەرپرسی زەنج بکوژرێت، پێی وت سەد هەزار شمشێر بەدەستی هەیە، بەڵام ئەو دوانە لەبەر هەندێ جیاوازی مەزهەبی رێکنەکەوتن، وێرای ئەو جیاوازیە مەزهەبیانە بەڵام هەنگاوەکانی ئەو دوو تاقمە تا ئاستێکی زۆر لێچکوو بوو هەر لە بە کەنیزەك گرتنی ژنان و کوشتنی دیلەکان و تاڵان و وێرانکاری، بۆیە هەنگاوەکانی قەرمەتیەکان تەواوکاری هەنگاوەکانی بەرپرسی زەنج بوون.

حەلاج کە هەر لە ساڵی 285 ی کۆچیەوە بۆ نزیکەی پێنج ساڵ بەنێو خوراساندا دەگەڕا، زۆر لەسەر دەرکەوتنی مەهدی چاوەڕوانکراو دەچوو و سوێندی بەو دەخوارد، ئەمەش لە ساڵی 290 ی کۆچیدا کە تیایدا هەندێ بانگخوازی قەرمەتی لە خوراسان هەمان کاریان دەکرد و تیایدا قەرمەتیەکان لە چەند شوێنێ کوشتو بڕو توندوتیژییان گرتەبەر، لە ساڵی 301 دا حەلاج بەند کرا، ئیبن ئەسیر دەڵێت بە رای هەندێ کەس حەلاج جادووگەر بووەو هاوەڵێکی لەگەڵ بوو پێی وترا حەلاج بانگەشەی خوایەتی دەکات، پێشەوا جوەینی ئیمامولحەرەمەین دەڵێت حەلاج بانگخوازێکی قەرمەتیە و لەگەڵ جنابی و ئیبنولموقەنەع رێککەوتووە بۆ شێواندنی بیروباوەڕی خەڵك و هەرکام چوون بۆ ناوچەیەك، جنابی لە هەجەر و بەحرەین و ئیبنولموقەنەع لە وڵاتی تورك و

حەلاجیش لە عێراق بوو، هەرچەندە حەلاج هاوسەردەمی ئەوان نەبوو، بەڵام کوژرانی جەنابی و چوار لە گەورە سەرکردەکانی قەرمەتیەکان لەسەر دەستی خزمەتکارە صەقلەبیەکانی لە ساڵی 301 دا کاریگەریەکی گەورەی نەبوو لەسەر قەرمەتیەکان کە دەسەڵاتیان هەبوو بەسەر هەجەر و ئیحساو قەتیف و تائیف و هەموو وڵاتی بەحرەیندا.

ئەوەی پێویستە لێکۆڵینەوەیە لە توندوتیژی قەرمەتیەکان لە کوشتاری حاجیەکاندا، دەبینین ماسینیۆن وێڕای ئەوەی هەوڵی زۆری داوە نکوولی بکات لە بوونی پەیوەندی نێوان حەلاج و قەرمەتیەکان، کەچی ناچار دەبێت دان بەوەدا بنێت حەلاج ویستوویەتی فەرزی حەج لەکاربخات، هەوڵی پیسکردنی کەعبە ئامانجێکی سیاسی بانگەوازی فاتیمی بوو، دیاردەی لەکارخستنی حەج و بانگەشەی خوایەتی دوو بانگەوازی زاڵ بوون، حەلاج ئەو دوانە پێکەوە گرتووەتەبەر، دواتر خەڵکی راجیابوون لەسەر هۆکاری کوشتنی، ئایا لەبەر لەکارخستنی فەرزی حەج یان لەبەر بانگەشەی خوایەتی، بەڵام ئەو هەردووکیانی دەویشت و دەیوت ئەو رێبازی حلوولی گرتووەتەبەر، کاتێك هەردوو هەنگاوەکەی گرتەبەر دەبوو ئاراستەی گشتی هەریەك لە بزووتنەوەی قەرمەتی و بانگەوازی فاتیمی بگرێتەبەر و لە هەمان کاتیشدا پشت ببەستێت بە جادوو و سۆفیگەریش.

## شعووبیەکان

**(ئیبنولموقەفەع، ئەبووعوبەیدە، عەلان، ئەبوونەوواس، ئەبولعەتاهیە)**

دکتۆر بەدیع شەریف بنەڕەتی پیلانەکە دەخاتەڕوو و هەوڵ دەدات خاڵ بخاتە سەر چەندین پیت، بەتایبەت سەبارەت بە زانیاریەکانی رۆژهەڵاتناسان، ئینجا دەڵێت جوەیدی رۆژهەڵاتناسی ئیتاڵ نووسراوێکی ئیبراهیمی کوڕی قاسمی بڵاوکردوەتەوە کە ناوی کتێبەکە بریتیە لە (الرد علی اللعین عبدالله بن القفع) و تیایدا زندیقبوونی ئیبنولموقەفەعی خستووەتەڕوو، ئیبراهیم چەند وتەیەکی دژ بە قورئانی ئیبنولموقەفەعی هێناوە، عەبدوڵا بە شێوازێکی نوێی بیسمیللاهی (بسم الله النور الرحمن الرحیم) دەستی پێکردووەو دەکەوێتە وەسفی رووناکی و بە سەرچاوەی خێر و مەعریفەی دادەنێت و لەروانگەی دین و قورئانەوە هێرش دەکاتە سەر ئیسلام و پێی وایە بە تایبەت بۆ موحەممەد دابەزیوەو رەخنە دەگرێت لە وێنای جنۆکەو سووتاندنیان بە شەهابەکان، دواتر گاڵتە بە خوا دەکات لەبەرئەوەی سەرکەوتنی موسڵمانانی خستووەتە نێو شمشێر و ئەسپەوە، باس لە ستەمی خوا دەکات، لەوانە رێدان بە کوشتنی پێغەمبەرانی و نەپاراستنیان و دواخستنی سزای ستەمکار بۆ رۆژی دوایی و بڵاوکردنەوەی نەخۆشی و دەرد لەنێو خەڵکدا و هەستکردن بە تووڕەیی و خەم و ئازار لەبەرئەوەی رۆژی دوایی زەبانیەکانی خۆی دەنێرێت تا ئەوانەی لە ئیسلام دەرچوون سزایان بدات، دوایی دەکەوێتە هێرش کردنە سەر خودی موحەممەد (ﷺ).

قاسم هەمو پەیامەکەی ئیبنولموقەفەعی نەهێناوە، بەڵکو چەند دێڕێکی لێ هێناوە، بەڵام وێنەی مشتومڕی باوی ئەوکاتەو خەباتی بەردەوامی نێوان ملهوڕان و موسڵمنانمان پێ نیشان دەدات کارەکەی ئیبنولموقەفەع تاکەکەسی بوو، بەلام کارێکی گەورە بوو لە مەیدانی ململانێی نێوان ئەو دوو ژیارەدا، وێڕای رۆڵی گەورەو کارای ئیبنولموقەفەع، بەڵام رۆڵی زۆر کەمتر بوو لە رۆڵی بنەماڵەی بەرمەکی لەو مەیدانەدا.

بەرمەکیەکان ئەصمەعییان لە کۆشکی خەلیفە دەرکرد و خۆیان چوونە شوێنەکەی، ئەبووعوبەیدە کەسێکی رۆشنبیر بوو و رۆشنبیری جوولەکەو مەجووسیەتی تێکەڵ بە رۆشنبیری ئیسلامی کردبوو، باوکی باوەڕداری تەوراتی بوو، باپیریشی بڕوای بە مەجووسیەت هەبوو و کەسێکی شعووبیو رەگەزپەرست بوو، کتێبی (المثالب) و (الطعن علی العرب) ی دانا، یەکێکیان تایبەت بوو بە هۆزی باهیلەو یەکێکی تریان بە گشتی لە هۆزەکانی تر، جۆلد سیهەر دەڵێت ئەبووعوبەیدە تەواو خووی گرتبوو بە هەڵبەستنی رووداو و فەرموودەو وتەیەك کە کێشەی لەنێوان هۆزە عەرەبیەکاندا بنایەتەوە.

ئەبووعوبەیدە لە کتێبەکەیدا باسی رەچەڵەکی عەرەب دەکات و هێرشی زۆریان دەکاتە سەر، هەر شتێکیشی دیبێت شانازی بێت بۆ عەرەب گێڕاویەتیەوە بۆ فارسەکان، ئەگەر قەصیدەیەکی بەهێز یان چیرۆکێکی بەتامی بەدی بکردایە دەیوت عەرەب لە فارسەوە وەریانگرتووە، هێندە رۆچووبوو تا زۆر رەوشتی بەنی عەدنان و قەحتانیەکان و ژیانی ئەوانی دەگێڕایەوە بۆ سەر

ساسانيەكان، جۆلد سيهەر دەڵێت بەو چەشنە ئەبووعوبەيدە دەيەوێت هەموو گوڵێكی گەشی نێو شانازی عەرەب هەڵكێشێ.

گێڕانەوەكانی ئەبووعوبەيدە لە كتێبەكانی مێژوودا بڵاوبوونەتەوەو چەندين مێژوونووس و شارەزای زمانی عەرەبی پشتی پێ دەبەستن، تەبەر لەوەوە بەسەرهاتی هۆزە عەرەبيەكانی هێناوە، چەندين وتەی لەسەر عەرەب هێناوە كە داهێنانی ئەون، كەچی لە كتێبەكەی بەلازەريدا (أنساب الاشراف) تۆمار كراون.

وەعلان يان غەيلانيش كەسێكی شعووبی بوو و شارەزای رەچەڵەكی عەرەب بوو و هەواداری بەرمەكيەكان بوو، لە بەيتولحيكمە كتێبی دەنووسيەوە بۆ هاروونەرەشيد و مەئموون، كتێبی (المثالب)ی دانا كە تيايدا هێرشی كردە سەر عەرەب، ئالووسی دەڵێت غەيلان زنديقێكی دوانەخواپەرست بوو و كتێبێكی دژ بە ئيسلامی نووسی بۆ تاهيری كوڕی حوسەينو تيايدا تانەی دەدا لە قورەيش و هەموو عەرەب و هەموو خراپەو ناشيرينيەكی دەدايە پاڵيان و تۆمەت و بوختانيشی بۆ دادەتاشين.

هەروەها ئەبانی كوڕی عەبدولحەميدی لاحقی جێی متمانەی بەرمەكيەكان بوو و كتێبی مەزدەكی وەگێڕا بۆيان، هەروەها كليلەو دمنەی بە شيعر داڕشتەوە، جەعفەری بەرمەكيش سەد هەزار درهەمی پێ بەخشی.

هەريەك لە ئەبوونەواس و ئەبولعەتاهيەش هێرشيان كردووەتە سەر سوننە و بنەمای رووخێنەريان بڵاوكردوەتەوەو بەشار بن برد رێخۆشكەری كرد بۆيان،

بەرمەکیەکانیش توانییان پێگەی یەکەم بۆ ئەبوونەواس لە کۆڕی هاروونەرەشید مسۆگەر بکەن، ئەبوونەواس شاعیرێکی زۆر لێزان بوو و جەدەل و هەزەلی تێکەڵ دەکرد و لەو نێوەندەشدا بنەماکانی خۆی بلاودەکردەوە، ئەبوونەواس یەکێك بوو لە گەورە دوانەخواپەرستە زندیقەکان کە گاڵتەی دەکرد بە دین و بە کۆتێکی دادەنا و پێی وابوو رۆژی دوایی و زیندووبوونەوە خەیاڵە، گومانی دروست دەکرد سەبارەت بە بیروباوەڕ و داوای دەکرد لە دین دووربکەونەوە. ئەمەش پێناوێکی مانەویەت بووە بۆ دژایەتی ئایینەکان، ئەوانەی نایناسن دەڵێن ئەبوونەواس کەسێك بوو سەرقاڵی باسی مەینۆشی و غەزەلی نائاسایی بووە، بەڵام ئەوانە نازانن مەبەستی ئەبوونەواس پەخشکردنی رێنماییەکانی بەرمەکی بووە تا ئەو مۆدێلی شیعرە لەناو خەڵکدا بڵاوبکاتەوە، بۆیە ئەم پشتی بەستبوو بە بەرمەکیەکان و ئەوانیش پشتیان بەم بەستبوو.

کریمەری رۆژهەلاتناس کە دیوانەکەی ئەبوونەوواسی بڵاوکردوەتەوە دەڵێت ئەبوونەواس بە ئاشکرا و بێ دوودڵی و هیچ شەرمێك گاڵتەی دەکرد بە بیروباوەڕی موحەممەدی و بنەماکانی گومڕایی و زندیقی بڵاودەکردەوەو دەمی نەدەگرتەوە لە وتنی هەرچیەك بڕوای پێی هەبوو، کاریگەریەکی رەهای هەبوو لەسەر رەشید، هەرکات هارونەرەشید تووڕە بوایە لە بەرمەکیەکان، ئەبوونەواس بە دوو دێڕە شیعر تووڕەییەکەی نەدەهێشت، هەرکات ئەبونەواس تۆمەتبار بکرایە بە زندیقی، بەرمەکیەکان لای هارونەرەشید سکاڵایان بۆ

دەکرد، کاتێك بەرمەکیەکان کوژران، ئەمین ئەبوونەواسی لە بەندیخانەی زندیقەکاندا بەن کرد.

سەبارەت بە ئەبولعەتاهیە ئەوە فایدای رۆژهەڵاتناس تێبینی ئەوەی کردووە کە دوانەخواپەرستی کاریگەری هەبوو لە ئەرجووزە بەناوبانگەکەیدا، هەروەها لە نێو شیعرەکانیشیدا دەردەکەوێت، هەندێ لە رێنماییەکانی مانەوی لە دنیانەویستیدا وەرگرتبوو، ئەمە لەکاتێکدا زوهد و دنیانەویستی سروشتی ئەبولعەتاهیە نەبوو، تەنها باسی مردنی دەکرد و هیچ باسی زیندووبوونەوەی نەدەکرد.

دەبینیت ئەو شاعیرە کە باسی دنیانەویستی دەکات باسی ناوگۆڕ و نەمانی تەماع و زەبوونی و خۆدانەدەست دوابڕاوی مرۆیی دەکات کە ئەمانەش بانگەوازی مانەوین، ئەم هەنگاوی بەرمەکی و شوێنکەوتەکانیان لە گەرمەی کارایی ژیاری نوێ و ئایینی نوێدا وەك تەقینەوەیەکی نێو بینایەکی بەرز وابوو، دیوارەکانی دەشێوێنێ و کونو کەلەبەری بۆ دروست دەکات، دەی بەو هۆیەوە بیدعەو گومڕایی دەرکەوت، جار هەبوو تاکەکان ئە ورۆڵەیان دەنواند و جاریش هەبوو گرووپ و کۆمەڵەکان ئەوەیان دەکرد، خورمەییەکان دروشمیان نەمانی ئەرك و بەرپرسیارێتی بوو و دەیانوت با خەڵکی خوویدەن ئارەزووبازی، قەرمەتیەکان بە رێنماییە باتینیەکانیان خراپەیان نایەوەو لەو رێیەوە تەئویلی قورئانیان بەو چەشنە دەکرد لەگەڵ بیروڕای خۆیاندا بگونجێت، بە کارەکانیان دەیانویست بیروباوەڕی مەجووسیەت بکەنە جێگرەوەی ئیسلام.

## سروش و پێغەمبەرایەتی

لەم رۆژگارەدا برێ نووسینی نوێ دەبینین سەبارەت بە ئیسلام و بیرو رۆشنبیری ئیسلامی کە بانگخوازانێکی بوونگەرایی یان ماددیگەرایی یان وەزعیەتی مەنتیقی نووسیویانە، ئەمەش شتێکی نامۆ نیە، چونکە برێ نووسەی سەردەم وەك دکتۆر هەیکەل و عەقاد و زەکی موبارەك و مەنصوور فەهمی و ئیسماعیل مەزهەر لە ماوەی چلەکانی سەدەی بیستەمدا بەرگی خۆیان گۆڕی و هەڵوێستی جیاواز لە دیدی ساڵانی سیەکانی خۆیان گرتەبەر، ئەم گۆڕانەش دواجار پاشخانو ئامانج و راستیەکانی خۆی نیشاندا، بەڵکو هەیانبوو لە شیعری جاهیلیەوە نەویە پەراوێزی سیرە.

نامۆ نیە برێ لەوانەی لە سەرەتای ژیانیانەوە بە پاشکۆیی بیری رۆژئاوایی ناسراون و ئامانجیان دیاری کراوە، ئێستا بیانبینین هەوڵی نوێ بدەن تا لە کەشی بیر و خوێنەراندا رۆڵێکی نوێ ببینن و ناوبانگێکی تر بۆ خۆیان بەدەست بخەن.

بۆیە نامۆ نیە دەروونی مرۆیی چەند رێیەك بگرێتەبەر و بێئاگا بێت لە رێبازێ یان نەتوانێ بگاتە ئاسۆیەك، دواتر کە دەرفەتی بۆ گونجا یان لە هەر بارێکی گونجاودا توانی سەردانی شارێکی ئیسلامی بکات ئەو کەشە دەروونی و کۆمەڵایەتیە کاریگەری فیکری و کۆنی هەبێت لەسەری، زەکی موبارەك بە سەردانی جەزائیر یان مەغریب بیروراکانی گۆڕا، مەحموود عەزمی بە سەردانی فەلەستین بیروراکانی گۆڕا، هەیکەل پاشا بە سەردانی دیمەشق بیروراکانی گۆڕا،

بانگخوازانی میصری و فیرعەونی و هەرێمچێتی گۆڕان بۆ بانگخوازانی عەرەبچێتی، بۆیە نامۆ نیە کەسێك سەردانی مەککەی موکەرەمە بکات یان سەردانێکی وڵاتە عەرەبیەکان بکات ئیتر مۆرکی ئیسلامی وەربگرێت، دواتر لەپشت ئەمەوە دیدێکی نویێ یان بیرێکی نوێی یەکخواپەرستی لا درووست بێت.

بەڵام هەمیشە تێبینی ئەوە کرداوە عەقڵێ لە روانگەی رۆشنبیری رۆژئاواوە دامەزرابێ پێویستی بە ماندووبوونێکی زۆر نیە تا بتوانێت بیری ئیسلامی وەربگرێت یان بە دروستی لە ئیسلام تێبگات و لەدەست چەمك‌و واتای بیروباوەڕیی رۆژئاوا دەرباز بێت، رەخنە گیراوە لە نووسینەکانی دکتۆر هەیکەل سەبارەت بە کتێبەکەی (ژیانی موحەممەد) یان نووسینەکانی عەقاد لە کتێبی (العبقریات) یان نووسینەکانی تەها حوسەین لە نووسینەکانی (هامش السیرة و عثمان و علی) هەموویان لە نووسینەکانیاندا پشتیان بەستووە بە رێبازی رۆژئاوایی لە شیکاری کەسێتی و چەمکی پاڵەوانێتیدا، بەجۆرێك لەگەڵ چەمك‌و واتای ئیسلامدا ناگونجێن، دەبینین هەمان ئەم رەوتە لە نووسینەکانی نەوەی نوێشدا رەنگیان داوەتەوە، بە جۆرێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك پاڵەوان و چاکسازو پێغەمبەری ئازادی و هەڵگەوتەی شۆڕشگێڕیو چەندین سیفەتی تری لەو چەشنانە ناودەبەن تا دان نەنێن بە راستی پێغەمبەری خوادا کە موحەممەد پێغەمبەری خوا بووەو سروشی بۆ دابەزیوە.

هەروەها دەبینین ئەو نووسەرانە لە هەموو بوارەکانی توێژینەوە ئیسلامیەکاندا قسە دەکەن‌و چەمك‌و واتایەکی جیاواز لە پەیامی ئیسلامی

دەكەنە ڕێبەری بیری ئیسلامی، ئیتر هەیانە بیرکردنەوەی سۆفیگەری و هەیانە موعتەزیلی و هەیانە بیری باتینی دەکەنە پێشەنگو وا نیشانی خەڵکی دەدەن ئەو بیرە وێنای پەیامی ئیسلام دەکات.

لەڕاستیدا مەسەلەیەکی بنەڕەتی لەم بوارەدا هەیە کە ئەویش ئەوەیە بیری ئیسلامی بە بەزاندنی ئاسۆی جیاواز گەشەی سەندووەن ئاسۆکانی موعتەزیلەو سۆفیگەری و فەلسەفەی بڕیوەو بەوە گەشەی زیاتری کردووە، بەڵاو شێوەیەکی سەربەخۆ و ڕوونی خۆی هەبوو کە چۆڕاوەی بەها جوانەکانی ناو ئەو ڕێچکانەی لەخۆدا کۆکردوەتەوەو لە بازنەی پەیامی ڕەسەنایەتی خۆیدا بەکاری هێناوە، ئەو پەیامە ڕەسەنایەتیەی کە لەسەر بنەمای یەکخواپەرستی و بڕوابوون بە خوا دامەزراوە، جا ئەگەر یەکێك لەو توێژەرانە بێت و بەشێکی دیاری کراوی بیر یان قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەسەندنی ئەو بیرە پێش کامڵبوونی لە وێنەی کۆتاییدا نیشان بدات و بە سوننەتی تەواوەتی نیشانی بدات، ئەوە هەڵەیەکی گەورەی کردووە ئەگەر وابزانێت ڕێی ڕاستی گرتووەتە بەر، چونکە بیری ئیسلامی هەر ماوەیەکی زۆر زۆرە ناکۆکی حیزبە سیاسیەکانی پشت ئەو ڕێچکە هزریانەی پوخت کردووەتەوەو چۆڕاوەکەی وەرگرتووەو پابەندبوونی بە سەردەمێکی دیاریکراو یان نەوەیەکی نوێی لێ داماڵیوەو بیرێکی پوختی ئیسلامی لێ وەرگرتووە کە هەموو پرسەکانی کۆمەڵگەو سەردەمەجان لەخۆبگرێت بێ ئەوەی فەلسەفەی یۆنانی و فارسی و هیندی تێکەڵ بە ئیسلام بکات.

بۆیە ئەوانەی تازە هاتوونەتە نێو بواری بیری ئیسلامیەوەو بانگەشەی ئیعتیزالیان پێیەو پێیان وایە ئیعتیزال وێنای بیری ئیسلامی دەکات، تەولو گومڕاو سەرشێوێنن، چونکە ئیعتیزال و بیری موعتەزیلی قۆناغێکی سیاسی و هزری بوو کە نەما و پێچرایەوەو دوای ئەوەی پەیامی ئیسلامی خۆی نواندەوە. وەك چۆن ئەشعەری و دواتر ئیبن تەیمیە جوان روونیان کرەوە، بۆیە ئیسلام بانگەوازێکی عەقڵگەرایی نیە بو چەشنەی برێ بیریاری نوێ وێنای دەکەن. هەروەها پەیامێکی باتینی یان سۆفیگەرایی نیە بە وچەشنەی نوێخوازانێکی تەفسیری قورئان دەیانەوێت، بەڵکو ئیسلام بیرێکی خواپەرستی خاوەن مۆرکی مرۆییە و عەقڵ و دڵ پێکەوە کۆ دەکاتەوەو بە پەیامی یەکخواپەرستی خۆی لە هەر دەسەڵاتێکی تر رەها دەکات، بەڵام هەندێ خوێنەر کە دەبینن توێژەرێ ناسراوە بە ماددیگەرایی یان وەزعیەت و بابەتەکانی ئیسلام دەخاتەڕوو، ئیتر پێی هەڵدەخەڵەتێن، دەبێت ئەوانە زۆر وریا بن بەرامبەر هەر شتێ بلکێنرێ بە ئیسلامەوە، نێوانی ئێمەی موسڵمان و ئەوان پێغەمبەرایەتی و سروش هەیە.

رەوتی نوێی رۆژهەڵاتناسی مۆرکی تایبەتی صەهیۆنی تلموودی هەیەو جیایە لە رۆژهەڵاتناسب رۆژئاوایی، ئیتر چە ئەوەیان کە مۆرکی کڵێسایی هەبوو یان ئەوەیان کە ئاراستەی داگیرکاری هەبوو، ئەمەیان قسە لەسەر یەکخواپەرستی و رۆڵ و ئەرکی ئایینەکان دەکات، رۆڵی ئیسلام لە قۆناغی پێشوودا دەخاتەڕوو و پێی وایە ئیسلام لەو قۆناغەدا خزمەتێکی گەورەی

کردووه به مرۆڤایەتی، وەك بڵێیت ئیسلام کۆتایی پێ هاتووەو پەیامێکی نەمر و هەمیشەیی نەبێت تا ڕۆژی دوایی.

دیارترین مۆرکی ئەم جۆرە ڕۆژهەڵاتناسیە بریتیە لە گومانسازی لە سروش و پێغەمبەرایەتیدا و هەوڵ دەدات پێغەمبەران وەك پاڵەوان‌و چاکساز نیشان بدات کە توانیویانە بیری ئوممەتەکەیان تێبگەن و فەرهەنگی کۆن لە وێنەیەکی نوێدا دابڕێژنەوە، هەموو ئەمانە بانگەشەی بەتاڵ‌و سەرشێوێنن، ئەوانەش ئەو بانگەشەیە دەکەن دەبێت بیریان بخرێتە نێو بازنەی ڕۆژئاواگەری و موژدەبەری‌و شاڵاوی ڕۆشنبیریەوەو ئینجا وەك موژدەبەرو ڕۆژهەڵاتناس هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێت.

ئەوانە پێیان وایە قورئان ڕەنگدانەوەی ناخی موحەممەدەو دەربڕی کاریگەری ئەو ژینگەیە کە تیایدا ژیاوەو لە عەقڵی باتینەوە ئەو قورئانەی بۆ هاتووە نەك سروشێکی خوایی بێت، هەروەها پێیان وایە گەورەیی قورئنا لە هەڵکەوتەیی و بەهێزی و دەروونسافی موحەممەدەوە بووە.

بێگومان ئامانج لەم گومان سازیە ئەوەیە هەوڵ بدەن پەیوەندی نێوان موسڵمانان‌و قورئان نەهێڵن، بەڵکو بڵێن قسەی موحەممەد و کردەی دەستی مرۆڤە، بەمەش واتای بەرزی خۆی لەدەست دەدات و موسڵمانان پەرتەوازە دەبن و کۆدەنگی لەسەر قورئان نامێنێت.

ئێمە دەزانین جیاوازیەکی روون هەیە لەنێوان وتەی موحەممەد و وتەی نێو قورئاندا، چ لەرووی نەسق و نەزمەوە، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) نەخوێندەوار

بووەو خوێندنەوەو نووسینی نەزانیوە، ئەمەش بەڵگەیەکی تێکشکێنەرە بۆ ئەوانەی دەڵێن موحەممەد زانیاری نێو کتێبەکانی پێشووی زانیوە، بەڵکو هێندەی ئەو خەڵکەی تر زانیاری هەبووە، ئیتر کێ ئەم هەموو بەسەرهاتەی سەردەمانی پێشووی پێ وت؟!!

بێگومان سروش دیاردەیەکی دەروونی نێوخۆیی پێغەمبەر(ﷺ) نیە، بەڵکو راستیەکی سەربەخۆیەو لە دەرەوەی کیانی پێغەمبەرە(ﷺ) وەك لە فەرموودەی تایبەت بە سەرەتای دابەزینی سروشدا ئەوە روون‌و ئاشکرا دیارە.

سروش بەردی بناغەی پێغەمبرەایەتی و ئایینیشە، بۆیە بانگخوازانی رۆژئاواگەری جەخت لەو بوارە دەکەنەوەو گومانی لەسەر دروست دەکەن، بانگەشەی ئەوە دەکەن سروش جۆرێ لە ئیلهامی شاراوەیە، هەندێکی دی دەڵێن بەڵکو ئیشراقێکر رۆحی بووە، هەندێك تر بە جۆرێ ململانێی ناو دەبەن.

ئێمەی موسڵمان بڕوامان بە سروش هەیە وەك چۆن بڕوامان بە هەر بەشێکی غەیب و پێغەمبەرایەتی هەیە، پێمان وایە نەیارانی سروش دەستەیەك نین لە موسڵمانان و هەرچەندە قاڵب و شێوەی جیاواز بەکاربهێنن، هەر ناتوانن بەو ساختەکاریەیان دەروونی موسڵمان هەڵخەڵەتێنن.

مەسەلەی سروش و پێغەمبەرایەتی گەورەترین بنەمای بنیادی کۆمەڵگەو ژیارەکان‌و گرتنەبەری رێبازی قورئان‌و شەریعەتی ئیسلامەو گومان نانەوە لەسەریان هەوڵێکە بۆ نەهێشتنی پەیوەندی نێوان موسڵمانان و قورئان، ئەو

قورئانەی کە تاکە کاریگەری پەیامی ئاسمانیە لەسەر زەویدا و تا رۆژی دوایی رێنموونی دەبەخشێت بە دەروونی مرۆیی و کۆمەڵگەکان.

بێگومان هەوڵی بیردۆزە ماددیگەریە نوێکراوەکان بۆ رەخنەگرتن لە سروش و پێغەمبەرایەتی و هەموو مەسەلەکانی غەیب لەنێو ئەو کۆمەڵگانەدا شکستی خۆی نیشان داوە کە ئەو بیرەیان گرتووەتەبەر، بەڵکو بە توێژینەوەی سەلماوە کە بە تەنها عەقڵ ناتوانێت لە هەموو شتەکان تێبگات و زانست نەیتوانیوە وەڵامی هەندێ شت بداتەوەو لە سنووری رووکەشی شتەکان زیاتر ناتوانێت بڕوات، ئەو کۆمەڵگانەش خۆیان شەریعەت و یاساو ئایدۆلۆجیایان داناوە نەیانتوانیوە کۆمەڵگەیەکی دروست بەدیبهێنن یان سوکنایی و ئارامی بگێڕنەوە بۆ دەروونی مرۆیی، بۆیە هەمیشە مرۆڤایەتی پێویستی هەیە بە پێغەمبەر و سروشی خوایی، ئەمانەش پێچەوانەی عەقڵ نین، بەڵکو لەرێی فیترەتی مرۆییەوە پێکدەگەن.

عەقڵ رێی تێگەیشتن لە سروشە، پێغەمبەر رێنموونی عەقڵ دەکات لەو مەسەلانەدا کە بە تەنها ناتوانێت لێیان تێبگات وەك مەسەلەی غەیب و زیندووبوونەوەو پاداشت و سزای رۆژی دوایی، ئەو بوارانەی عەقڵ درکیان پێ ناکات سروش روونیان دەکاتەوەو چاكو خراپیان دیاری دەکات، ئەمەیە پێویستی پێغەمبەرایەتی و سروش بۆ مرۆڤایەتی.

زانستە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیو دەروونیەکان بانگەشەیەکی پووچیان هەیە کە پێیلان وایە کاتێك عەقڵ پێگەیشت ئیتر ئایینەکان وەك پێویستی نەمان بۆ

مرۆڤ، بەڵکو ئەمە ناراستەو تاکە ڕێی پێشڕەوی ماددی ئایین‌و سروشە کە ڕێنموونی دەبەخشێ، بەڵکو حەقە بوترێت مرۆڤایەتی وێڕای ئەو ماوە درێژە چەند ملیۆنساڵیەی بڕیویەتی، -وەك مامۆستا موحەممەد مەجزووب دەڵێت- هێشتا نەیتوانیوە خۆی بپارێزێ لە چاوچنۆکی و جەنگ‌و قەسابخانەکان‌و تەنها سروش‌و پێغەمبەرایەتی مرۆڤایەتی لەوانە دەپارێزێت.

کورتەی قسە ئەوەیە نێوانی ئێمەو ئەوانەی دێنە ناو مەیدانی ئیسلامەوە بریتیە لە سروش و پێغەمبەرایەتی.

## پیلانی جوولەکە بۆ لەناوبردنی رەسەنایەتی ئیسلامی

لە کتێبی العقد الفریددا ئاماژە دراوە بە وتەی شەعبی کە لە مالیکی کوڕی موعاویەی وت: وریای ئارەزووبازە سەرشێوێنەکان بە، خراپترینی ئەوانەش رافیزەکانن، چونکە ئەوانە جووولەکەی ئەم ئوممەتەن و رقیان لە ئیسلامە وەك چۆن جوولەکە رقیان لە مەسیحیەتە، ئەوانە بە حەز ی خۆیان یان لە ترسی خوا موسڵمان نەبون، بەڵکو بۆ تۆڵە سەندنەوە لە موسڵمانان و یاخی بوون لێیان هاتوونەتە نێو ئیسلام، رافیزەکان دەڵێن جیهادی رێی خوا بوونی نیە تا مەهدی نەیەت، جوولەکەش پێشتر ئەوەیان وتووە.

نووسەری ئەو کتێبە دەڵێت جوولەکە کاریگەری خۆی نواندووە لە هەندێ مەزهەبی ئیسلامیدا و بێگومان رووکارەکانی پیلانی جوولەکەش لە مێژووی ئیسلامدا بە روونی دیارن.

ئەبوولوئلوئەی فارسی کە عومەری کوڕی خەتتابی کوشت، ئەمە پیلانێکی دو قۆڵی جوولەکەو مەجووسیەت بوو.

عەبدوڵای کوڕی سەبەء و بیرۆکەی حەق خودایی لە دەوڵەت و لەکارخستنی شوورا.

بزووتنەوە ملهوڕیەکان و قەرمەتی و باتینیەکان:

تەئویلکردنی دەقەکانی قورئانو سوننەت و باسی رووکار و ناوەڕۆك.

بیدعەسازی و داهێنان لە ئاییداو بڵاوکردنەوەی خورافەی ناروون.

فەلسەفەی ئیشراقو مەسەلەی ئیتیحادو حلوول.

دیاره ڕەوتە باتینی و سەرشێوێنیەکان تەئویل بەکاردێنن، تەئویل لە تەفسیردا مەبەست پێی ناوەڕۆکی واتا یان هێما و ئاماژەکانی یان کرۆکی شاراوەیە.

هەروەك ئەو ڕەوتانە ئەرك و بەرپرسیارێتی لەپێ دخەن‌و ڕۆڵی شەرع لەسەر پەرستشتکاران ناهێڵن‌و وا لە خەڵکی دەکەن شوێن ئارەزووەکانیان بکەون و ترسیان نەبێت لە ڕۆچوون لە موباح و حەرامەکاندا.

ئامانجی پیلانی جوولەکە هەر لە کۆنەوە تێکشکاندنی ئیسلام بووە لە ناوخۆوە، تێکشکاندنی لەڕووی هزری و بیروباوەڕیەوە، بۆیە بڕێ بیری پڕ خورافە و زەبوونی دەروونی و تەفسیری سەرشێوێنی دەخەنە نێو جەماوەری موسڵمانانەوە، ئەمەش گەورەترین هۆکار بوو بۆ لادان موسڵمانان لە پێکهاتەی دەروونی و سیستمی کۆمەڵایەتییان.

ئایدۆلۆجیای جوولەکە ئامانجیەتی دووو لای پێکەوەیی ناو ئیسلام لێکجیاکاتەوە، لایەنێکی عەقڵانی تەواو کە ڕۆچووبێت لە چەمك‌و واتای عەقڵ‌و هەستدا، لایەنێکی هەستی تەواو کە تەواو ڕۆچووە لە ڕۆح و ویژداندا.

کەسانێکی ئارەزووبازی ناو موسڵمانان لەپشت ئەم چەمکە ساختانەوە هەنگاو دەنێن تا ئارەزووەکانیان تێر بکەن‌و دەروون لە یاسا و ڕێساکان دەرباز بکەن، ئیتر سنووریان نەبێت و چی سنووری خوا هەیە بیبەزێنن، ئەوانە وازیان هێناوە لەو پەیامە ئیسلامیەی کە هەم عەقڵ و هەم ڕۆحیشی لەخۆگرتووە.

ئەگەر سەیر بکەین ئەمڕۆش هەمان شت لەنێو موسڵمانانیدا دووبارە دەبێتەوەو موسڵمانانێ هەن بڕوا دێنن بە بەشێکی قورئانو واز دێنن لە بەشەکەی تری، ئەوانە یان عەقڵانیەکانن یان حەدەسیەکانن، جار هەیە لە ژیانیاندا پەیامی پەرستش بەجێ دەگەیەنن، بەڵام بە نەزانی بێت یان بە ئامانج بێت رقیان دەبێتەوە لەو پەیامەی ئیسلام دەبەستێتەوە بە کۆمەڵگەوەو شەریعەت پەیڕەو دەکات، لە زۆر نووسینی هاوچەرخیشدا ئەو مۆرکە باتینیە بە دی دەکەین کە پشتیان بەستووە بە نووسنەکانی کۆنی موعتەزیلە یان باتینی و فەیلەسووفەکان، پێیان وایە هەریەك لەوانە بریتین لە پەیامی ئیسلام، یان دەکرێت بەوە پەیامی دروستی ئیسلام بخەنەڕوو، کەموکورتی ئەوانە لەوەدایە بە دیدێکی گشتی دەڕواننە بزاڤی پەرەسەندنی بیری ئیسلامی لە چوار سەدەی یەکەمداو دەیبەستنەوە بەو تاقم و دەستە سیاسیانەی کە دەرکەوتن دوای ئەوەی ئەو رەوتانە تێکەڵ بە فەلسەفە جۆراوجۆرەکان بوون.

بێگومان موعتەزیلەو ئەهلی کەلام و شیعەگەرا و سۆفیگەراکان هەرکامیان قۆناغێکی چەند ئەڵقەیەکی پەیوەست بە یەکیان لەخۆگرتووە کە خۆیان بەرز رادەگرت و دواتر پەیامی گشتگیری ئیسلام زاڵ بوو بەسەر هەموویانداو جوانیەکانی هەموو ئەو رەوت و بانگەوازانەی لەخۆیدا نیشانداو ململانێ و ناکۆکی سیاسی و تاکەکەسی لێ دەرکرد.

بۆیە ئیسلام هەم دیدێکی عەقڵی و هەم تاسەی رۆحی لەخۆگرتووە، خۆشەویستی ئالوبەیت و بانگەواز بۆ گفتگۆ لەگەڵ ناموسڵمانانی گرتووەتەبەر،

بەلام ئیسلام نە عەقلێکی روتەنە وەك ئەوەی هەندێ لەوانەی سەرسامی بیری موعتەزیلەن بانگەشەی بۆ دەکەنو وادەزانن ئیسلام تەنها عەقلە، یان ئەوانەی پێیان وایە ئیسلام کە ئیعتیزالی تێپەڕاند ئیتر تایبەتمەندی خۆی لە گەشەو جوولەدا لەدەستدا، هەموو ئەمانە دیدی لاوەکین کە زاڵ بوون بەسەر بیری مرۆیی و بیری رۆژئاوایی سەردەمی نوێدا.

زۆر توێژەری شوێنکەوتەی خوێندنگە رۆژهەلاتی و رۆژئاواگەریەکان دەستەواژەی (شکستی موعتەزیلە) دەخەنەڕوو وەك بڵێیت شکستی موعتەزیلە هۆکاری دواکەوتەیی بووبێت، ئەوانە راستی ئیسلامیان وەرنەگرتووەو بە دورستی لێی تێنەگەیشتون، لەوانەشە لە بازنەی بیری رۆژئاواییدا لێی تێگەیشتبن.

لەراستیدا شکستی موعتەزیلە ئەنجامێکی ئاسایی بوو، چونکە لەگەڵ کرۆکی ئیسلامو سروشتی بیری ئیسلامی و رێبازی مەعریفەدا نەدەگونجا، چونکە رێبازی مەعریفەی ئیسلامی عەقلو ویژدانی پێکەوە کۆکردووەتەوە.

موعتەزیلە لە بنەڕەتدا هەوڵێ بوو بۆ بەرنگاربوونەوەی رێبازە فەلسەفیەکان، ئەو رێبازە فەلسەفیانەی لە پشتەوە ئایینی دژ بە ئیسلام خۆیان حەشار دابوو، موعتەزیلە لەو بوارەدا بە جوانترین شێوە رۆڵی خۆی بینی و بەرنگاری زانایانی ئەهلی کەلامی ئاینو فەلسەفەکانی تر بویەوەو توانی ئەنجامی گەورە بەدەست بهێنێت و هەزاران کەسی بتپەرست موسڵمان بکات.

بەڵام هێندەی نەبرد بزووتنەوەکە هێندە لە مەسەلەو بیرۆکەی خۆیاندا رۆچوون تا گەیشتنە ئەوەی عەقڵیان زۆر بەرز رادەگرت، موسڵمانان بڕوایان هەبوو بە غەیب و شایەتومان و سروش و عەقڵو پێیان وابوو ئیمانیان بەو پێکهاتە یەکەییە کامڵ دەبێتو تەنها بەرزراگرتنی عەقڵ دەرچوونە لە پەیامی ئیسلام، ئەمە هۆکار بوو بۆ شکستی موعتەزیلەو دارمانی بیرەکەیان لەساسەی ئیسلامی دروستدا، ئینجا ئەوکات پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کەوتە چەکوشکاری لەو بیرەدا و نەویە رێککردنەوەی لاریەکانی تا بگەڕێتەوە سەر بنەڕەتی رەسەنی ئیسلامی ئەو دەردەی لە فەلسەفەی یۆنانیەوە تووشی بووە بیپەڕێنێت.

بەمجۆرە شکستی موعتەزیلە سەرکەوتنی رەسەناسەتی ئیسلامی بوو، لەوانەیە هەندێ رۆژئاوایی دڵتەنگ بووبن بە شکستی موعتەزیلە، چونکە پێیان وایە موعتەزیلە زادەی بیری یۆنانیە، ئەوان ئاواتیان ئەوەبوو موعتەزیلە سەرکەوێت و ئیسلام لە بنەڕەتەکانی خۆید ەربکات وەك چۆن مەنتیقی یۆنانی ئایینەکانی پێشووی لە رەورەوەی خۆی دەرکرد، بەڵام رەسەنایەتی ئیسلامی زۆر گەورەتر بوو لەو فەلسەفە یۆنانیە.

جا ئەو بانگەوازەی ئەمڕۆ دەوترێتەوە بۆ نوێکردنەوەی بیری ئیسلامی و تیایدا پشتیان بەستووە بە بیری موعتەزیلە، بانگەشەیەکی پووچەو ئیسلام قبووڵی ناکات، چونکە ئیعتیزال لە بازنەی بیری ئیسلامیدا نیە، بەڵکو قۆناغێکی ناو ئەو هزرە بوو و دواتر توایەوە.

هەروەها بانگەوازێکی تر لەڕێیە کە بانگەواز بۆ ئەوە دەکات تەفسیری باتینی بۆ قورئان بکرێت، ئەمەش ئەڵقەیەکی توێژینەوە شعووبیەکانی سەرەمە کە سەرچاوەکەی لە بیری جوولەکەییەوەیەو پشتی بەستووە بە ئیسرائیلیات و پەیوەندی هەیە بە بزووتنەوەکانی باتینی و ئیخوانوصەفا و سەبەئی و قەرمەتیەوە.

جا هەوڵێ هەیە پاداشت بە مەسەلەیەکی ڕۆحی و بەهەشت و دۆزەخ بە هەستێکی دەروونی راڤە دەکات، دەیەوێت ئەو حەرامانەی خوا لە جلوبەرگ و شمەکی رازاندنەوەدا دیاری کردووە حەڵاڵیان بکات، ئەمەش کۆن لە مەجووسیەت و تلموودیەوە وەرگیراوەو ئەمڕۆ لەسەر دەستی بانگخوازانێ گەرم دەکرێتەوە کە نازانن ئەوەی دەیڵێن چ مەترسیەکی لەخۆگرتووە.

هۆکارەکەشی ئەوەیە ئەو کەسانە پشتیان بەستووە بە خوێندنەوەی کتێبەکانی تەصەوفی فەلسەفی و پەیامەکانی ئیخوانوصەفا و نووسینەکانی ئیبنولموقەفەع و ئیبن راوەندی و چەندینی تر کە بیری ئیسلامی نکوولێیان لێ دەکات و دان نانێت بە بوونی هیچ جۆرە پەیوەندیەکیان بە بیری ئیسلامیەوە.

ئەمڕۆ هەمان ئەو هەوڵە لەژێر زۆر ناوی نوێدا دووبارە دەکرێتەوە (ڕۆشنبیری جیهانی، ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیری، پێکگەیشتنی ڕۆشنبیریەکان، یەکبوونی بیری مرۆیی..هتد).

هەموو ئەم بانگەشانە بۆ ئەوەن کەمینەو زۆرینەو لاواز و بەهێز تێکەڵ بکەن، ئێستا بیری ئیسلامی و ئوممەتی ئیسلامی لە بارێکی سەختدان، لە

جەرگەی تەنگژە گەورەکەدان، دەبێت بەرامبەر شالاوی رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەلایەتی و سەربازی بوەستنەوەو بوون‌و تایبەتمەندی خۆیان بسەلمێنن و کەس نەتوانێت مۆرکی خۆی بەسەر بیری ئیسلامیدا بسەپێنێت.

بۆیە باری ئێستای بیری ئیسلامی لە ئەگەری توانەوەیە لەنێو رۆشنبیریە جیهانیەکاندا، ئیتر سەرمایەداری بێت یان مارکسی یان صەهیۆنی، دەبێت لەبەرامبەردا ئیسلام بە جیا و سەربەرزانە راوەستێت‌و لەو نێوەندەدا تایبەتمەندی و بوونی خۆی لەدەست نەدات، چونکە ئیسلام تاکە ئایینی دروست‌و خاوەن پەیامی خوایی و مۆرکی مرۆییە.

ئەمە بانگەوازی چواردە سەدەی قورئانە بۆ موسڵمانان تا بەرامبەر بە مەشخەڵەکانی دی روون‌و جیا هەڵوێستیان هەبێت، قسەی چاکی خۆیان هەبێت‌و دوور لە پاشکۆیەتی هەنگاو بنێن، مەترسیەکەی شالاوی جیهانی تلموودی لەوەدایە کە دەیەوێت دەست بگرێت بەسەر هەموو جیهاندا و دنیا زەلیلی بەردەستی ئەو ئایدۆلۆجیا جوولەکەییە بکات کە لە پرۆتۆکۆلی صەهیۆنیدا هاتووە.

قۆناغێ هات کە صەهیۆنیەت توانی هەموو بیری ئیسلامی لەخۆ بگرێت و لەو بازنەیەدا لە هەموو بوارەکانی کۆمەلایەتی و سیاسی و دەروونناسی و ئەخلاقی و پەروەردەییدا هەموان بجوولێنێت، ئەمڕۆ موسڵمانان لە مەیدانی جەنگەکەدان، ئەویش لە روانگەی پەیوەندییان لەگەڵ ئەو بیرە رۆژئاواییەی کە لەژێر کاریگەری تلموودیدایەو بووەتە ریشەی پیلانە گەورەکەی جوولەکە.

**یاسای جوداخوازی قورئانی وایه:**

﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ﴾.

﴿ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ﴾.

﴿ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى مِلَّتِهِمْ ﴾.

﴿ إِن تُطِيعُوا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ﴾.

# بەشی حەوتەم

# دەستە گومڕاکان

لە سەردەمی نوێدا دەستەو تاقمی گومڕای زۆر جەرکەوتون، هەیانە جیایە لە ئیسلامو دەیەوێت زاڵ بێت بەسەر ئیسلامدا، هەیانە دەدرێتەوە پاڵ ئیسلامو ناوی ئیسلامی لەخۆی دەنێت وەك ئەحمەدی و قادیانی.

ئەو بانگەوازانە بۆ سەرەتای کاریان پشتیان بەستووە بە نووسەرانی رۆژئاواگەری و بانگخوازانی شالاوی رۆشنبیریو شتێکیان ناو ناوە (بیری ئازاد) تا هەوڵ بدەن دەرگای گفتگۆ لەگەڵ ئەو رەوتە گومڕا و بانگەوازە رووخێنەرانەدا بکەنەوە، موحەممەد عەبدوڵا عەنان دەڵێت هەندێ لە توێژەرانی مێژووی خەلیفەکان و بزووتنەوە رووخێنەرەکان پێیان وایە بزووتنەوەی بیرکردنەوەی ئازاد لە ئیسلامدا لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ چالاکی بانگەوازی جوولەکەکان کە مەبەستی بانگخوازانی جوولەکە لەوەدا ئەوەبوو بە شکاندنی مەسیحیەت و ئیسلام تۆڵەی خۆیان و ئایینەکەیان بکەنەوە، ئەو بزووتنەوەی داڕووخاندن و ملهوڕیەی سەرەتا لە فارسدا دەرکەوت و ئیبن دەیصان و عەبدوڵای کوڕی پێی هەستان، لەسەر دەستی جوولەکە (کابالای جوولەکەیی) رێنماییە نهێنیە عیبریەکانی بۆ داڕشت و دواتر بەڵێنی راوێژ و هاوکاری داراییشیان پێدا.

لەم سەردەمەشدا هەریەك لە قادیانیەت و بەهائیەت و رۆحگەرایی نوێ دەبینین کە بە هەموو قورسایی خۆیانەوە هاتوونەتە نێو کۆمەڵگەی

ئیسلامیەوەو دەرفەتی زێڕینیان بەكار هێناوە، ماوەیەكی زۆر ساختەكاریەكانیان ئاشكرا نەدەبوونن تا هەندێ نووسەری عەرەبی پاشكۆی رۆژهەڵاتناسان هاتنو رایانگەیاند هەریەك لە قادیانیەت و بەهائیەت بانگەوازی نوێگەرین لە ئیسلامدا، ئەمەش لە ئەنجامی وردنەبوونەوە بوو لەو پاشخانەی كە ئەو بانگەوازانەی هاندەدا، ئەویش بریتی بوو لە داگیركاری بەریتانی و صەهیۆنیەتی جیهانی، دیارە ئەو تاقمانە لەلایەن داگیركەر و موژدەبەران و جوولەكەشەوە هاوكاری دەكران، مەبەستی ئەوانیش بریتی بوو لە (لێدانی ئیسلام بە ئیسلام)، ئەو تاقمانە سەركردەكانی خۆیان پیرۆز رادەگرتو لەسەروو مرۆڤەوە دایاندەنانو برێ هەنگاویان دەنا كە خوا رێی نەدابوو، ناوی ئیسلامیشیان قۆستبوویەوە بۆ لێدانو لەناوبردنی ئیسلام.

دیارە قەڵەمڕەوی داگیركاری زۆر پشتی دەبەست بە قادیانیەت و بەهائیەت لە فارس و هیند، هەردوو بزووتنەوەكە لە بنەڕەتدا پشتیان بەستووە بە لەكارخستنی بنەڕەتێكی گرنگو چەسپاوی ئیسلام كە ئەویش جیهادی رێی خوایە، ئەمەش لەپێناو مانەوەی داگیركار و هاوكاری كردنی و رازیبوون بە دەسەڵاتداری و فەرمانڕەوایی داگیركەر.

قەڵەمڕەوی بیانی دەرفەتی دا بە بزووتنەوەی بەهائی تا لە هەمو جیهانی ئیسلامیدا چالاكی خۆی هەبێت، لە میصریشدا رۆژنامەكانی موژدەبەران و داگیركەران گرنگیەكی زۆریان دا بە بزووتنەوەكە، نامۆییەكە لەوەدایە كاتێك پیلانەكانی موژدەبەری لە میصر ئاشكرا بوونو دەنگی موژدەبەری كز بوو،

کەچی بزووتنەوەی بەهائی هەر تەشەنەی دەسەند و چالاکتر دەبوو، لە قاهیرەو ئەسکەندەریەو پوورسەعید و ئیسماعیلیەو سویس بنکەی هەبوو، چەندین بلاوکراوەی کتێبی هەبوو.

بەهائولای دامەزرێنەری بزووتنەوەی بەهائی لای ئەوان پێغەمبەرو نێردراوی خوایە کە جوانی و بەرزی و ویستی بالای مرۆڤی هێناوەو هاتووە هەموو ئایینەکان لەژێر ئالای بەهائیدا یەکبخات، ئیسلام هی سەردەمێکی تایبەت و برێ عەقڵیەتی تایبەت بووە، بەلام بەهائیەت ئایینی سەردەمی نوێیە، بێگومان بەهائی هەنگاوی جیاواز لە هەنگاوی موژدەبەرانی دەنا، لە لادانی ئەخلاقیدا دەروازەیەکی زۆر نامۆیان هەبوو و ئامانجی بەهائیەت لەوەدا بوو موسڵمان لە بیروباوەڕە ئیسلامیەکەی دەربکاتو وای لێ بکات گومانی هەبێ لە پەیامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و گومانی لەوە هەبێت موحەممەد کۆتای پێغەمبەران بووبێت و ئیسلامیش سەرمۆری شەریعەتە ئاسمانیەکان بووبێت.

بەهائیەت نکوولی دەکات لە چوار بنەمای بنەڕەتی ئیسلام: نکوولی دەکات لە بیروباوەڕی جیهادی دژ بە دوژمنانو وەستان لە رووياندا، نکوولی دەکات لە بیروباوەڕی فەرمان بە چاکەو رێگری لە خراپە، نکوولی دەکات لە بیروباوەڕی دەستگرتن بە خودێتی ئیسلامیەوە، نکوولی دەکات لە بیروباوەڕی حەج کە هۆکاری یەکبوونو پێکەوەبوونی موسڵمانانە.

بەهائیەت پەیوەندی هەیە لەگەڵ جوولەکایەتی جیهانیدا، هەروەك قادیانیەت پەیوەندی هەیە بە داگیرکاریەوە، بەهائیەت ئامانجی ئەوەیە جیاوازیە بنەڕەتیەکانی نێوان ئیسلام و راڤەی ئایینەکان نەهێڵێت، قادیانیەتیش ئامانجی بوو گەورەترین بنەماو بەشی بیروباوەڕی ئیسلام لەکار بخات کە ئەویش جیهادی ڕێی خوایە.

ئەوانە ئیسلامیان بەکاردەهێناو برێ دەستەواژەیان بەدەستەوە بوو وەك مەهدی و پێغەمبەرایەتی و چاکسازی و خیلافەت، سەرکردەکانی بەهائیەت فەرزی نوێژی و ڕۆژوو و حەج و جیهاد و حەددەکان و تۆڵەسەندنەوەو هەموو ڕێنماییەکانی تری نێو قورئان‌و سوننەتیان لەکارخستبوو، ئەوان بڕوایان نەبوو بە ڕۆژی دوایی یان بەهەشت و دۆزەخ و پاداشت و سزای ڕۆژی دوایی، بەڵکو راڤەی باتینییان بۆ وەردەگرت و دەیانوت ڕۆژی دوایی بریتیە لە دەرکەوتنی رۆجی خوایی لە دیمەنێکی نوێی مرۆییدا، سەبارەت بە بەهەشت دەیانوت خۆشیەکی رۆحیە، بۆ دۆزەخ دەیانوت بێبەش بوونە لە ناسینی خوا.

بەهائوڵا بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەو ئایینی یەکخواپەرستیەی کە پێغەمبەرانی خوا هێناویانەو موحەممەد کۆتای پێغەمبەرانیان بووە، هۆکاری شێواندنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بووە، بڕوای بەوە هەبوو مەسیح خوایە، بڕوای وابوو ئەو ئایینەی عیسا هێناویەتی جیاوازە لەو راڤەو لێکدانەوانەی کە ڕۆژئاوا ناسیویەتی، عیسای کوڕی مەریەم پێغەمبەرو بەندەی خوایەو مرۆڤە.

توێژەران بەمجۆرە مەترسی ئەم تاقمە گومڕایان خستووەتەڕوو:

یەکەم: دژایەتی کردنی زمانی عەرەبی، بەمەش زمانی عەرەبی دەخەنە بەر نەشتەر و دژایەتی زمانی جیهانیی ئیسلام و زمانی قورئان دەکەن و نکوولّی لەوە دەکەن زمانی عەرەبی جیهانی بێت و تەنها بە زمانی هاوەشی نوێژ و زانستە ئیسلامیەکانیان دادەنا، ئەمەش لەپێناو پچڕاندنی پەیوەندی نێوان ئەمڕۆ و دوێنیّو فەرهەنگی موسڵمانانەدا.

دووەم: بانگەشەی بوونی پێغەمبەرێکی نویّ و ئایینێکی نویّ کە ئایینی ئیسلامو هەموو ئایینەکانی تری نەسخ کردووەتەوەو بانگەواز کردن بۆ یەکبوونی ئاینەکان و یەکێتی هەموو جیهان.

سێیەم: دەرچوون لە هەموو ئایینەکان و چوونە نێو ئایینێکی نویّ و شوێن پیّ هەڵگرتنی ماسۆنیەت لە وازهێنان لە ئایینەکانو کۆبوونەوە لەسەر یەك ئاین کە ئەویش ئایینی خۆشەویستیە، بەمەش دووبەرەکیەکی نوێیان دامەزراند.

چوارەم: بانگەوازی ئاشتی گشتی کە بانگەشەیەکی ئیسرائیلی بوو و ئامانج لێی فێڵکردن بوو لەژێر ناوی نەمانی جەنگ و بلاوبوونەوەی ئاشتی و یەکێتی، لە بنەڕەتدا ئەو بانگەشەیە هی صەهیۆنیەت و ماسۆنیەت و شیوعیەت بوو.

پێنجەم: یەکسانی نێوان ژنو پیاو و لەکارخستنی شەریعەت و حوکمەکانی خوا سەبارەت بە ئافرەت، بەهائیەت بانگەوازی دەکرد بۆ تێکەڵی بێسنووری نێوان ژنو پیاوو رێخۆشکەری دەکرد بۆ بێرەوشتی جنسی و چێژوەرگرتن لە ئافرەت تا پیاو چۆن و کەی ویستی بە دڵی خۆی چێژی لیّ وەربگرێت، دەیوت

دەبێت ئافرەت لەگەڵ پیاو لە هۆڵی سەما و یانە شەوانەکاندا بەشدار بێت و ئازادی جنسی رەها هەبێت، لە ئەنجامی ئەمەشدا خێزان نامێنێت و رارایی کۆمەڵایەتی بڵاودەبێتەوە.

لە ساڵی 1972 دا توێژینەوەیەکی رەسم بەهائیەت کرا و تیایدا یەکێکیان دەڵێت ئەگەر ناچار بکرێت دژ بە ئیسرائیل چەك هەڵگرێت ئەوە چەکەکە فڕێ دەدات، ئەمەش دروشمی بەهائیەتە، سەرکردەی بەهائیەکان پێی وایە بەهائوڵا خودی مەسیحەو باب خودی مەهدی چاوەڕوانکراوەو قورئان بە رووکەش واتایەکی هەیەو لە ناوەڕۆکدا واتایەکی تری هەیە کە تەنها خوا دەیزانێت، دەیوت بەهائیەکان لە جیهاندا زیاد لە شەست ملیۆن کەسن، دەیوت بە دەرکەوتنی بەهائی ئیتر تەشریعی ئیسلامی لەکاردەکەوێ و ئوممەتی موسڵمانان کۆتایی پێ دێت و پەیامی بەهائی ماوەی هەزار ساڵ بەردەوام دەبێت، دەیوت مەریەمی عەزرا دوا لەدایکبوونی مەسیح شووی کردووە بە یووسفی نەجار و منداڵی ناوەتەوە، بێگومان هەموو ئەمانە رۆحی جوولەکەیی جیهانی و تلموودی راشکاوانە نیشان دەدات.

چەندین توێژەر بەرنگاری بانگەوازی بەهائی وەستاونەتەوەو ساختەی ئەو بانگەوازەیان ئاشکرا کردووە، پێشڕەوی ئەوانەش زانای پایەبەرز موحەممەد فەرید وەجدیە کە دەڵێت چاوچنۆکی بەهائی بۆ ئەوەیە ببێتە ئایینێکی گشتی کە خەڵکی لە هەموو رەگەز و ئایینێ بچنە ناویەوە، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئایینێکی ئاسمانی نیەو هیچ بنەڕەتێکی نیە کە سەرنج راکێش بێ و عەقڵ

قبووڵی بکات، ئەو لەکوێ و ئیسلام لە کوێ کە ئوممەتێکی بەهێزو چەندین شارستانیەتی لە ماوەی چەندین سەدەدا پێشکەش کردووە، هێشتا کەسانی وەك برناردشۆ دان دەنێن بە زیندوێتی ئیسلامداو پێی وایە خەریکە بنەماکانی ئیسلام هەمو جیهان بگرنەوە چونکە سیفەتی گشتگیری و هەمیشەیی هەیە، لەبەرئەوەی لەگەڵ فیترەتدا دەگونجێ و پشت بە زانست و عەقڵیش دەبەستێت، بەهائی لە ئاست ئەو پەیامە بەرزو راستەدا چ پێگەیەکی هەیە.

وێڕای ئەوەی بەهائیەت نیو سەدە یان زیاتر بانگەوازی دەست پێکردووە، کەچی دەبینین نەیتوانیوە ئامانجێکی خۆی بێنێتەدی کە بریتیە لە یەکخستنی رۆژهەلات و رۆژئاوا یان یەکخستنی ئایینەکان یان رەگەزەکان یان نەهێشتنی جەنگەکان، تەنها دەرکەوت شەپۆلێکی ناراستی بێڕەوشتی و ملهوڕی بوو کە پاشماوەی پەیامی باتینی کۆنی لەخۆگرتبوو و دەیویست جارێکی تر گەرمی بکاتەوەو بیخاتەوە بەردەم مرۆڤایەتی.

بەهائیەت پەیوەندی ریشەیی خۆی بە جوولەکایەتی جیهانیەوە ئاشکرا کرد، ئەمەش کاتێك کۆنگرەی جیهانی بەهائی لە ئیسرائیل بەست، دەرکەوت جوولەکە هەر لە کۆنەوە بەهائیەتی بەکارهێناوە هەر لەو کاتەوەی عەبباس بەها لە حەیفا نیشتەجێ بوو.

دواتر قادیانیەتیش بوو بە دوو دەستەوە، دەستەیەکیان ئەحمەدی بوو کە لە بنەڕەتدا بەرهەمێکی داگیرکاری بوو و ئامانجی پێی لێدانی چەمکو واتای دروستی ئیسلام بوو تا دووری بخاتەوە لە پەیامی جیهاد، هەروەها لەژێر ناوی

ئیسلامدا هەندێ گرووپو کۆمەڵ دروست بکات کە رازی بن بە قەڵەمڕەوی داگیرکاریو هاوکاری بکەنو ملکەچی بن.

بۆیە قادیانیەت پیلانێکی راستەقینە بوو دژ بە ئیسلامو ئامانج لێی لاوازکردنی بەها ئیسلامیەکان و بەرزراگرتنی بەها بیانیە هاوردەکان بوو، بۆ لاوازکردنی بەها ئیسلامیەکان ئەوە لە رێی شرۆڤەی هەندێ رێنمایی ئیسلامیەوە کە ئیسلامی لە ناخی تاکی موسڵماندا لاواز دەکرد، یان دروستکردنی بیرێکی نوێ لەسەر بنەمای راڤەیەکی تایبەت بۆ بنەڕەتێکی ئیسلام کە بە دەربڕینی موحەممەد بەهی دواتر دەبوویە مەزهەبێکی ئیسلامی، موحەممەد بەهی دەڵێت ئەمەش لە درووستکردنی رێبازی ئەحمەدی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا خۆی نواند، کاتێك دامەزراوەی میرزا غولام ئەحمەدی قادیانی دامەزرا، ئەمەش دوای ئامادەسازی کەشێکی هزری و رۆشنبیری و رۆحی بۆ دامەزراندنی رێبازێکی وا لەرێی سەید ئەحمەد خانی دامەزرێنەری کۆلێژی عەلیکرەو نووسەری تەفسیری قورئانی و بانگخوازی هەواداری لەگەڵ دەسەڵاتی ئینگلیزی لە هیند کە بە درێژایی سەدەی نۆزدە ئەو بانگەوازەی هەبوو.

ئەو رێبازە وا شرۆڤەی جیهاد لە ئیسلامدا دەکات کە بیرۆکەیەکی کاتی بووە تا ئیسلام وەك ئایینێ خۆی بچەسپێنێ و باری کۆمەڵی ئیسلامی دامەزرێ، ئەگەرنا حەزی لەوە نەبوو بە شمشێر یان هێز بچەسپێ بەڵکو رەفتاری جوانو ئاشتیانە بانگەوازکردن بۆ ئیسلامی پێ بووە، ئەمەش واتە

بەدیهێنانی هەواداری بۆ حکوومەتی ئینگلیزی، بەمەش کارکردن بە جیهاد نامێنێت، بەڵام دیارە بنەمای جیهاد لە ئیسلامدا مەبەست پێی رێنەدانە بە داڕووخانی کۆمەڵی ئیسلامی و توانەوەی لە نێو کۆمەڵێکی تردا.

ئەو بانگەوازانە هەوڵ دەدەن لە رێی بیروباوەڕ و گۆڕینی چەمكو واتای رەسەنی یەکخواپەرستی و جیهاد و دادپەروەریەوە موسڵمانان ملکەچ بکەن.

بانگەوازی قادیانیەت لە پێغەمبەرایەتی نێو قادیانیەتەوە گۆڕا بۆ چاکسازی لە ئەحمەدیداو هەوڵی ئەوەبوو لە دەروونی نەیارانیدا متمانەیەك بگێڕێتەوە بۆ بزووتنەوەکە.

بێگومان ئەو بانگەوازەو بانگەوازەکانی ترریش ئامانج لێیان سڕینەوەی سەرچاوەکانی ئیسلمو رێ نەدان بوو بە یەکبوونی موسڵمانانو کارکردن بۆ بەرزراگرتنی رەگەزپەرستیەك کە لەسەر بنەمای رەگەز دامەزراوە تا لە بەرامبەر ئەو یەکبوونەی فیکریەی قورئان باسی کردووە زاڵ بێت.

ئەو بانگەوازانە چەکی تەئویلیان پێ بوو، ئەمەش رێبازی جوولەکەیە، قادیانی و ئەحمەدی ئایەتەکانی جیهادیان دوور لە واتاو مەبەستەکانی خۆی تەئویل دەکرد، قادیانی راشکاوانە دەڵێت خوا فەرزی جیهادی لەسەر هەڵگرتون، ئەمەش لێدانی فەرزی جیهادە بە شمشێری تەئویل، لەوەشدا شوێن رێبازی ئیخوانوصەفا کەوتووە کە دەیانوت تەئویل بۆ داناکان و تەنزیل بۆ خەڵکی گشتیە.

ئەحمەدی لە سێ خاڵدا لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێت: سروشتی مەسیح و بانگەوازی مەهدی و فەرزی جیهاد، ئەحمەدی دەڵێت مەسیح لەخاچ نەدراوە، بەڵکو تەنها بە رووکەش مردووەو چووەو کۆچی کردووە بۆ هیند، ئەحمەدی دەڵێت ئەرکی مەهدی بانگەوازکردنە بۆ ئاشتی و جیهاد دەبێت بە هۆکارو پێناوی ئاشتیانە بێ، ئەوانە لە هەموو شتێکدا هەواداری خۆیان بۆ حکوومەتی بەریتانی نیشان داوەو بڕوایان وایە مەهدی لە یەك کاتدا لە شێوەی مەسیح و پێغەمبەریشدا خۆی نیشان داوە.

شێخ عەبدوڕەشید ئیبراهیم دەڵێت سەبارەت بە کەسانی قادیانی ناتوانیت گومانی چاکەیان پێ ببەیت، چونکە ئەوانە بڕێ دەستەی سیاسیەتی ئینگلیزین بۆ پەرتکردنی گرۆی موسڵمانان، ئێمە دەزانین ئینگلیز پێویستی بە بڕێك سەرکردەی ناو موسڵمانان هەیە تا ئیسلامی پێ بچەوسێنێتەوە، بەو هۆیەشەوە بابی و بەهائی و قادیانی دەرکەوتن.

بانگەوازی قادیانی ئەنجامی مەترسیداری لێکەوتەوە، لەوانە مشتومڕ نانەوە لەنێوان موسڵمانان و نانەوەی چەندین گومان وەك پیرۆز راگرتنی قادیان وەك مەککەو پێویستی حەج کردن بۆ ئەوێ و کەنارخستنی موسڵمانان لە مەککەو نانەوەی دەمارگیری سەبارەت بە پێغەمبەرێکی عەرەبی و پێغەمبەرێکی هیندیو ئەوەشیان بە سەرکەوتنێکی نیشتیمانی دەزانی.

مامۆستا موحەممەد تەقیەدین دەڵێت ئامانج لە قادیانیەت گێڕانەوەی سەردەمی یەکەمی بتپەرستیە تا یادی بەرهەما و بوودا بکرێتەوە، بەڵام لە شێوازێکی نوێدا، بەوەش رێی فیترەتی ئیسلامی لە کەسانی بیرلاواز دەبڕن.

ئەوانە کۆمەڵێ قادیانی هیندین کە ناوی ئیسلامیان لەخۆ ناوەو برێ بیروباوەڕی جیاوازیان هێناوە، بەلام میراتی بتپەرستییان پییە بۆ گەڕانەوە بۆ بیروباوەڕی جارانیان، بۆیە بانگەوازیان بۆ رزگارکەرێ دەکرد و بیریان لەوە دەکردەوە ئایا براهاما میراتگری خوایەتیە یان میراتگری بووزایە لە پێغەمبەرایەتیدا، ئەگەر شوێن بانگەوازی بەرهەمی بکەوتنایە بۆ مێراتی خوایەتی سەرکەوتوو نەدەبوون، چونکە عەقلیەتی موسڵمانانی هیند رووناکی ئیسلامی وەرگرتووەو ئەوە قبوولێ ناکەن، بۆیە هەوڵیاندا بۆ ئەو رزگارکەرە پلەی ممیراتی پێغەمبەرایەتی دابنێن، بەلام بەشێوەیەکی نزیك لە دركی سەردەمی نەفامی، هاتن غولام قادیانیان کردە پێغەمبەر و پێیان وابوو دەبێت برێ بنەما و بیریشی هەبێت بانگەوازی بۆ بکات، بانگەشەی ئەوە بکات کە سروشی بۆ دێت، چاکترین شت دەستیان کەوت شەریعەتی ئیسلام بوو، بۆیە ئەوەیان کردە بنەمایەك بۆ ئەو پیغەمبەرە درۆزنەیان‌و هەندێ مەسەلەیان هێنا و دەستکاریەکی هەندێ دەقیان کرد و ئەو دەستکاری کردنەشیان کردە بەڵگەی راستی پێغەمبەرایەتی غولام قادیان.

غولام ئەحمەدی قادیانی پێناس و هەواداری خۆی ئاشکرا کردو وتی زۆربەی تەمەنی خۆم لە پاڵپشتی و سەرخستنی حکوومەتی ئینگلیزدا

بەسەربرد، ڕێگریم کرد لە جیهاد و واجبی گوێڕایەڵی فەرمانڕەوا ئینگیزەکانم لە نووسین و کتێب و ریکلام و بڵاوکراوەکاندا بڵاوکردەوە کە ئەگەر هەموویان کۆبکەیتەوە لەوانەیە پەنجا کۆگا پڕ بکەن، هەموو ئەوانەم لە وڵاتە عەرەبیەکان و میصر و شام و تورکیادا بڵاوکردوەتەوە، هەمیشە ئامانجم ئەوە بووە موسڵمانان دڵسۆز بن بۆ ئینگلیز، هەر لە سەرەتای تەمەنمەوە کە تا ئەمڕۆ نزیکەی شەست ساڵ زیاترم بە زمان و دڵم هەوڵ دەدەم تا وابکەم دڵی موسڵمانان راکێشم بەلای حکوومەتی ئینگلیزیدا و هەواداری بن، تا ئەو بیرۆکەی جیهادە نەهێڵم کە هەندێ نەفامی موسڵمانان دایانناوەو ڕێگرە لە دڵسۆزییان بۆ ئەو حکوومەتە.

لە ئەنجامی ەمەدا هەزاران کەسم لە بیرۆکەی جیهادیان پەشیمان کردووەتەوە، ئەمەش دەستکەوتێکە کە شانازی پێوە دەکەم و موسڵمانانی هیند ناتوانن لەوەدا کێبڕکێم بکەن.[١]

توێژینەوەو بەڵگەنامەکان پەیوەندی روون و ریشەیی نێوان قادیانیەت و بەهائیەت نیشان دەدەن، قادیانیەت لە هیند و بەهائی لە فارس هەوڵیان لەپێخستنی جیهاد بوو بە تەواوەتی، لەکاتێکدا موسڵمانان زۆر پێویستیان بەوە بوو داگیرکەران دەربکەن، دامەزرێنەری بەهائی دەڵێت نزگێنی یەکەم بۆ هەموو خەڵکی دنیا سڕینەوەی حوکمی جیهادە لە قورئاندا.[٢]

---

١ - ص 10 من الطبعة السادسة من ملحق كتابه: شهادة القرآن.

٢ - نبذة من إشراقات بهاء الله، ص 109.

نووسەری کتێبی (حقیقة البهائیة و البابیة) دەڵێت بەهائی بزووتنەوەیەکی گومانانوی لارێیە کە میرزا غولام ئەحمەدی قادیانی لە لاهوور لە وڵاتی هیند دایمەزراند، ئەم کابرا خوێندکاری بوشتی بانگخوازی باتینی بوو دوای ئەوەی داگیرکاریی رووسیای قەیصەری ناوچەی قەوقازی داگیر کرد.

جوولەکەکانی ئێران بە کۆمەڵ چوونە ناو بزووتنەوەی بابیەوە، لە چوار شار و تەنها لە ماوەیەکی کەمدا 385 جوولەکە بوون بە بابی، لە ماسۆنیەکانیش جۆلد سیهەری رۆژهەڵاتناس بازارگەرمی بۆ ئەو بزووتنەوەیە دەکات، لە موژدەبەرەکانی رۆژئاواش لۆرد کرزۆن و ئستلین کابنتر و براون و قامبری و کۆنت جۆنبیۆ و پرۆفیسۆر جیمس وارمستەر و نیقۆلاس و شهل و دکتۆر جیل گرنگییان بەو بزووتنەوەیە داوە.

دواتر ئەو کۆمەڵە دابەش بوو بۆ دوو بەش، دەستەیەك بانگەشەی ئەوەیان دەکرد غولام پێغەمبەرەو دەستەکەی تریش باسی ویلایەتی غولامیان دەکرد، قادیانی و ئەحمەدی دوو تاقمەکە بوون، هەرکامیان ئامانجی مەترسیداری سیاسی خۆیان هەبوو هەرچەندەش زۆر مانەوە بەڵام هیچکامیان لە دەستەو تاقمی موسڵمانان نەبوون.

غوڵام ئەحمەدی قادیانی راشکاوانە دژایەتی خۆی بۆ قادیانیەت دەخاتەروو و (لە رۆژنامەی فەزل لە 30 یۆلیۆی 1931) دەڵێت: ئێمە لە هەموو شتێکدا لە موسڵمانان جیاوازین، لە خوا و پێغەمبەر و قورئان و نوێژ و رۆژوو و حەج و زەکاتدا، ناکۆکیەکی جەوهەری لە هەموو ئەمانەدا لەنێوان ئێمەو ئەواندا هەیە.

بەم چەشنە دەبینین لەمڕۆدا پیلانەکە نوێ دەکرێتەوە، ئەویش بە بووژاندنەوەی بیری بتپەرستی و هیلینی و باتین لە بواری فەرهەنگ و مێژوو و ئەدەبدا، بەلام لە شێوەی چەند بانگەواز و بزووتنەوەیەکی تردا خۆی دەنوێنێتەوە کە ئالاهەڵگری ئەو بیرەنو ئەو بیرە دادەڕێژنەوە تا ئەو بانگەوازە رووخێنەرانە لە سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچیدا چ بەزمێکیان نایەوە، ئەمڕۆش ئەوان لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆماندا هەمان بەزم بنێنەوە، بۆیە ئەزموونەکە دووبارەیە، بەلام لەمڕۆدا سەختتر و چڕتر، چونکە لەمڕۆدا موسڵمانان توانای ئەوەیان نیە بەربگرن بە گێژەڵووکەی رۆژئاواگەری و شالاوی رۆشنبیری و شعووبیەت کە هێزە داگیرکاریەکانی صەهیۆنیەت و شیوعیەت پاڵپشت و سەرخەریانو هەوڵ دەدەن لە بواری خوێندنو رۆشنبیریدا بیانسەپێنن.

رۆژهەلاتناسی هەولیداوە بەو بانگەوازانە موسڵمانان لە خشتە بەرێت و وەك بانگەوازی نوێگەری ناو ئیسلام وێنایان بکات، وەك لرانس براون لە کتێبەکەیدا (طوالع الإسلام) باسی دەکاتو عەبباس عەقاد ئەو کتێبەی پوخت کردووەتەوەو لە گۆڤاری ریسالە لە ساڵی 1945 دا بلاوی کردووەتەوە، تیایدا باسی بەهائی و قادیانی دەکات و بە بانگەوازی چاکسازی و نوێگەری وەسفیان دەکات، ئەگەر ورد بوایە دەیزانی قادیانیەت بەدیلی لادەری بانگەوازی جیهادی ئیسلامیە کە داگیرکار گیرۆدە بوو بە دەستیەوەو نەویە لەناوبردنی بانگخوازانی، ئەمەش پەرچەکرداری بوو بۆ هەلوێستی رێبەرانی موسڵمانان لە هیند بەرامبەر بە داگیرکاری ئینگلیز کاتێك لە جەنگی مەیسوور لە باشووری هیند لە ساڵی

1799 دا پاڵەوانی شەهید نیبۆ سوڵتان شکستی خواردو لەوە بەدوا ئینگلیز قەڵەمڕەوی خۆی سەپاندو موسڵمانان ئیمپراتۆریەتە شەش سەدەییەکەی خۆیان لەدەستدا، لە روانگەی ئابووریشەوە موسڵمانان زۆرینە بوون و خاوەن شارەزایی پیشەسازی و کشتوکاڵ بوون، ئینگلیز خوێندنگەکانی داخست و دەستی پیشەگەرانی بڕی و کارە رەسمیەکانی لەوان حەرام کرد و ئەو هیندۆکیانەی کە هەواداری ئینگلیز بوون بوونە کارمەندیان، بۆیە دەستەیەك لە زانایان بە رێبەری عەبدولعەزیز دەهلەوی ئیبن ساه وەلیوڵا کە نووسەری کتێبی (حجة الله البالغة) یە بیریان لەوە کردەوە هیند بووە بە دارولحەر، بۆیە لەسەر موسڵمانان واجبە جیهادی داگیرکار بکەن، یتر فیقهناس و زانا و فەرموودەناس و سۆفیگەراکان هەموو پێکەوە لەپێناو دوورخستنەوەی ئینگلیز نەوینە جیهاد و سوپایەکی گەورەیان بە شێبەر شەهید ئیسماعیل پێکهێنا و جەنگێکی سەخت بە بەردەوامی لەنێوان ئەوان و داگیرکاردا درێژەی کێشا کە توانییان چەندین شار ئازاد بکەنەوەو تیایدا ئاڵای ئیسلامیان شەکاندەوە، لە ساڵی 1831 دا لە هەرێمی باراکوب لە بنجاب موسڵمانان لەسەر دەستی بڕێ موسڵمانی ناپاك شکستیان خواردو داگیرکار ئەو زانایانەی گرت کە بەشدارییان کردبوو لە جیهاددا و ئەوانی خستە بەندیخانەوەو هەموو خوێندنگەو یانە رۆشنبیریەکان داخران تا نەزانی و هەژاری و بەدڕەوشتی لەنێویاندا بڵاوبێتەوە، خوێندکارەکانی شاە عەبدولعەزیز جارێکی تر نەوینە بەرگریکاری دژ بە داگیرکار و لە ساڵی 1857 دا راپەڕین روویدا و داگیرکەری تووشی شۆك کرد،

بەڵام سەرکەوتوو نەبوو و داگیرکەر کەوتە ئازاردانی زانایان و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت و زۆرێکیشی دوورخستەوە بۆ دوورگە ئەندومان لە دەریای رەش، لەنێوان 1858 تا 1887 داگیرکەر پێنج زانکۆی لە شارە گەورەکانی هیند (کالتما– بۆمبای – مدارس – لاهوور – ئیلاهئاباد) دامەزراند، تیایدا بە زمانیئەبجەدی وانەکان دەخوێنران، خوێندکارەکانی ئەو زانکۆیانە خودی هیندۆسەکان بوون، داگیرکەر ویستی بەو زانکۆیانە خوێندنگا ئایینیەکان و چالاکی ئایینی لە هیند لەناوبەرێت، موسڵمانان رێگرییان کرد لە چوونە نێو زانکۆکان، دواتر موسڵمانان کەوتنە دامەزراندن دارولعلوم لە دیۆبند تا فەرهەنگی موسڵمانان بپارێزن و بانگخوازی نوێ پێبگەیەنن تا دژ بە داگیرکەر رێبەری موسڵمانان بکەن، ئەوەبوو موحەممەد قاسم نانسوی و رەشید ئەحمەد کنولووهی و حاجی ئیمدادولاه دەرکەوتو لەسەر دەستی ئەمانە گوڵبژێری لە زانایان هەڵکەوتن.

کاتێك بێلایەن‌و ئاشتیخوازان بینییان موسڵمانان ناچنە ئەو زانکۆیانەو تەنها هیندۆسەکان دەچنە زانکۆ، بۆیە ئەحمەد خان لە ساڵی 1877 دا کۆلێژی موحەممەدی دامەزراند تا موسڵمانان وانەی تێدا بخوێنن، تیایدا موحەممەد ئیقباڵ و سەرکردە گەورە موسڵمانەکان کە لە نیوەی سەدەی بیستەمدا لە هیند پێشەنگی ئوممەتی ئیسلامییان دەکرد وانەیان خوێند.

هەندێ توێژەر ئەحمەدخان و بانگەوازەی غولام ئەحمەدی قادیانی لەیەك جیادەکەنەوەو هەندێکی تریش پێیان وایە بانگەوازەکەی ئەحمەدخان

پێشەکیەکی قادیانی بوو، ئەوانەی پێشو پێیان وایە ئەحمەد خان لە هیند وەك موحەممەد عەبدەی میصر وابووە، ویستوویەتی موسڵمانان دەرفەت لەدەست نەدەن و رێیەکی میانەڕەوی بگرنەبەر تا بێبەش نەبن لە زانستی سەردەم، ئەمەش بە ئاشتەوایی لەگەڵ داگیرکەردا.

هێندەی نەبرد ئینگلیزەکان کەوتنە زەقکردنەوەی قادیانیەت تا پەیامی رەسەنی ئیسلام بشێوێنن، حکوومەتی هیند ئەو تاقمەی نارد بۆ بەریتانیا و رۆژنامەیەك بە ناویانەوە دەرکەوت کە ناوی (ئیسلامیك ریفۆ) بوو و تیایدا بیروباوەڕ و بانگەشەی خۆیان بڵاودەکردەوە، دەستەیەك لە ئینگلیزەکان بانگەوازەکەیان گرتبووە ئەستۆ و لە لەندەن مزگەوتێکیان دروست کرد و ئەوانەی ئەوێ بە کۆمەڵەی ئەحمەدی ناسران، لەوێ قورئانیان وەرگێڕایە سەر هەردوو زمانی ئینگلیزی و ئوردی.

هەوڵی زۆر درا تا ئەحمەدی و قادیانیەکان لێك جیابکرێنەوە، عەبدولحەمید سەید دەڵێت غولام ئەحمەد بانگەشەی ئەوەی دەکرد هەم رزگارکەر و هەم نوێگەرە، دواتر گەیشتە ئەوەی بانگەشەی ئەوەی دەکرد مەسیحی لەدایکبوو و مەهدی بەڵێن پێدراو بۆ ئەم ئوممەتە ئەوە، دواتر لەوەش زیاتر چوو و وتی پێغەمبەری خوایە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، لە هەموو ماوەیەکی ژیانیدا نووسینی هەبوو کە لەگەڵ بانگەشەکەیدا دەگونجا، لە کۆتاییەکانی ژیانیدا حەوت ساڵ پێش مردنی کتێبێکی نووسی و تیایدا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و دابەزینی پەیامی خوایی دەکرد.

بەڵام ئەحمەدیەکانی لاهوور نکوولّییان دەکرد لە پێغەمبەرایەتی ئەو، تەنها دەیانوت ئەو مەسیحی بەڵێن پێدرا و و مەدی چاوەڕوان کراو و چاکسازی نوێگەرە، ئامانجیش لەوە ئەوەبوو سەرلە موسڵمانان بشێوێنن سەبارەت بەم کابرایەو گومانی چاکەی پێ ببرێت، دوای ئەوەی لە ساڵی 1908 دا غولام ئەحمەد مرد دۆست و حەواریەکانی کۆبوونەوە تا جێنشینێکی بۆ هەڵبژێرن، بۆیە حەکیم نوورەدینیان هەڵبژارد و ماوەی شەش ساڵ ئەو بوو، دواتر خواجە کەمالەدین و موحەممەد عەلی لاهووری هاتن، موحەممەدی عەلی لاهووری لە قادیان چوویە دەرەوەو رووەو لاهوور چوو، لەوێ هاودەم بە دەستەیەك تاقمێکی تری دامەزراند کە ناسرابوون بە ئەحمەدی لاهووری.

ئەمانە پێیان وابوو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و دابەزینی سروش دوای پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) لەگەڵ مەنتیقی موسڵماناندا ناگونجێتو هەرگیز موسڵمان بەوە ناخەڵەتێت، بۆیە دوای ماوەیەکی کەم لەسەر ئەوە رێککەوتن بڵێن ئەو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی نەکردووە، هەرچەندە ئەو کتێبانەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی تێدا کردبوو چاپ کرابوون و لەبەردەست بوونو پڕ بوو لە قسەوتن بە پێغەمبەران و هاوەڵانو ئالوبەیت و پێشینی ئوممەت، ئەو کتێبانەیان چاپ دەکردەوە کە لە ماوەی یەکەمی ژیانیدا نووسیبووی و تیایدا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی نەدەکرد، بەڵکو نکوولّی لەوە دەکرد، ئیتر وازیان هێنا لە کتێبەکانی تری کۆتایی ژیانی.

موسڵمانانی هیند بە سەختی بەرنگاری ئەو بانگەوازە قادیانی و ئەحمەدیە بوونەوەو گەمارۆی غولاموو شوێنکەوتەکانیان دا لە شارۆچکە بچووکەکەیان (قادیان)، دوای لەناوچوونی ئەو درۆزنە قادیانیەکان پەنایان بردە بە حکوومەتی بەریتانی و ئەوانیش بەڵێنیان دا بانگەشەی بۆ بکەنو بەرگری لێ بکەن، حکوومەت دەرفەتی قۆستەوە تا لەرێی هاندانی ئەمانەوە یەکرِیزی موسڵمانان بشێوێنێ و رێخۆشکەری کرد بۆ بانگەوازی قادیان لەسەر هەمان شێوەی موژدەبەرانی کڵێسا، هاوکاری دەکرد بۆ بانگەوازکردن بۆ لەپێخستنی جیهادی ئیسلامی و ئەو بانگەشەی کە دەیانوت ئیسلام ئیتر جیهادی تیدا نەماوەو ئێستا ئایینی ئاشتیە، واتە ئایینی خۆدانە دەست داگیرکەران.

موحەممەد عەلی لاهووری رێبەری تاقمی ئەحمەدیەکە لە گەورە هاوەڵانی غولام ئەحمەدی قادیانی بوو لە وتاربێژی و نووسیندا زۆر هەڵکەوتە بوو، قورئانی وەرگێرِایە سەر زمانی ئینگلیزی و بە تەفسیرێکی سەقەت تەفسیری کرد و بەپێی رێنماییەکانی قادیانیەت واتاکانی گۆرِی، لەوانەش بانگەشەی ئەوەی دەکرد سروش بۆ غەیری پێغەمبەرانیش دابەزیوە، ئەحمەدیە لاهووریەکان برِوایان وابوو مەسیحی بەڵێن پیدراو و مەهدی چاوەرِوان کراو میرزا غولام ئەحمەدی قادیانیە کە جیهان رزگار دەکات، ئەمانە دەیانوت لە یەك کاتدا برِوامان هەیە بە موحەممەد و غولام ئەحمەدیش.

توێژەران چەندین خاڵی هاوبەشی قادیانی و بەهائیيان خستووەتەرِوو، هەردوو بانگەوازەکە لە یەك سەدەدا دەرکەوتن، بەهائی دەیوت نوێنەری

راستەقینەی پێغەمبەرانی پێشووەو هەموو پەیامە خواییەکانی کۆکردوەتەوەو تیایدا هەموو ئایینەکان بەیەك دەگەن و پەیامی موحەممەدیش کۆتا پەیام نیە، بڕوای بە حلوول هەبوو، دەیوت ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ هێمان بۆ ژیانی ڕۆحی.

دەرکەوت بەهائی دەستپەروەردەی صەهیۆنیەتەو هەر ئەویش لە شاخی کرمل لە حەیفا لە فەلەستین بۆ دامەزراند، لە پێنجی ئۆگەستسی 1968 یشدا کۆنگەری جیهانی بەهائی دامەزراوەو تیایدا 225 کەس ئامادە بوون و لەنێو 81 کۆمەڵەی نیشتیمانی سەر بە بیروباوەڕی بەهائی لە پێنج کیشوەرەکەوە هەڵبژێردرابوون، ئامادەبوان ڕایانگەیاند بانگەواز دەکەن بۆ یەکبوونی ڕەگەزی مرۆیی و ئاشتی جیهانی.

خاڵی هاوبەشی بەهائی و ماسرنیەکان لەوەدا بوو کە هەموویان ئامانجیان بوو ئایین لە دەروونی خەڵکدا بەرتەسك بکەنەوەو شوێنەوارەکانی لە نێو هەموو کۆمەڵگەی مرۆییدا بسڕنەوە.

بەهائی هاوشێوەی ماسۆنیەت ئەو دروشمەی هەبوو (لەناوبردنی دوژمنە هەمیشەییە کە ئایینە) دوودڵ نەبوون لە بەرپاکردنی جەنگی دژ بە هەموو ئایینەکان، چونکە ئەوان بڕوایان وابوو ئایین دوژمنی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیەو هۆکاری تێکچوونی پەیوەندی نێوان تاك و گەلان بووەو دەبێت، بەهائیەکان زیاد لە ماسۆنیەکان هەنگاوێکیان نا کە ئەویش ئەوەیە ئایینێکی نوێیان دامەزراندو بانگەوازیان بۆ دەکرد کە تێکەڵەی بیروباوەڕی ئاسمانیەکان و بیری

مرۆیی بوو وەك چارەسەرێکی مامناوەند لەنێوان ئایینەکاندا، لە بەهائیەتدا بڕی ئایەتی قورئان و دەقی تەورات و دێڕی ئینجیل و هەڵبژاردەی نێو بووزیەت و کۆنفۆشیوسی هاتووە، دواجار دەرکەوت جوولەکە لە پشت ئەم بانگەوازەوەیە.

## ڕۆحیەتی نوێ

بانگەوازێکی تری نوێکرنەوەی بیری باتینی و بتپەرستی کۆن بریتیە لە بانگەوازی ڕۆحیەتی نوێ کە جیهانی ئیسلام لەنێو کۆمەڵە ڕۆحیەکاندا ون کردبوو.

توێژینەوە ڕۆحیەکان لە ڕۆژئاوادا لەسەر دەستی چەند کۆمەڵێك دەستیان پێکرد، ئەوانە وایاندەزانی دەتوانن بەرنگاری ڕێبازی ماددیگەری ببنەوەو خراپەکانی ماددیگەری بخەنەڕوو، بەڵام هێزی صەهیۆنیەتی جیهانی توانی زاڵ بێت بەسەر ئەو کۆمەڵانەدا و ئاراستەیەکی تریان پێ ببەخشێ، مەبەستی بوو بەوانە کۆمەڵگەکان بەرەو داڕووخان بەرێت و وەك ئایینێکی نوێ وێنای بکات تا پشێوی‌و گومانسازی لە هەموو بوارە ئایینی و ڕەوشتیەکاندا بنێتەوە، بەمەش دەبێتە لقێکی ئەو بانگەوازە مەترسیدارانەی کە بەرگی جیاوازی بەبەردا دەکێ و لەژێر ناوی جیاجیادا ڕاستیەکەی دەشارێتەوە، دیارترین دیمەنی ئاشکراکردنی ناراستی ڕۆحیەتی نوێ لەوەدایە کە ڕێنماییەکانی لەسەر چەمك‌و واتای وەحدەتولوجود و تەناسوخ و نەمری ژیان و هەمیشە مانەوەی دنیا داناوە، بڕوای بەوە نیە ڕۆژی زیندووبوونەوە و لێپێچینەوەی ڕۆژی دوایی هەبێت، ئەو پەرستشانەی بڕیاریان لەسەر دراوە لای ئەوان هیچ بەهایەکیان نیە، هەروەها نکوڵی دەکەن لەوەی خوا مافی هەبێت بەسەر بوونەوەو بەدیهێنابێت و هەوڵ دەدەن بڵێن جیهان دێرین بووەو هەر بووەو کۆتاییشی نایەت، بەمەش لە بەهائی نوێ و دەهریەی کۆن دەچن، دیارە بیرۆکەی

تەناسوخ و هەمیشەیی دنیاو نکوڵی کردن لە پاداشتی ڕۆژی دوایی هەمان بنەماکانی ماسۆنیەتن‌و بە شێوازێکی نوێ داڕێژراونەتەوە، ڕۆحیەتی نوێ دژایەتی ئایینەکانی گرتووەتەبەر بەتایبەتی دژایەتی ئیسلام، زۆر لایەنی ئەوە نیشان دەدەن کە پەیوەندی هەیە بە جوولەکەی تلموودیەوە، بۆیە بانگخوازانی ڕۆحیەت هێرش دەکەنە سەر پیاوانی ئایینی بەگشتی تا دەروازەیەك بێت بۆ هێرش کردنە سەر خودی ئاین، گاڵتە بە زانایان دەکەن و بە کەمتەرخەمی و چەقبەستوویی تۆمەتباریان دەکەن، هەموو ئەمانە تا لەوێوە تانەکە بدەن لە دین، وێڕای نکوڵی زانایان بۆ بانگەشەی پەیوەندی ڕۆحەکان یان ئەوەی ناونراوە چارەسەری ڕۆحی، لە هەمان کاتدا بتپەرستی و ڕێبازە کۆنەکان بەرزرادەگرن و فیرعەونیەت پیرۆز تەماشا دەکەن و ناوەکانیان دەکەنە هێمای خۆیان و ئاهەنگەکانیان، هەندێ ڕۆحی فیرعەونی بەرز رادەگرن وەك ڕۆحی رەع ئاموون رەع و هیمبوت، ناوی کۆمەڵەی ئەهرام دەنێن لە ئاهەنگەکانیان و جەخت دەکەنەوە لە شوێنەوارەکان و گرنگیەکی زۆر دەدەن بەو دۆزینەوانە.

هەروەها ڕۆحیەتی نوێ جەخت دەکاتەوە لە داڕماندنی رەوشت و نکوڵی دەکات لە بوونی بژاردەو بڕوای بە جەبریەت هەیە(مرۆڤ هیچی بە دەست خۆی نەبێت) لە توێژینەوە ڕۆحیەکانیاندا هەمان ڕێڕەوی توێژینەوە دەروونیەکان دەگرنەبەر بۆ بیانووهێنانەوە بۆ تاوان و پۆزش هێنانەوە بۆ تاوانبار و بە نەخۆش ناوی دەبەن و هەوڵ دەدەن پاڵنەرەکانی بگێڕنەوە بۆ گرێی دەروونی.

درۆیەکی شاخداری بانگەوازەکەیان ئەوەیە کە بڕوایانوایە بەهەشت و دۆزەخ بیرۆکەی عەقڵی یان باری دەروونین، خەڵکی بە جیاوازی ئایینیو مۆرك و رەوتیانەوە لەودیو مەرگەوە هەمان ژیانی سەر زەوییان بەسەر دەبەن، دەرفەتی سڕینەوەی تاوانەکات بە مەرگی مرۆڤەکان کۆتایی نایەت، بەوەش گەورەترین رێدەرە بە ستەمکاری، هەروەها بانگەشەی ئەوە دەکەن رۆژی دوایی واتە هاتنەوەیەکی نوێی ئادەم کە دێتەوە سەر زەوی، جیهانێ کە تەنها ئاشتی و رۆحیەت رێبەری دەکات و بەسەریدا زاڵە.

بەوجۆرە دەبینیت رۆحیەتی نوێ وێنەیەکی تری ماسۆنیەت و بەهائی و قادیانیەتە، بڕێ هێما و نهێنی و پلەی هەیە و بۆ ریزبەندی دانەنراوە بەڵکو بۆ ئامانجی تایبەت دانراوە، زانایانی رۆحیەت دەڵێن مرۆڤ لەسەر زەویدا نەمرەو سروش هیچکات کۆتایی نایەت و بە مەرگی موحەممەد کۆتایی نەهاتووە، پێغەمبەران نێوەندی نێوان مرۆڤ و خوا بون، ئێستا جیهان ئامادەیە بۆ وەرگرتنی قورئانێکی نوێ کە رۆحەکان ئەو قورئانە دێنن تا جیهان لە پارێزەرانی خراپە رزگار بکات.

رێخۆشکەری دەکەن بۆ پێغەمبەرێکی نوێ کە ناوی (سلفربرش) یان لێناوە، ئەم ناوەش جولەکەییە، بێگومان بانگەواز کردن بۆ ئەوەی تەنها رۆحیەت بنەمای بیرو ژیانە، بانگەوازێکی هاوچەشنی ماددیگەریەکە کە پێی وایە بنەرەتی بیر و ژیان تەنها ماددەیە، بەمە رەوتی رۆحیەت پێچەوانەی بیری ئیسلامی دەوەستێتەوە کە رۆح و ماددە پێکەوە کۆدەکاتەوە، بەوجۆرە

دەبینین جوولەکەی جیهانی لەمڕۆدا زاڵ بووە بەسەر هەردوو بانگەوازی ماددی و ڕۆحیدا، هەردوو بانگەوازەکەش پووچن و تەنها ئیسلامە سەربەخۆ ماوەتەوەو بانگەواز دەکات بۆ بڕوابوون بە خوا و بەرنگاربوونەوەی ملهوڕی و ماددیگەری.

بانگەشەیەکی مەترسیداری ڕۆحیەت لەوەدایە دەڵێن زانستی ڕۆحی بووەتە زانستێکی ئەزموونی ڕوونو پەیوەندی نێوان زیندوو و مردووەکان گومان هەڵناگرێو ڕۆح دوای مردنی کەسێ دەچێتە جیهانێکی ترەوە، شتێکی ناراستە بڵێیت پەیوەندی لەگەڵ ئەو ڕۆحەدا هەیە.

ڕۆحیەتی نوێ لەگەڵ بەهائیەتدا لەوەدا یەکدەگرنەوە کە بانگەواز بۆ پێغەمبەرایەتی نوێو ئاسۆی نوێ دەکەن، جوولەکەی جیهانی بەمە ڕێخۆشکەری کردووە بۆ ئەو پیلانەی کە لە پرۆتۆکۆلاتی صەهیۆندا هاتووە و ئەو بانگەوازانە دەکاتە دەروازەو هەنگاو و پێشبینی بۆ ئەو پیلانە.

مامۆستا عەبدە راجعی لە کتێبەکەیدا (کەسێتی ئیسرائیلی) ئاماژە بەوە دەدات و دەڵێت کۆمەڵە ڕۆحیەکان پەیوەندییان هەبوو بە پیلانی جوولەکەوەو پەیوەندیەکەیان زۆر زیاتر بوو لە پەیوەندییان بە ئامادەیی ڕۆحەکان، ئەو کۆمەڵانە کە لە میصر و ناوچەکانی تر بڵاو بوونەتەوە، لە پشتەوە بیری مەترسیداری تلموودییان پێیە، ئەو کۆمەڵانە بە ئامانجی تایبەت دامەزراون و بڵاوکراوەو کتێب و گۆڤاریان هەیە.

هەروەها دەڵێت ڕۆحیەتی نوێ پیلانێکی ئیسرائیلیەو ئامانجو ئسلووبی ڕوونەو ئامانجەکەی تەواو وەك ماسۆنیەت وایە، ئەویش داماڵینی تاکە لە ئاینو

نەتەوەی‌و دارشتنەوەی لە قالبێکی نوێی جیهانێتی یان کەونیدا، بۆ ئەمەش پێناوی جیاجیا بەکاردێت تا ئەوەی خودی دین بۆ لەناوبردنی دین بەکاردێت، زانایانی رۆحیەت دەڵێن مرۆڤ لەسەر زەویدا نەمرەو سروش هیچکات کۆتایی نایەت و بە مەرگی موحەممەد کۆتایی نەهاتووە، پێغەمبەران نێوەندی نێوان مرۆڤ و خوا بون، ئێستا جیهان ئامادەیە بۆ وەرگرتنی قورئانێکی نوێ کە رۆحەکان ئەو قورئانە دێنن تا جیهان لە پارێزەرانی خراپە رزگار بکات، رۆحیەکان لەمڕۆدا سەرکردەیەکیان هەیە کە کابرایەکی هیندیەو زوڵفی داناوە کە ناوی سلفربیرشەو لای ئەوان ئەوە ئادەمی نوێیە کە دەبێتە خەلیفەی خوا لەسەرزەویدا، ئەوان تەئویلێکی نامۆ بۆ ئایەتەکانی قورئان دەکەن کە هاوتای رێبازەکەیان بێت، نکوڵی دەکەن لە رۆژی دوایی بەو چەشنەی فیقهناسان باسی دەکەن، چونکە بڕوایان وایە زەوی هەمیشەییەو مرۆڤ تیایدا هەمیشەییە، ئەم پەیامانە لەگەڵ تلمودیەتی صەهیۆنیدا گونجاون، مەسەلە رۆحیەکان هەندێ نووسەری موسڵمانیان لەخشتە بردووەو وادەزانن ئەوانە هێزی نوێن لە بەرنگاربوونەوەی بیری ماددیدا، بەڵام دواتر دەرکەوت ئەوە پێناوی جوولەکەی جیهانیەو بە هەمان ئامانجیش ماسۆنیەت کاری بۆ دەکات تا ئایین داڕووخێنێت، ئەوان پێیان وایە هەر دەبێت ئایین بە دەستی شوێنکەوتەکانی لەناوببرێت، بۆیە ئەمە دەرفەتی بەردەستی صەهیۆنیەتە تا بتوانن ببنە خاوەنی جیهان، بەو جۆرە دەبینین پیلانی دژ بە ئیسلام لە هەردوو بواری بیر و جووڵەدا نوێ کراوەتەوە، دەبینین لەمڕۆدا هەموو بیری مرۆیی بووەتە پاشکۆی

خواستی صەهیۆنی و مارکسی و ئامانجیەتی بیری ئیسلامیش بتوێنێتەوە، هەوڵێکی نوێ هەیە دەیەوێت ئەو پیلانە کۆنانە نوێ بکاتەوە کە موسڵمانان لە سەدەکانی سەرەتای ئیسلامدا بەرنگاریان بوونەوەو بەهۆی پەیامی رەسەنی ئیسلامیەوە تێکیان شکاندن، لەمڕۆشدا بزووتنەوەی بێداریخوزای ئیسلامی بەرنگاری ئەم هەوڵەی ئەمڕۆ دەبێتەوەو ناراستی و هەڵەو کەموکورتیەکانی ئاشکرا دەکات تا بتوانێت ئەو پیلانە لەناوبەرێت.

## بەشی هەشتەم

## رەسەنایەتی ئیسلامی لە بەرنگاربوونەوەی پیلانی دژ بە ئیسلام

### یەکەم: لە تاقمەکانەوە بەرەو سوننەت

هەر لە رۆژی یەکەمی دەرکەوتنی بزاڤی پیلان دژی ئیسلام لە سەدەی دووەمی کۆچیەوە، خێرا بەرنگاربوونەوەی راست و بەرهەڵستکاری راشکاوانە لەسەر دەستی ئەهلی سوننەو جەماعە دامەزرا و خراپی ئەو رەوتانەی خستەروو و وەڵامی گومانەکانی دایەوەو بە بەڵگەوە سەلماندی کە ئەوانە بزووتنەوەی دژ بە ئیسلامن و زادەی ئایینێکی بیانین و لە دەرەوەی بازنەی ئیسلامن و لە دۆخی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بۆ دەزوویەك دەگەڕێن تا وەك پێشەکیەك بۆ لەناوبردنی سیستمی ئیسلامی بەها ئیسلامیەکان دارمێنن، دەرکەوت ئەوانە پەیوەندییان هەیە بە دوژمنانی ئیسلامەوەو برێ پەیوەندی و رێککەوتنو گرێبەست هەبووە لەنێوان دەوڵەتی رۆم و ئەو هێزانەدا، وێڕای پیلانی هێزە مەجووسیە فارسیە کۆنەکان، توێژەرانی موسڵمان ئەوەشیان خستووەتەروو کە ئەوانەی بنەڕەتی شعووبیەت و باتینیەتیان دانا نەوەکانی مەجووسیەکان بوونو هەواداری ئایینی باوباپیرانیان بوونو ئامانجیان بوو لە رێی ئەو بیرەوە ئیسلام دارمێنن دوای ئەوەی نەیانتوانی لەرێی هێزی دەوڵەتیەوە ئیسلام لەناوبەرن.

یەکەم: سوننە نکوولّی دەکات لە تەشبیە (بەخواچواندن) و تەعتیل (لەپێخستنی سیفەتەکانی خوا)، پێی وایە موشەببەهە بتپەرستن و موعەتەلەش ملهوڕن، لە هەمان کاتدا راستی هەردوو تاقمەکەی ئاشکرا کردووە.

دووەم: سوننە رازی نیە ئیسلام ملکەچی مشتومڕی عەقڵی بێت و بانگەواز دەکات بۆ گەڕانەوە بۆ پاڵپشتی یەکەم و سەرچاوەی رەسەن کە قورئان‌و سوننەتە.

سێیەم: سوننە نارەوایی ئیلاهیاتی ئەرستۆی خستووەتەڕوو، چونکە پێشەکی و ئەنجامەکانی تەواو پێچەوانەی پەیامی یەکخواپەرستی پوختن، بەڵکو پێی وایە سەرچاوەی بیروباوەڕی قورئان‌و سوننەتە.

چوارەم: سوننە هەموو نیاز و هیواکانی ئەو رەوتە جیاوازانەی لەبەرچاوە کە بانگەوازیان دەکردو هەنگاوی دروستی بەرامبەر گرتووەتەبەر، بۆیە خۆشەویستی ئەهلوبەیتی کردووە بە بەشێك لە بیروباوەڕی، عەقلانیەتێ کە موعتەزیلە ئاڵاهەڵگری بوون کردوویەتی بە بەشێکی مەعریفە، ویژدانیەت کە صۆفیگەرایی ئاڵاهەڵگری بوو بەشەکەی تری مەعریفەیە، دانانی فەرمانڕەوا لەسەر بنەمای شوورای کردووەتە بنەما نەك لەسەر بنەمای ڕەچەڵەك.

پێنجەم: سوننە بەرناگری ئەو ئاراستە ساختەکاریە بۆتەوە کە بانگەواز دەکات بۆ وەحدەتولوجود یان حلوول یان ئیتیحاد، هەروەك بەرنگاری لادانەکانی موعتەزیلەو فەیلەسووفان و صۆفیگەرایی بووەتەوەو هەموو ئەو یەکانە لە بنەڕەتێکی گشتگیردا پێککەیشتون.

شەشەم: سوننە پێی وایە روانینی فەلسەفی بنەڕەتێ نیە بۆ بیری ئیسلامی، چونکە برێ راستی سەرەتایی هەن تەنها لەرێی سروش و پێغەمبەرایەتیەوە دەتوانیت پێیان بگەیت، فەلسەفەش هاودەمی سروش نیەو تەنها بەکارهێنانی عەقڵو بیرکردنەوەیەکی رێکخراوە کە خەڵك لە ئایین یان هەر بابەتێکی تردا بەکاری دێنن، لە باشترین باریدا ئەوەیە هەوڵ دەدات رێ بگرێت لە هەڵەی ئەندێشە لە هەڵێنجان و بەڵگەخوازیدا.

حەوتەم: سوننە پێی وایە قورئان فەرمایشتی دێرینی خوایەو بە وشەو پیت دەربڕینی لە سنووری کاتدا بەدیهاتووە، ئەگەرنا لە خواوەیە، زمانی عەرەبیش کە زمانی قورئانە بەڵگەیەکە بۆ بنەڕەتی ئاسمانی بوونی قورئان.

هەشتەم: سوننە ئەو نێوەندە بوو کە هەموو رۆشنبیریەکان تیایدا کۆبوونەوە، یتر وەك رووبارێکی گەورە بوو و رەوت و رێچکەکانیش وەك لق وابوون، چی چاکەیەك لەو لقانەدا هەبوو لە بازنەی رەسەنایەتی ئیسلامیدا کۆبوویەوەو رژایەوە نێو رووبارە گەورەکە، وتەکەی پێشەوا غەزالی لەو بوارەدا نموونەی جوانە کە ئسلوبی قورئان لە بیروباوەڕدا باشترەو پابەندبوون بە پاکی فیترەتیش بەشێکە لە ئسلوبەکانی یۆنان و موتەکەلیمەکان، دواتر سوننە موعتەزیلەو فەیلەسووفان و موتەکەلیم و شیعە و صۆفیەکانی هێناو چاکەکانی کۆکردنەوە، عەقڵی خستە خزمەتی سروش تا لەبەر رووناکی سروشدا رێ بکات، فیقهناسان رێیان داوە بە بەشێکی زۆری تەئویل و جیاوازی لە وردەکاریەکان بێ ئەوەی بنەمای هەواداری بۆ سوننەو جەماعە ببەزێنن، بەرگرییان کردووە لە

یەکەی کۆکەرەوەو دیدی تەواوی بەرنگاربوونەوەی لادانە رووخێنەرەکانو پاڵپشتی ئەو بنەڕەتەیان کردووە بە بنەمایەك کە پێی وایە ئەگەر فیقهناسە موجتەهیدەکان لەسەر مەسەلەیەکی گەورەی بیروباوەڕی و فیقە کۆببوونەوە ئەوە کۆدەنگیەکەیان یەکلاکەرەوەیە، بەڵام مەسەلە وردەکان کێشە نیە راجیاییان لەسەر بێت، سوننە بەوە ناسراوە هەر لە سەرەتاوە رەگەزە کۆکەرەوەکانی زەق کردووەتەوە نەك رۆڵی تاك زەق بکاتەوە، تەنانەت ئەو کەسانەش رۆڵێکی دیاریان هەبووە وەك نوێنەری دیدە گشتیەکە وابون نەك بیریار و داهێنەر بن.

نۆیەم: سوننە توانی لە هەوڵی سێ گەورە پیاودا خۆی بنوێنێ: شافیعی و ئەشعەری و ئیبن حەنبەل، ئەوانە بەرنگاری مەترسی پیلانی دژی ئیسلام بوونەوە، ئەو پیلانەی لە بیری هیلینیدا خۆی دەنواند، چەندین زانای چاکەکار لەو بوارەدا هەوڵی خۆیان دا بۆ ریشەکێش کردنی باتینیەت صونکە هێزێکی مەعنەوی بوو، کاتێك پەیامی باتینی لەبەردەم زەبری سوننەدا تێکشکا ئیتر وەك هێزێکی سیاسیش دارِما.

دەیەم: زیندووکردنەوەی سوننەت و بنیادنانی پەیمانگەو خوێندنگەکانی و نوێکردنەوەی بیری سوننە لە بەرنگاربوونەوەی بیری شعووبی و باتینیو بەرپابوونی کۆمەڵی پرچەکی رەوشتی و بێداریخوازی رۆحی جیهادی هۆکاری گشتی بوون بۆ لەناوبردنی هێزە دەرەکیەکانی وەك شالاوە خاچپەرستیەکان و هێزە ناوخۆییەکانی وەك باتینی و حەشاشیەکن، پێشەوا غەزالی توانی

بەربەستەکانی نێوان فیقهو چەمکی پەروەردەی ئیسلامی و ئەخلاق (سۆفیگەرایی و زوهد) نەهێڵێ، بەوەی سەلماندی ئیسلام هەم بیروباوەڕ و هەم شەریعەت و هەم رەوشتیشە، بەوەش جیاوازی داهێنراوی نێوان فیقهناسان و سۆفیگەراکان نەما.

یانزەهەم: پەیامی سوننە کە پەیامی رەسەنایەتی ئیسلامی بوو توانی زێدەرۆیی نێو هەموو ئەو رەوتانە لەناوبەرێ، بەمەش دەرکەوت سوننە وەك ئەو رەوت و مەزهەبانە رەوتو مەزهەبێ نیە، ئیبنولقەییمی جەوزی دەڵێت ئەهلی سوننە نە لەگەڵ ئەوانەو نە لەگەڵ ئەمانەن، بەڵکو لەگەڵ ئەوانەدان لەو مەسەلانەدا کە پێکاویانەو لەگەڵ ئەمانەشدان لەو مەسەلانەدا کە پێکاویانە، بۆیە هەر راستیەکی هەر تاقمێ هەبێت ئەهلی سوننە هاوڕایانن، هەروەها دوورەپەرێزیشن لە هەر ناراستیەکیان، بۆیە مەزهەبەکەیان راستی هەموو تاقمەکانەو دەیلێت و هەواداری بێژەرانیەتی لەو رووەوە و بەرپەرچی هەموو نارەواییەکی هەموو تاقمەکانیش دەداتەوەو تێکی دەشکێنێ و لەو رووەوە دژایەتی بێژەرانی دەکات، بۆیە ئەهلی سوننە دادوەری نێوان تاقمەکانن و بە بیدعە وەڵامی بیدعە نادەنەوەو وەڵامی خراپە بە خراپە نادەنەوەو جیاوازی لە دەستەیەك وایان لێ ناکات بەرامبەریان دادپەروەر نەبن، بەڵکو بڕیاری حەقیان لەسەر دەدەن و لەسەر زۆر رۆییشیان بە دادپەروەری بڕیار دەدەن.

لێرەوە ئەو بانگەشە نارەوایە دادەڕمێت کە کەسانی وەك زەکی نەجیب مەحموود و کەسانی تر دەیلێن گوایە ئەهلی سوننەش تاقمێ یان رەوتێ بن،

بەڵکو سوننە خوێندنگەی رەسەنایەتی ئیسلامین کە جوانیەکانی هەموو رەوتەکانی تر کۆدەکەنەوەو دادوەری نێوانیان دەبنو واز دێنن لە ناکۆکی نێوان تاکو کەسەکانو پێیان وایە ئەو ناکۆکیە هۆکاری شێواندنی چەمکو واتای ئیسلامیە.

دوانزەهەم: ئەوە یەکلابووەتەوە کە ئیجتیهاد سەرەتای روانینی عەقڵی ناو بیری ئیسلامی بووەو لەژێر چاودێری قورئاندا گەشەی کردووەو پێگەیشتووەو لەوێوە مەزهەبە فیقهیەکان دەرکەوتنو لەوێشەوە زانستی ئوصولی فیقه سەری هەڵداو لەو پەروەردەوە تەصەوف پەیدا بوو، ئەمە پێش ئەوەی فەلسەفەی یۆنانی دەستی خۆی بگەیەنێتە لای موسڵمانان سەبارەت بە مەسەلەکانی ئەودیو سروشت و مەسەلە ئیلاهیەکان، بەمەش هیچ کاریگەریەکی بیانی لە پێکهێنانی فیقهدا بوونی نەبوو، بەڵکو زادەی قورئانو جێماوی هاوەڵان و دوو نەوەی یەکەمی تابعیەکان بوو، سەرچاوەی هەموو ئەوەش ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا بە والیەکانی ناوچەکان تا لە مەسەلەیەکدا دەقیان بەردەست نەکەوت رای خۆیان بەکاربهێنن، بۆیە ئاسایی بوو ئەهلی سوننە بەرنگاری ئیلاهیاتی ئەرستۆ ببنەوە، چونکە پێشەکیو ئەنجامەکانی نەگونجانێکی تەواوەتی لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا لەخۆدەگرت.

قورئان هەوڵ دەدات بە چەندین شێوە قەناعەت بە بەرامبەر بکات، لەوانە شێوازی عەقڵی و شێوازی ویژدانی و شێوازی پەندی مێژوویی، بۆیە وەك فەلسەفەی نەکردووە بەڵگەکانی بخاتە چەند پێشەکی و پرسو ئەنجامێکەوە،

لێرەوە را و پێوەر چەند بواریٚ بوون کە موسڵمانان هەر لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و پێش پەیوەندییان بە فەلسەفەی یۆنانیەوە دەیانزانی و هەیانبوو.

سیانزەهەم: سەلەف دەستەی یەکەم بوون کە وەڵامی جوهەمیەکانیان دایەوەو رەخنەیان گرت لە دیدیان بۆ تەعتیل و نکوڵی لە سیفەتەکانی خوا و مەسەلەی خەلقی قورئان، مالیك و سوفیانی کوڕی عویەینەو عەبدوڵای کوڕی موبارەك و چەندینی تر بەریان پێگرتنو چی نارەوایی هەبوو ئاشکرایان کرد، لادانی ئەو رەوتەیان لە قوئانو سوننەت خستەڕوو، جوهەمیەکان بە لەکارخستنی دەقەکانو لادان لە واتاکانی خۆی دەستیان پێکرد، لەبری ئەوە پەیامی باتینی و غەنووصیو هی تریان خستە نێو تەفسیرەوە کە ئامانج لێی دارماندنی شەریعەت و گومڕاکردنی باوەڕدارانی بوو تا ئەو بیروباوەڕە روونەی لە دەروونیاندا هەبوو و هیچ لێڵی و ناروونیەکی تێدا نەبوو، بەر رارایی بکەوێت.

بەهێزترین وەڵام بەرامبەر بەو تاقمە لەلایەن پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی پێشەوای ئەهلی سوننەو سەرخەر میللەتی ئیسلامیەوە بوو، وەڵامێکی پڕاوپڕی جوهەمیەو ئەو زندیقانەی دایەوە کە خەڵکیان بەرامبەر بە قورئان دوودڵ دەکرد و بریٚ ئایەتی دیاریکراویان لە ڕێڕەوی خۆی دەبڕی و دەیانوت ئەمانە لەگەڵ ئایەتی تردا تەبا نین، ئەوانە موتەشابیهی ناو قورئانیان دەهێناو هەم خۆیان گومڕا دەکرد و هەم خەڵکیشیان گومڕا دەکرد.

پێشەوا ئەحمەد لە تەفسیری قورئانی پیرۆزدا پشتی دەبەست بە بنەڕەتی زمانی عەرەبیو یاساکانی ئەو زمانە، زمانیٚ کە ئەو زندیقانە زۆر شارەزای

نەبوون و وەك ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نهێنیەکانی ئەو زمانەیان نەدەزانی، تایبەتمەندیەکانی شەرع و دەقەکانی شارەزا نەبوون، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتی قورئان نە دێرین و نە داهێنراوە، بەڵکو فەرمایشتی خوایەو نە دەڵێم مەخلوقەو نە دەڵێم مەخلووق نیە.

چواردەهەم: پێشەوا ئەحمەد هێرشی کردە سەر فیتنەی لەکارخستنی سیفەتەکان و نەهێشتنی ئەرکو بەرپرسیارێتی، ئەمەش پیلانێکی جوهەمیەکان بوو کە دەیانوت مرۆڤ هیچ ویست و بژاردەیەکی لەدەست خۆی نیە، بۆیە مرۆڤ وەك داریَ وایەو هیچی تر.

پانزەهەم: ئیبن تەیمیە پێی وایە تاکەڕێی شارەزایی لە عەقیدەو حوکمەکان و هەرچیەکی تری پەیوەست بەو بوارە بە وردەکاری و بڕوابوونو بەڵگەخوازیەوە هەر دەبێت لە قورئانو سوننەتەوە بێت کە ئەوانەی روون کردووەتەوە، ئەوەی قورئان بڕیاری لەسەر داوەو سوننەت شرۆڤەی کردوە وەرگیراو و دروستەو رەوا نیە بەرپەرچ بدرێتەوە، بەرپەرچدانەوە داماڵینی شەریعەتە، عەقڵ لە تەئویل و تەفسیری قورئاندا هێندە رۆڵی هەیە کە دەستەواژەکان رێی دەدەن، دوای ئەوە هەر دەسەلاتێکی تری عەقڵ تەنها بریتیە لە بڕوا پێهێنان و دانپێدانان، عەقڵ شایەت ئەبێت نەك بڕیاردەر، پاڵپشت دەبێت نەك رەخنەگر و بەرپەرچدەر، روونکەرەوە دەبێت بۆ بەڵگەکانی ناو قورئان، عەقڵ پاش نەقڵ (سروش) دێت و پاڵپشت و بەهێزکەری

دەبێت و بە تەنها ناتوانێت بێتە بەڵگەخواز و بڕیاردەر، بەڵکو کاری عەقڵ لێك نزیککردنەوەی واتای دەقەکانە.

شانزەهەم: ئیبن تەیمیە پێی وایە خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو شتێکەو هیچ شتێ لەم بوونەدا بێ ویستی خوا نیەو هیچ کەس لە بەدیهێناندا بەرامبەر خوا نەوەستاوەو خوای گەورە ئەم حەقیقەتەی بەدیهێناوەو ویستو خواستی تەواوەتی هی خوایەو چی بوێت توانای هەیە بیکات، خوای گەورە کاری خێر و چاکە ئاسان دەکات و لای خۆشەویستەو پێی رازیەو کارئاسانی ناکات بۆ کاری خراپەو پێی خۆش نیە، بەندە بە تواناو ویستی خوا چی دەوێت دەیکات (لمن شاء منكم أن يستقيم وما تشاءون إلا أن يشاء الله).

حەڤدەهەم: شافیعی پێی وایە قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیوەو خوای گەورە بەو قورئانە عەرەبی بە زمانی خۆیان دواندووە تا جوان لە واتاکانی تێبگەن.

بەڵگەکان ناراستی ئەو بانگەشەیە دەخەنەڕوو کە دەڵێت رەوانبێژی عەرەبی لە پێگەیشتنو پەرەسەندنیدا کاریگەر بوو بە گوتارو شیعری ئەرستۆیی، بەڵکو عەرەب پێش وەرگێڕانی کتێبەکەی ئەرستۆتالیس شارەزای رەوانبێژی بوون، لە کتێبەکانی رەوانبێژی عەرەبیدا بەڵگەیەکی روون نیە باس لەو کاریگەریە بکات، بەڵگەش بۆ ئەوە شکستی رێبازی پێشکەشکارانیەتی لە رەخنەی شیعریدا کە تیایدا پشتیان بەستووە بە رێبازی ئەرستۆ، وشکیەکی

وای تێدایە کە سەلیفەی ساغی عەرەبی ئەو وشکیە قبووڵ ناکات، سنوورو وێنەیەکی داناوە کە لەگەڵ شیعری عەرەبیدا ناگونجێت.

هەژدەهەم: پیاوانی رەسەنایەتی ئیسلامی ئەوەیان خستووەتەڕوو کە ئیدی عەقڵی کە پاڵنەری موعتەزیلەیە خەریك بوو بیروباوەڕ بخاتەژێر و ئاسانی و سادەییەکەی بگۆڕێت بۆ رێبازێکی ئاڵۆزی فەلسەفی دوور لە رۆحی ئیسلام، هەڵەی موعتەزیلە لەوەدا بوو عەقڵیان لە سەروو سروشەوە دادەنا.

ئیبن تەیمیە دەڵێت ئەگەر عەقڵ دەسەڵاتی دانپێدانان و بەراستدانانی هەبێتو بتوانێت نەقڵ لە عەقڵ نزیك بکاتەوەو نەگونجانەکانی نێوانیان روون بکاتەوە، ئەوە عەقڵ دەبێتە شایەت نەك بڕیاردەر، دەبێتە پاڵپشت نەك بەرپەرچدەرەوەو رەخنەگر.

نۆزدەهەم: زۆرێ لە بیریارانی ئیسلام گەیشتوونەتە هەمان ئەنجامێ کە غەزالی پێی گەیشت، تەنانەت رازی لە کۆتا رۆژانی ژیانیدا دەیوت من رێرەوی کەلامی و رێبازی فەلسەفەیم هەڵبژارد، کەچی نەمدی سوودێکی هەبێت لە ئاست ئەو سوودە بێت کە لە قورئاندا بەدیمکرد، چونکە قورئان هەوڵ دەدات گەورەیی بداتە دەست خوا و رێگری دەکات لە رۆچوونو وردبوونەوە لە نیشاندانی نەگونجانەکان، ئەمەش لەبەرئەوەی دەزانێت عەقڵی مرۆیی لەو تەنگاوە قووڵو رێبازە شاراوانەدا لێکهەڵدەوەشێ.

بیستەم: ئیبن تەیمیە پێی وایە بیروباوەڕ تەنها لە دەقەکانەوە وەردەگیرێت، سەلەفیەکان بڕوایان بە دەق هەیە، چونکە لای خواوە دابەزیوە

بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ)، شێوازە عەقڵیە مەنتیقیەکانیش داهێنراو و نوێن لە ئیسلامداو بە هیچ چەشنێ لای هاوەڵان و تابعیەکان بوونی نەبووە، جا ئەگەر بڵێین بۆ تێگەیشتن لە بیروباوەڕ پێویستە ئەمە واتە ئەو پێشینانە بە دروستی لە بیروباوەڕ تێنەگەیشتون، بەڵکو ڕێی دروست لەوەدایە بیروباوەڕ لە قورئانەوە وەربگیرێت، ئەویش بە تێگەیشتنی سەردەمی هاوەڵان و تابعیەکان، دەبێت خەڵکی پابەندی بەڵگەی قورئان بن.

ئەم تێگەیشتنە کاریگەری روونی هەبوو لە ریشەکێش کردنی باتینیەت و شعووبیەتو لەناوبردنی پیلانە مەترسیدارەکەیان، ئەمەش دەروازەیەك بوو بۆ دەرکەوتنی بزووتنەوەی گەورەو بەرفراوانی جیهادی کە جیهانی ئیسلام لەدەست تەتار و خاچپەرستان رزگار کرد و پاشماوەی قەڵا باتینیو حەشاشیەکانی لەناوبرد.

لەمڕۆشدا هەرگیز ناتوانین بەرنگاری ئەم پیلانەی ئەمڕۆ بینەوە (صەهیۆنیەتو شیوعیەتو داگیرکاری) مەگەر بە هەمان هەنگاوی پێشووی موسڵمانان کە ئیبن تەیمیەو شافیعی و ئەشعەری و غەزالی لە رووخاندنی هیلینی و باتینی و شعووبیەتدا بڕیاریان لەسەردا.

## دووەم: لە پاشکۆبوونەوە رووەو رەسەنایەتی

یاسا و سوننەتی نەگۆڕاوی بیری ئیسلامی ئەوەیە کە بەردەوام توانای هەیە ڕێرەوەکە ڕاست بکاتەوەو هەر لادانێ هەبێت نەیهێڵێتو بزاڤی بێداریخوازی لەناوخۆوە ببووژێنێتەوە بێ ئەوەی ڕێ بە هۆکاری دەرەکی بدات، ئیدی پرشنگی رەسەنایەتی تێایدا پەیدا دەبێتو هەموو هەوڵێکی ساختەو لادان لەناودەبات، لەم تەنگژەی ئەمڕۆدا کە هێزە شالاوهێنە پاشکۆییەکان هێرشیان هێناوە، بیری ئیسلامی دەتوانێت ئەو کۆتو بەندانە تێکبشکێنێتو بە هێزی زاتی خۆیەوە رووەو سەرچاوەکان هەنگاو بنێ و دوور بێت لەو بازنە ئومەمیەی کە ئەمڕۆ سەپێنراوە، لە تەنگژەکانی موعتەزیلەو فەلسەفە و سۆفیگەری فەلسەفیدا بە روونی ئەوە دەرکەوتووە، لە سەردەمی نوێشدا بە روونی ئەم وێنەیە بەرچاوە.

ئەو خوێندنگە نوێیەی لەمڕۆدا ئاڵاهەڵگری بانگەوازە بۆ بیری مرۆیی کە خۆی لە بیری رۆژئاواییدا دەبینێتەوە، بەرەبەرە شکست دەخواتو لە ناوچەکانی سەپاندنی پاشکۆیەتیدا پاشەکشە دەکات، چونکە دەرکەوت ناتوانێت بیری ئیسلام ملکەچی پیلانی رۆژئاواگەری و شاڵاوی رۆشنبیری بکاتو وردەکاری هەموو بوارەکانی لەبەرچاو نەبووە، یان بە چەند وشەیەکی نامۆی بریقەداری وەك ئازادی و برایەتی و یەکسانی خەڵکی لەشختەبردووە، زۆری نەخایاند تا ناڕاستی ئەو بانگەوازە ئاشکرا بووو ئەوانەی بووبوونە ئاڵاهەڵگری بانگەوازی بیری رۆژئاوایی و فیرعەونی و باتینی و شعووبیەت و هەرێمچێتی

(هەیکەل و مەنصوور و فەهمی عەقاد و تۆفیف حەکیم و زەکی موبارەك و ئیسماعیل مەزهەر) جارێکی دی ڕووەو فەرهەنگی ئیسلامی گەڕانەوەو بۆیان دەرکەوت کە تەنها ئەو فەرهەنگەیە توانای بەخششی هەیەو سەرچاوەی ڕەسەنی دانانی پردی نێوان دوێنێو ئەمڕۆیە.

هەرچەندە ئەو نووسەرانە ملکەچی ڕێبازی شیکاری ڕۆژئاوایی بوونو ئەو ڕێبازانەش بۆ ئەوە گونجاو نین پەیڕەو بکرێن بەسەر بیر و فەرهەنگی ئیسلامیدا، دروستترینیان ئەو ڕێبازە بوو کە موستەفا صادق رافعی و جادولمەولا و حەسەن بەننا و مەودوودی ئەبولحەسەنی نەدەوی پەیڕەویان کرد، ئەمە ئەو یاسایە پشتڕاست دەکاتەوە کە بیری ئیسلامی لە هەر زێدەکاریەك دەرباز دەکات با ئاستی هەڕەشەکە لە هەر ئاستێکدا بێتو چەندەش داگیرکەر و ڕۆژئاواگەری هەوڵی دابێت بیری ئیسلامی لەنێو گێژاوی ئەو ڕەوت و مەزهەب و بانگەوازو بیردۆزانەدا نغرۆ بکات، بەلام بیری ئیسلامی بەردەوام ئەرکی خۆی بەجێدەگەیەنێت و پی بە باش بزانێت بۆ ڕاستکردنەوەی ڕێرەوەکە دەیگرێتەبەرو ئەوی تری بەرپەرچ دەداتەوە.

ئەزموونی بیری ڕۆژئاوایی لیبرالی و بیری مارکسی شکستیان هێنا، دوای بیست ساڵ لە ئەزموونی مارکسی و کشانی بەردەوامی تا ئاستێ وا گومان برا بیری ئیسلامی داپۆشیوە، کەچی دەبینین ئەوانەی هاوردەکاری ئەو بانگەوازە بوونو بانگەوازیان دەکرد بۆ لێکدانەوەی ماددی بۆ مێژوو و بیردۆزەکانی مارکسیەت، جارێکی دی گەڕانەوەو ڕوویان کردەوە پەیامی ئیسلام.

له هەردوو قۆناغەکەدا ئیسلام زاڵ و بڕیاردەر و سەرەچاوەی رەسەنی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان بوو و تاکە سەرچاوەیان هەر ئیسلامە، چونکە ئەزموونی دیموکراتی رۆژئاواو مارکسیەتی رۆژهەڵاتیان تاقی کردەوەو دەرکەوت هەردوو ئەزموونەکە شکستیان هێناو تەنها یەك رێبازە لەبەردەم موسڵمانانىدا ماوەتەوە کە ئەویش رێبازە رەسەنەکەی خۆیانە.

هەروەها ئەو هەوڵانەی تەها حوسەین و ئەحمەد ئەمین و عەبدوڕەحمان بەدەوی و زەکی نەجیب مەحموود و چەندێکی تر لە بازنەی پیلانی د1 بە ئیسلامدا پێی هەستان‌و بریتی بوو لە زیندووکردنەوەی بیری بتپەرستی‌و فەلسەفی و موعتەزیلی ناو داروپەردووی بیری کۆنی مرۆیی، هەموو ئەمانە هەوڵی شکستخواردوو بوون‌و هیچیان بەدینەهێنا، پەیامی رەسەنایەتی ئیسلامی توانی لەناویان بەرێت‌و ناراستیەکانیان بخاتەڕوو، ئاڵاهەڵگری ئەم هەنگاوەش موستەفا عەبدوڕەزاق بوو و بەدوایدا سامی نەشار و زەبیان و موحەممەدی بەهی و چەندینی تر هاتن‌و پیلانەکەیان تیکشکاند، ئەوەش دەرکەوت بیری یۆنانی سەرچاوەی دروستی نیەو یۆنانیەکان گاڵتەیان دەکرد بە رێبازی ئەزموونی و موسڵمانان بوون رێبازی ئەزموونییان داهێنا و پێشکەشیان کرد تا ژیاری نوێی لەسەر دامەزرا، هەروەها موسڵمانان هەر لە یەکەم رۆژەوە مەنتیقی ئەرستۆیان بەرپەرچ دایەوە، ئەو پەیامی عەقڵگەراییەشیان بەرپەرچ دایەوە کە موعتەزیلە پێشکەشی کرد، چونکە بیرێکی دروست نەبووو لەگەڵ پەیامی

ئیسلامیدا نەدەگونجا، ئەو پەیامە ئیسلامیەی کە قورئان پێشکە کردبوو و دڵو عەقلی پێکەوە کۆدەکردەوە.

هەروەها ئەوە دەرکەوت ئیسلام جیاوازی تەواو دەکات لەنێوان پەیامی رەسەنی یەکخواپەرستی و پاشماوەی بیری کۆنی مرۆییدا کە لەسەر بنەمای بتپەرستی و فرەخودایی و ماددیگەری و ئیباحیەت دامەزراوە.

ئیتر دەرفەتێ نەماوە بۆ گونجاندنەوەی نێوان ئەو پاشماوە کۆنەو پەیامی رەسەنی ئیسلامیدا، بەڵکو بزافی بێداریخوازی ئیسلامی هەڕەشەی ئیسرائیلیاتی کۆنو نوێی ئاشکرا کردووە کە لە رێی هەندێ ئەفسانەوە دزەیان کردووەتە نێو تەفسیر و مێژووەوە، موسڵمانان کە خاوەنی دەق جێمتمانەو دورستن سەرچاوەو دەروازەی دروستیان هەیە بۆ بیرو هزریان، بۆیە سەرلەنوێ لەوێوە رێی راست دەدۆزنەوە، هەرکات تووشی تەنگژەیەك بن یان پیلانیان بەڕوودا پەیڕەو بکرێت خێرا دەگەڕێنەوە سەر ئەو رێگە راستە.

هەروەها بزافی بێداریخوازی ئیسلامی نارەوای بیری غەنووصی و هیلینیشی خستووەتەڕوو، دەستی بزافی رۆژئاواگەری لەنێو مێژووی ئیسلامیدا ئاشکرا کردووە کە چ ژەهرێکی رشتووەو مەبەست پێی نانەوەی ناکۆکیە کۆنە کۆتایی هاتووەکانەو لەمرۆدا سەنگو پێگەیەکیان نەماوە.

هەروەها دەرکەوت هەوڵی نوێی موعتەزیلەو بیری عەقڵگەرایی یان فەیلەسووفانو بانگەشەکەیان یان تەسەوفی فەلسەفی و پرسەکانی ئەو بوارە، جیاوازن لە رێرەوە مێژووییەکەی خۆی کە پیلانێ بوو بۆ نیشاندانی وێنەیەکی

ناراستی بیری ئیسلامی، چونکە ئەو رەوتو تاقمانە لە گەرمەی هەوڵەکەی بزووتنەوەی وەرگێڕاندا دەرکەوتنو هەموویان لە بازنەی ئیسلامدا توانەوە، بیری ئیسلامی ئەوانەی هێناو هەرچیەکی رەوا و زیندوو بوو و لەگەڵ پەیامی یەکخواپەرستیدا دەگونجا وەریگرت و چی تری مایەوە فڕێی دا.

هەروەها بزاڤی بێداریخوازی ئیسلامی ئەوەشی روون کردووەتەوە کە لەمڕۆدا چەند هەوڵ هەن تا ئەفسانەکانی پەیوەست بە بورجەکان بسەپێنن، لەکاتێکدا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ یۆنانیو بابلیەکان، بەڵکو بزاڤەکە ناراستی و ناردوستی ئەو بوارەشی خستووەتەڕوو.

بیریارانی موسڵمان بانگەوازی زیندووکردنەوەی بیری وەحدەتولوجود و حلوول و ئیتیحادو بانگەوازە بتپەرستیە کۆنەکانی تریشیان ئاشکرا کردووە، ئەو هەوڵانەی هەوڵیان داوە بیری ئیبن عەرەبی و ئیبنولفارز و حەلاج زیندوو بکنەوە، بەڵکو رووی راستی ئەو کەسایەتیانەیان خستووەتەڕوو کە چۆن هەریەك لەوانە لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام هاوپەیمانییان بەستووە بۆ لەناوبردنی بانگەواز و رەسەنایەتی ئیسلامی.

ئەوەش دەرکەوت هەوڵی پیلانی دژ بە ئیسلام خۆی دەبینێتەوە لە زیندووکردنەوەی بیری باتینی و صەهیۆنی فەلسەفی و موعتەزیلەدا بەو هیوایەی ئیسلام لەنێو ئایینەکاندا بتوێننەوەو خودێتیو قەڵەمڕەو و مۆرکی تایبەتی ئیسلام لەناوبەرن، ئەو تایبەتمەندیەی کە ئیسلام کۆتا ئایینی ئاسمانیەو دەقەکانی بە دروستی تۆمار کراون و پارێزراون.

هەروەها بەرگریکردن لە بیری باتینی هەوڵێکە بۆ نەهێشتنی سنوورە ئیسلامیەکان و پابەندی ئەخلاقیو بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پاداشتی رۆژی دوایی تا نەوەی نوێ رووەو ئارەزووبازی بەرن.

هێشتا جەنگی نێوان هەڵگرانی پیلانی دژ بە ئیسلامو بزاڤی بێداریخوازی ئیسلامیدا بەردەوامەو درێژەی هەیە، چونکە دوژمنانی ئیسلام بەم زوانە خۆیان نادەن بە دەستەوە، بۆیە پێویستە لەسەر رۆشنبیرانی ئیسلامی هەمیشە بەرامبەر بەو پیلانە بەردەوامە بێدار و بەئاگا بن، تاکە رێی بەرنگاربوونەوەش بە گەڕانەوەیە بۆ قورئان و دەستپێوەرگرتنی و روونکردنەوەی رێنماییە سادەو ساکارە ئیسلامیەکان رەسەنەکان دوور لە وردکردنەوەو هێنانی ناکۆکیە مەزهەبیەکان، پێویستە کۆمەڵی ئیسلامی بگەڕێنەوە سەر ئەو یەکبوونە هزریەی کە قورئانی پیرۆز بەدیهێناوە، بێگومان بیرۆکەی گەڕانەوە بۆ سەرچاوە رەسەنەکان داخی دڵی بزاڤی رۆژئاواگەری و شاڵاوی رۆشنبیریە کە دەیانەوێت موسڵمانانی لێ دوربخەنەوەو بیانبەن رووەو ناکۆکیو موتەشابهەکان، لەکاتێکدا قورئان بانگهێشتمان دەکات بۆ پابەندبون بە ئایەتە موحکەمەکان.